بسم الله الرحمن الرحيم


**ناسنامەی کتێب**

**نوی کتێب : خەونامەی ابن سیرین**

**بابەت لێکدانەوەی خەون**

**نوسینی : ابن سیرین**

**وەرگێرانی : گیوی موکریانی**

**نۆبەتی چاپ: چاپی سێیەم**

**تیراژ : ۱۰۰۰ دانە**

**ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی ( ۳۷۰ ) ی ساڵی ۱۹۷۱ای ز پێدراوە**

# پێشەکی

ئەم پەرتووکەم بۆچی وەرگێڕاوەتە سەرزمانی کوردیو چاپیشم کردووە؟

لەسەرەتای دامەزراندنی ئەم چاپخانەیەوە تائەمڕۆ چەندین پەرتووکی وێژەییو مێژوویی و زمانەوانی و فەرهەنگ و چیرۆکمان بەچەندین دیوا نانەوە چاپو بڵاو کردۆتەوە زۆرموخابین وجێگای پەرۆشە کەبەشێوەیەکی وا نافرۆشرێن کەچاو پیان بینی و یا کەلێنێکی بڕ کەنەوە سەرڕای ئەوەش سوپاس بۆ خوا پەلامارداني بێ شێوازانەو دلشکێن لەژمار نایەن بەڵام سەرچاوەی باریکاری و بەزەیی و دلسۆزێتی لەڕاست بنەماڵەی ڕەنج کێشو ماندووی ئێمەو چاپخانە پیرۆزە کەماندا لەبنچینەدا ووشك بووەو خۆشم کەپیرو بێ هێزو کەم بینا بووم لەووزەم دانیە کەوەکوو جاران کاروباری چاپخانە هەر بۆخۆم هەڵسووڕێنم ناچار چەند کوڕە کوردێکی هەژار و هەتیو کاری تیدا دەکەن و هەموو ڕۆژێکیش داین کردنی ڕۆژانەی وان کارێکی ئاسان نیە خۆ پڕ کردنەوەی کەمو کووڕیو ئەرکی چاپخانەش لەبابەت ڕۆن ، گریس ، مەرەکەب ، قاقەز ، بەرگی پەرتووکان وجارجارەش تازە کردنەوەی پیتەکانی چاپخانەو کرێی دوکان نەك هەر ئاسان نیە و بەس بەڵکوو بۆ یەکێکی دەستکورتو بێ یاری کارو پیرو نەخۆش و پشت تێ کراوی وەکوو من پشت شکێن و جەرگ بڕە .

ئیترناچاری ئەوپەرتووکەشی بێ خستمەسەر ڕشتەی (لەیلەومجنون)ەوە سەرڕای ئەوەش لەو بڕوایەی دام لەپەیدا بوونی ئەو پەرتووکە لەچەند لایەنێکەوە هەنگامەیێکی گەورە دەخاتە ناو پەرتووك خانەی کوردی و

ڕازەی زمانی کوردی‌یەوە . زۆرترینی ئەوانەی کەئەم بەرتووکە دەخوو.
ێننەوە لەوبارو تەمەنانەدان کەلەبەهرەی خوێندنی قوتابخانانیدا بەشبراون
وبۆ دامرکاندنی هەوا و هـەوەس و دەرخستنی ڕازو نیـازە نهێنی‌یەکانی
خۆیان پەرتووکی وا هەر دەخـووێننەوە ئەوسا سـوو (شك) لەوەدا نی‌یە
کەبەباشی فێری خووێندنەوەی زمانە شـیرینەکەی کوردی خۆیان دەبن ،
سەرڕای ئەوەش هەموو چەشنە زانیارێك لەهەر بابەتێکی‌یەوە بێ جێگای
خۆیەتی کەبکرێنە کوردی . هەموو خووێنەوارێکی کوردیش ئاتاجی
وپێداویستی بەوە هەیە کەشارەزایی‌و ئاگادارێکی پوخت بەسەر بیروڕای
زۆرترینی مرۆڤە ئایینی‌و زانایەکانی ڕۆژ هەڵاتو بلیمەتەکانی ڕۆژ ئاوادا
لەبابەت خەونەوە پەیدا بکەن . . . لام وایـە منیش تووانیومە کەبۆ شـێ
کردنەوەی ئەو مەبەسە پڕ تەنـگ و چەڵەمەو ئاڵۆزو گرێ و گوڵاوی‌یـە
هەنگاوێك بچمە پێشترەوەو وام بۆ دەر کەوتووە کەخەون هەمووی پـڕو
پووچ‌و بێ واتاو لەوانە نین کەمرۆ لەکاتی بێدارێتی‌دا بەهۆی یەکێك لـە
پێنج هەستەکانی‌یەوە هەستی پێ کردبن ، کەوایە پێویستە لەرێگای زانستی
یێکی قووڵەوە بۆ هـەڵدان و شێ کردنەوەی هەوڵ بدرێت . هەر چەنـدە
پسپۆرەکانی هەموو نەتەوەیێکی لەبابەت ئاڵۆزیەکانی ڕەوانی‌یەوە دوواون
وبەراوەردیان کردووە هێشتا بەکانگای خەون نەگەیشتوون . لەم‌سەرەدەدە
چۆن بەچاوی خۆمان دیتوومانە کەمرۆڤ چەند جاران چوونە سەرمانگی
هیچ دوورو شوورەیش نیە کەلەدووا ڕۆژدا زاناو بلیمەتەپێشکەوتووەکانی
ناو گیتی بکەنە بنچینەی ئەو مەبەسەی کەهەزاران سالـە دانیشتووانی سەر
زەوی سەر گەردان کردووە !! ڕەوشەن‌و ئاشکراو یەکلای بکەنەوە .

گیوی موکریانی

# ئامـۆژ گاری

خەونێك جێگای بڕواو بایەخدارە کەلەدووای شەو گارێدا ببینرێت .ونکو لەودەمیدا هۆش (عقل) هێمن‌و ڕەوشەن‌و گیانیش بۆ ئەوەی ´ ی بەڕارە نهێنی‌یەکانی ئاسمانی ببات ئامادە تـر دەبێ‌و جگە لەوەش ئەم مەرجانەی خوارەوەش زۆر گرنگن : -

١ خەون بین نابی بەشەو زۆری خوواردبی .

٢ خەون بین کەنەخۆش‌و بریندارو ماندوو لەش بەبار نەبێ پەسندترە .

٣ خەون بین مەبەسی ئەو خەونەی کەدیتوویەتی نابێ لەکاتی بێداریێتی‌دا بیستبێتی یادیتبێتی و یابەدڵی داهاتبێ وەیاخوویندبێتیەوە .

٤ خەون بـین دەبێ شەوێ سـەرخۆش و تریاك کێش و شێت نەبووبێ ، .ەبێ ئەوە لەبیر نەچێتەوە لەلێکدانەوەی خـەون بۆ هەموو کەسێکی وە کوو یەکتری نین چونکوو لەخوو و خدەو سرشت‌وهەڵس‌و کەوت دا یێك ناچن ، لەو ڕووەوە کە دوو کەس هەر یەك جۆرە خەونی ببینن لەلێکدانەوەدا چارەنووسیان وەکوویەکتری نیە چونکو خەون ئاوێنەی ڕازی نهێنی نووێنەو هەر کەسەی چارەنووسی خۆی تێـــدا دەبینێ .

ابن سیرین دەڵێ دەبێ لێکدانەوەی خەون بەو چەشنە بێ : -

لەپێش‌دا دەبێ باری ژیان‌و تەمەن‌و کاروبارو ئایین‌و خوو و ڕەووشتی خەون دیتوو بزانرێ چونکوو خەونێکی دوو کەس بی بینن وەکوو یەکتریان بۆ لێك نادرێتەوە بۆ وێنە ؛ نێرگس لەخەوندا دیتن نیشانەی لەناو چوونە چونکو خۆشی تەمەنی کورتەبەڵان‌دیتنی مووریك لەخەون‌دا



پایەداری‌یە چونکوو ئەویش تامەن درێژە . دیتنی نانەوا : زۆربلێ بێ

کەچی دیتنی بەرگدروو : کارسازی‌یە چونکوو بارچان لێ‌دەدروێ

زالی : شکانە ، هێز بێ تینی‌یە هەر بەوجۆرە خەون لەسەرشێی بارچە

کرانیش لێك دەدرێتەوە بۆ وێنە پیاوێکی کەناوی فاضل بێ وا‌ی رور

ترو پترە چونکوو لەووشەی فاضل‌دا فضلة هەیە . یەکێکی وی سالم

بێ : ساخی و خۆشی‌یە . غنم لەخەوندا : ( غنیمەتە ) و تالآنەدەن .

مداهنەیە ، یاسین : ئاسە . عارەبان واتای خەون بەپێی وێچوو ووشە

و دەنگی لێك دەدەنەوە .

( فرۆید ) یش لەسەر ئەو شێوەیە ڕۆیشتووە وەکوو تەپڵ (طبل) باطلە

زانست و زانباری : زانایە . گەرماو : زاوایە . خەون لێکدانەبەند-

یواری زۆر بەکاتیشەوە هەیە بۆ وێنە کەلەخەونی‌دا لەبەهاری‌ەونی

بەداری بەردارەوە ببینێ : خێرە بەلآن لەپاییزی‌دا شەرە دەلێکێك

بەابن سیرینی ووت داری بەردارم لەخەونمدا دیتووە ؛ ووتی ارت

لێ دەدرێ لەپاش ماوەیەکی یەکێکی تر هاتە لای ووتی داری‌ارم

دیتووە ووتی بەخششو بەهرەت دەست دەکەوێ . لێ‌یان پرسیی

ئەوەی چی‌یە دوو کەس یەك جوورە خەونیان دیتووە بەیەکت

ووت چل دارت لێ دەدرێت و بەوی دووەمت ووت بەهرەت

دەکەوێ . لەوەلآمدا ووتی : هی یەکەم لەبەهاری دابوو دارە

کانەدا دەبوورژێتەوە ، بەلآن ئەویتر لەپاییزی دا دیتووە دارو

کەژەدا لەبەروو پۆ دەکەون .

هەر کەسێکی لەهەر نەتەوەو نەژادێك و خاوەندی هەرچەشنە ئایینێکی بێ بۆ دابین کردنی هەوا و هەوەس و قرم ( طمع ) و بۆ ڕزگاری لە چەنگالی تەنگ و چەڵمەی پڕ مەترسی و کارەساتی ڕۆژگار خۆش و ناخۆش پەنا بۆ بیر و باوەڕێکی دەبات کە بە درێژایی چەندین هەزار ساڵان بە دەنگ و باو ( تواتر ) لە باو و باپیرە گەورەکانیەوە بەوی گەیشتووە و تێکەڵ بە خوونی بووە و ڕێزی لێ دەنێ .

یەکێك لەو شووێنەوار و یادگارە گرنگانە خەون و ئەنجامە کار - یگەرەکانیەتی . بەپێی فەرمایشی پێغەمبەر د ، خەونی ڕاش پارچەیێکە لە ٤٦ پارچەی سروشی پێغەمبەرایەتی . خەون لە سەردەمە کۆنەکانی پێشوودا و بەتایبەتی لەناو نەتەوە پێشکەوتووەکانیشدا پلەیێکی بەرزی هەبووە و بە دروشم و یادگارێکی نەتەوایەتی و ئایینی تەماشای کراوە لەو ڕووەوە خەونە بەناو بانگەکانی پێشوو بەپلە کاریگەرەکانیانەوە تۆمار کراون بە تایبەتی لە یۆنانیدا ( ئەرضمیدرۆس ) و دووای ویش ( ئەفلاتوون و ئەرەستوو ) زۆری پێوە ماندوو بوون لە کوردستانی پێشووش دا ; ( موغ ) و خەون لێکدەرەوان و بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕازانی نەدیو و نهێنی دوواوون پایەیەکی گەورەیان هەبووە ؛ هەر ئەوان بوون کە خەونە ناودار ، کەی لەبارەی ( ماندان ) ی کچی ( ئاستیاژ ) ی پادشای کوردی مادییان لێکداوەتەوە و پەیدا بوونی کۆرشی گەورە ( سیرۆس ) و دامەزراندنی دەوڵەتێکی پڕ شان و شکۆی پارسیان ڕاگەیاندووە و هەر ئەوان بوون کە شکستی لەشکری کورد و فارسانیان لە بەرانبەر -

یونانی‌یاندا پێش بینی کردووه .

خەونی ( یوسف) پێغەمبەریش لە زیندانی میصری‌دا کە بۆ گیراوانی گیرابۆوە ڕاست دەرچوو یەکێك لەوان کوژراو ئەویتریشیان بوو بە مەی گێڕی فیرعەونی . خەونی فیرعەونیش لە بابەت هەرزانی و قاتی و قرێتی‌یەوەلەناو پەڕتوو کەئاینی‌یەکاندا تۆمار کراوە خەونی نەوشێرەوانی دادگەر لە بابەت ڕەخنە و شکستی پایەکانی کۆشکی مەداین و تاقی کیسرا و لەسەردەمی ئاینی ئیسلامدا بەلەناوچوونی‌شاهەنشاهێتی‌ی بڕ شان و شکۆی ساسانی کورد دا لەپاش چەند سالآن خەونەکەیان وەڕاست گەڕا .

خەونی ( عوسمان ) کە دامەزرێنەری دەولەتی عوسمانی و خانەدانی بنە ماڵەی عوسمانیان بوو لە ( ئەنەدۆلی ) کە ( ئەرطغرل ) ی بـاوکی یەکەمین ماموّتك ( مستشار ) و باوەڕگەی ( عەلائەددینی سەلجووقی ) بوو لەپاش لەناو چوونی ئەو دەولەتە لە ٤٨٥ی کۆچی‌دا هاتە ئاسیای گچکە و دەولەتی پێکەوەناو لەگەلّ ( مال) خاتوونی کچی یەکێك لە شێخو پارێزکارانی ئاینی شاری قۆینە بووبەهاوسەر ، خەونی ناوبراو چ گۆڕانێکی بەسەر ڕامیاری‌و نەخشەی گیتی‌دا هێنا !؟!

لە یۆنانیش‌دا پڕۆژەی فالگرتنەوەوخەون لێکدانەوەو لە ڕازانی نهێنی و چتی نەدیو دووان بەندبواری بە بەرهەمەکانی نەتەوایەتی و ئاینی‌یەوە دا بوو و لە ڕامیارێتیش دا ؛ کاریگەر بووە تا لە سەردەمی پێغەمبەراندا کە هۆیە ڕاستـە قینـە کارگەرەکانی ئاینی دەر کەوتن و ئیتر مرۆڤ خۆی لەو چتانەی کە بێ مایە و بووچ بوون

دوور خستەوە تەنها خەون نەبێ کەبەندیوارێکی گرنگی بە گیان و مێشکی مرۆڤەوە هەیە بایەخی پتر بێ دراو رێزی پتر لێ گیرا .

## خەون لەرێگای ئاییناەوە :-

خەونێ بەهرەیێکی گەورەی خودایی یە خوداوبەهرەبەیبە(یوسف)ی داوە وەکوو لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ ( و کذلك مکنا لیوسف فی الارض ولنعلمه من تأویل الاحادیث )

عبدالله کوری عباس دەلێ یەکەمین چتێکی کە خودا بۆ محمد (دخ) ناردوە ئەوەبوو : فریشتەیەك لەخەونی دا مزگێنی دایە کەخودا تەلای کردە پێغەمبەرو بوویە کۆتایی بێ دەری پێغەمبەران (ولکن رسول الله وخاتم النبیین ) کەوەئاگا هات و بۆ خەجیجەی گێراوە ئەویش کوتی : کەیفت خۆشبێ خێرو بەختەوەریت دەست دە کەوێ . وەلەپاش شەوی میعراجێش خەوتێکی تری دیت و خودا فەرمووی (لقد صدق الله رسوله الرؤیا بالحق لتدخلن مسجدالحرام آمنین ) تاالەو شوونێنەی کەفەرمویەتی ( فتحاً قریباً ) . پێغەمبەر دەفەرمووێ ( الرؤیا الصالحة جزء من ستة و اربعین جزء من النبوة ) واتا ( خەونی باش پارچەیێکە لەچل و شەش پارچەی پێغەمبەرایەتی ) ؛ اصحابان کوتیان قوربان کەهەمیشە لەئاسمانەوە خوربە (وحی)ت بەدلی داهاتبێت ئێمەت ئاگادار کردووە ئەدی ئەگەر خودای نەخواستە تۆ کۆچت کرد کێ وەلاّمو ئاگاداریمان دەداتێ جا ئێمە بەبێ ئاگاداری چ لە کاروباری ئاین دەزانین ؟ فەرمووی برادەرینە لەپاش من خوربەی دلّ (وحی) نامێنێ بەلاّن مزگێنی دەمێنێ .

ای‌یان پرسی مزگێنی چی‌یە ؟ فەرمووی ( الرؤیا الصالحة التی براها المرء الصالح ) واتا ( مزگێنی خەونی باشە کە پیاوی باش بیبینێ ) .

باوەڕی پێشوونیان بەخەونی پێغەمبەرانو لە ڕازانی نهێنیو نەدیو دووان جێگای بایەخە چونکو خەون دووا ڕۆژی مرۆڤی نیشان دەدا و پەردە لە ڕووی چارەنووسی ئێمە هەڵدەداتەوە . بۆ ئەوەی کە بەختەوەری‌یان لە پێشە مزگێنی‌مان دەدانێ کە بەد بەختی و ڕووشە و کێشەشمان لەسەرە ئاگادارمان دەکات تا لێی‌لادەین‌وخۆمان بپارێزین

ئەمڕۆ هەموو کەسێك لەوەدا لەسەر یەك بیرو باوەڕین ، کە خەون جار جارە زۆر بە ئەمەگداری و بە ڕاستی بەسەر هاتێکی کە لە سەرەدەمی منداڵێتی‌ماندا بەسەرمان هاتووە و ئێمە هەر هیچی‌مان لە بیر نەماوە وەیاد و بیرمانی دەخاتەوە .

بیرو ڕای چەند زانا و پیتۆڵ و پسپۆڕان

لە بابەت خەونەوە کە ( فرۆید ) یش لێ‌یان دوواوە : —

خەون : پارێزگاری خەوە نەوەکوو تێکدەری .

خەون : ئەو خەمو خەفەتو گیرو گرفتاری‌یانەی کە لە ڕۆژانی پێشوودا ڕەوان ( گیان )ی مرۆڤانی سەخلەت کردووە بەبایدا دەدات .

خەون : باری لەش‌و گیان سووك دەکات.

خەون : هەر چەندە خەون دووا ڕۆژو ئەوچتانە نیشان دەدات کە لەمەولا دادێن وەیا ڕوو دەدەن سەرەڕای ئەوەش تەنها بەو دوو چتانەیان

باوەڕ ناکرێت : ــــ

١- کە لەخەوندا ببینرێ مردوو زیندوو بۆتەوە (چونکو زیندوونابێتەوە)

٢- دووا ڕۆژێکی کە ئەتوانرێ لێی وورد ببرێتەوە.

خەون : ئەو هەموو کارە ڕووداوانەی کە بە سەر یەکتری‌دا کەوتوون لە ڕووی ئەوەوە کە خەون لە بەرامبەری وانـەدا تەنگەتاو و سەخلەت و سەر لێشێواوە لە جیاتی وەی کە هەموویان لە پشتی پەردەوە بنوێنێ تەنها کورتەیێکیان نیشان دەدات .

خەون : جێ گۆڕیو لەم شووێنەوە بۆ جێگایەکی تر گووێزتنەوە بەهۆی گیرۆدەیی دڵ بەوانەوە ئێمە بۆلای فیسارە کەس وئێرەو ئەوێ ڕادە کێشێ وە لە ئاستی ئامانجی ڕاستەقینەی خۆمان هەلداوێرێو تووشی چەندین مرازو ئامانجی ئاشکراو درۆزن و تەفرە دەرمان دەکات .

( هاڤنر ) دەڵێ مرۆ لەپێش هەمووچتێکی‌دا دەبێ ئەوە بزانێ کەخەون ژیانی سەردەمی بێداری ڕاگیراو دەکا ، خەونەکانی ئێمە هەمیشە بەندیواری- یان بەوەوە هەیە کە لەمەو پێش واتا لە کاتی بێدارێتی دا بوون کە بە لێ وورد بوونەوەیێکی مووقەلشێن سەرنجی بدرێتێ خەون لە گەڵ بەسەرهاتانی رۆژانی پێشوودا بەندیواری هەیە .

( بورداخ ) کە پسپۆرێکی ڕەوان ناسیو ڤیزیۆلۆژیە دەڵێ هیچ کاتێکی ژیانێکی کە بە ڕۆژ لە نێو باوەشی خەفەتو شادی‌وخۆشی‌وناخۆشی- یاندا ڕادەبرێ : دووبات نابێتەوە بەڵکوو فەرمانی خەون ئەوەیـە کە شەڕی ڕۆژێ لەسەر ئێمە لاببات ! خەونی ئێمە لەوانەیە کـە ئەوانـەی دەیان نووێنێ لە گەڵ هی کاتی بێدارێتی دا جیاوازی هەبێ .

( ئەناتۆڵ فرانس ) لە ( سووسەنی سوور ) دا وای نووسیوە : ئەوەی کە

لەخەون‌دا دەی بینین پاشماوەی ئەو چتە هیچ و پووچانەیە کەلەکاتی بێداریتی‌دا بەووردی سەرنجمان نەداوەتێ ، خەون بریتی‌یە لەتۆڵە ئەستاندنەوەی ئەوچتانەی کەلەکاتی بێداریتی‌دا خراونەتە پشت گووێ وەیا بەسوو کیان تەماشا کراوە .

(نووالیس) دەڵێ : خەون لەبەرامبەر رێك‌و پێکی‌وهاو ئاهەنگی ژیان پشتیوانی دەکا کەدەبێتە هۆی ئازادی‌و خۆشی‌و بیرەوەری و خەیاڵی تێیە کەئەوسا تەواوی‌وێنەکانی ژیان تێکەڵاو دەکات‌و باری‌مرۆی‌دڵقایم وەلەرزە دەحات و شووێنەکەی وی بەسەر گەرمی و خۆشی دەسپێرێ بەراستی‌و بەبێ گومان ئەگەر خەون نەبایە زوو پیر دەبووین . ئەگەر خەون بەیەکێك لەو بەهرانە نەزانین کەخودا بەتێەی بەخشیوە خۆ ئەگەر هەر نەبێ فەرمانداریکی دڵکێش‌و هاوڕێ‌یەکی دڵسۆزمانە لەهەموو کاتیکی نوستنمان‌دا .

(دوگا) دەڵێ : خەون واتا ئاخۆران ( هەرەج‌و مەرەج )ی رەوان‌و میهرەبانی دەماغی‌یە یابەڵوو پۆو تەکاپۆیەکی بێ ئامانجە . هۆش لەخەون‌دا وەمرۆیەکی کۆسەوەوە (مضحك ) دەچێ .

( هێلدبرانت) دەڵێ پێویستە وەکوو بەیام دەر تەماشای خەون بکرێت ، چونکوو کەم‌و کووری ئەوانەی کەنابینرێن‌و دیار نین لەبابەت ساختیی خۆمانەوە پێمان رادەگەیەنێ ، خەون لەوانەیە وەکوو پزیشك بەسەر ئەو جۆرە نەخۆشی یانانەمان‌دا ئاگادار بکات کەنابینرێن .

(مووری) دەڵێ . خەون پەردە لەسەر چینی بەدرەفتاری هەڵدەداتەوە ، مرۆ کەهەندێ کرداری بەد و رەفتاری ناپەسەندی بەنهێنی هەبێ لەکاتی

بێدارێتی دا لە شەرمان و لە ترسی ئابڕوو چوون و ڕیسوا بوونی لە
دەستی بێ ئاشکرایان ناکات کەچی لەخەوندا هەرئەو مرۆڤە لەڕووی
ئەوەوە جلەوی کار ( ارادە ) ی لەدەستدا نیە خۆی بە ڕووتیش ببینێ
لای هیچ نیەو بەپێی هەواوهەوەسی خۆشی زۆرسەربەستانە دەجولێتەوە
( وێگانت ) ( بورداخ ) ی وەدرۆ دەخاتەوەو دەڵێ خەون لەجیاتی ئەوەی
کە ئێمە لەچەنگاڵی ئەوهەموو تەنگ و چەڵەمانەی سەردەمی بێدارێتی
ڕزگار بکات دووبارە دەمانخاتەوە ناو گێژاوی بێ سەر و بنەوە .
( جسن ) لە پەرتووکی ڕەوان ناسی خۆیدا کە لە ساڵی ١٨٥٦ دا بەخشی
کراوە بەئاشکرا نووسیویەتی ناوەڕۆکی خەون کەموزۆر پەندیواری
بە خەون بینو تەمەنیو ڕەسەنو بارو خووێندەواریوڕەفتارو کاردسات
و تاقیمانەی تەواوی سەردەمی ژیانەوە هەیە .
پیتۆڵی ناسراو ( ای ، ج ، ای ، آس) لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی خۆیدا
کە لە ئی هەموانی ڕەوشەنتر نووسیووە تاقیمانە نیشان دەدات کە
ئێمە هەمیشە ئامانجە هەرە سەخت و گرنگەکانی هەوا و هەوەسمان لە
خەوندا دەبینین کەوایە دیارە هەواو هەوەسی ئێمە لە پێکهێنانی خەو-
نەکانماندا کاریگەرە بۆ وێنە مرۆی بایە پەرست خەون بەو بایەوە
دەبینێت کە داویانەتی یا دەیدەنێ . گراو (عاشق) خەون بە دڵداری
خۆیەوە دەبینێ . هەموهەویاو ترس و بێزو بۆیەکی کە لەناو دەروونی
ئێمەدا نوستووە لەوانەیە لە لایەن هاندەرێکی نەناسراوەوە خەونێکی
وا بێك بێنێ کە ئەندامی وان بنوێنێ و یا چەند کەل و
پەلێك و کارەساتێکی کە پەندیواری بەوانەوە بێ و لە ناو

خەونەکەی دا تێکەڵاوی ئەوانی تری بکات .

( موری ) دەڵێ ئێمە لە خەونماندا کوتن و ئارەزوو و ویست و کردەوەکانی خۆمان دەبینین .

( هێلدبرانت ) دەڵێ هەر چەندە ئەو مەبەسە تێپەڕیوە و بە سەر چووە ، دەتوانرێ بگوترێ کە وێنەی وی ڕاست و دروستە و دەتوانرێ باوەڕ بکرێ کە خەون و بێداری بەندیوارێتیان بە سەر یەکتریەوە هەیە وە دەشتوانرێ بڕیار بدرێ کە خەون و بێداری بەندیوارێتییان لەگەڵ یەکتری نیە ، لەوانەشە ئەوانەی کە خەون نیشانمان دەدات لە سەردەمی بێدارێتیدا وەری گرتبن ، هەر چەندە ئەخشی خەون سەیر و ئەنتیکە بێ ناتوانی بڵێی ئەو گیتی ( عالەم ) یە کاری لێ نە کردووە ، هەرچیەکی لەخەوندا دەبینرێ : هەرە نزمترینەکانیان لە چاو بێ کەوتن و ویستن و بیر لێ کردنەوەی سەردەمی بێدارێتییە کە بە سەر ئێمە دا تێپەڕیوە سا بەسەر خۆماندا تێپەڕی بێ یا بەناو ئەو هەرێمەدا بووری بێ کە ئێمەی تێدا دەژین .

( فرۆید ) دەڵێ : خەون چتی وا نیشان دەدا کە لەمەو پێش لە سەر دەمی بێدارێتیدا دیتراوەو خەون بینان نایان ناسنەوەو نازانن ئەوانە کەی و چلۆن لە کاتی بێدارێتیدا بە سەریاندا ڕابردووە ، کە سەرچاوەکەیان نەدۆزیبەوە دەکەونە کەڵکەڵەی وەی کە پاڵشتی خەونەکەی بدەنە پاڵ دەستەڵاتی یەزدانی و هەتا کاتێکی کە ڕووداوێکی نوێ ڕوو-بدات لەوسا لەوانەیە ئەوانەی کە لە بیریان چوونەوە وەیادیان بهێنیتەوە ، ئەوە جێگای باوەڕییە

کەمرۆ گەلێك جتی لەکاتی بێـداریێتی دا نایەتەوە بـیر بەلاَن لەکاتی نوستن‌دا خەون دەیخاتەوە یادی .

( موری ) دەڵێ : زۆر جاران ووشەی ( مووسیدان )م بەڕۆژ لەکاتی بـێ داریێتی‌دا بەیاد دادەهات و دەچوو و دەمزانی کەناوی شارێکی‌یە لەخاکی فەرانسەدا ، تاشەوێکی لەخەونمدا لەگەڵ یەکێکیم ووتەو وێژ دەکرد کەخەڵکی ( مووسیدان )ێ بوو لێم پرسی (مووسیدان ) لەکوێ‌یە : ووتی ناوچەی وولاَتێکی‌یە کە(دۆزدۆ)ی پێ دەڵێن کەبێدار بوومەوە باوەڕم نەکرد ، بەلاَن کەسـەیری فەرهەنگی ئەردناسیم کرد وەیادم هاتەوە کەئەوەی لەخەونمدا دیتوومە ڕاست دەرچوو .

دەڵێ نەخۆشێك بۆی گێڕامەوە کەبەدرێژایی خەونەکەی لەچایخانە بەناوبانگەکەی (....) دانیشتبوو پرسی بووی ئەوە چی‌یە ؟ چـونکوو ناوی وای نەبیستبوو ، ووتیان ناوی جۆرە ئارەقێکی (لەهستان)ی‌یە . گوتی لەپێش‌دا باوەڕم نەکرد بۆڕۆژی دووایی کەچوومە چایخانەکە ئەوەی کەلەخەونمدا دیتبووم سەیرم کرد لەسەر ئەوشەقامەیە کەچەندین مانگە ڕۆژێ دووجاران بەوێ‌دا تێ دەپەڕم ؛ دیسان (مووری) دەگێڕ-ێتەوە کەلەسەردەمی منداڵێتی کەنیشتەجێی (موو) بوو هـاتووچۆی دێیەکی نزیك خۆیانی دەکرد کەناوی (تریلپۆر) بوو چونکوو لـە وێ‌دا سەرپەرشتی پردێکی بوو ، شەوێکی لەخەونی‌دا دیتی کەلەگوندی (تریلپۆر)دا گەمەی دەکرد پیاوێکی کەبەرگێکی یەك شێـوە (متحد الشکل)ی لەبەر دابوو لێی نـزیك کەوتەوە ( مووری ) لێی پرسی ناوت چی‌یە ؟ ناوی ( ت ... )و پارێزگاری پردێ بوو ، کاتێکی وەئاگا هاتەوە لەبابەت ڕاستێتی بیرەوەری خۆی دوو دڵ بوو لەکارەکەرێکی

برسی کەلەسەردەمی منداڵێتیدا لەلای وی بوو لەبابەت سـﻪـۆراخی پیاوێکی واوە . ئەویش لەوەڵامدا وتی بەڵێ ئەو پیاوە پارێزگاری پردێ بوو لەکاتێکیدا کەباوکت سەرپەرشتی بوو .

(هاولوك الیس) لەلاپەڕە ٧٢٧ دا نووسیویە : دەوسان (تأثرات)ی قووڵ کەزۆر بەسەر هێزی ڕەوانیدا کاریگەرن لەوانە نین کەوابەسادەیی خۆ دەنوێنن بەڵکوو ئەو چتانەن کەلەکاتی بێدارێتیدا بەسەری هاتون ولەبیری چوونەوەو هەر ئەوانن لەخەوندا ئەندام دەنووێننەوە .

ئەو چتـﻪ کاریگەرانەی کەلەکاتی نوستنیدا مـرۆی ڕادەپەڕێنی ئەوانەن کەلەناو قووڵ ترین ناخی چینی ڕەوانی ئێمەدا نوستوون وا دیارە کەلێ کۆلێنارەوان لەو بڕوایەی دان کەسەرچاوەی خەون چەند چینێك بن کەلەلەشو ڕەوان جـووێ دەبنەوە بەڵان لەسـەر ئەوەی کە ئەو بەشانە کامیان بەسەر کامیانەوە هەیە ; کێشەیان لە نێوانیدا پەیدا بووە . کەپێتو هۆو سەرچاوەکانی خەون بژمێرێن لە ئەنجامدا چوار سەرچاوە ئاشکرا دەبن هەروەکو خەونەکانیش دەبنە چوار بەش

١ـ هاندانی هەستی دەرەوە ( چاو ) .

٢ـ « ناوەوە ( ئەندامانی هەستیار ) .

٣ـ « « ( هەروو لەش ) .

٤ـ « « ( ڕەوانی ) .

( جسن ) لە لاپەڕە ( ٥٢٧ ) ی پەڕتووکەکەی دا نووسیویە : هەردەنگێکی کە کەم یا زۆر بە ئاشکرا ببیسترێ چەشنە خەونێکی تایبەتیان

پێوە دەبینرێ . کەدەنگی هەوری بیستری : مرۆی دە کێشێتە مەیدانی شەڕێ . دەنگی کەڵەبابیش لەخەونەدا لەوانەیە لەترسان ناڵەو هاوار بنوێنێ . دەنگی دەستکا لەخەونەدا لەوانەیە دزێك ببینرێ کەبچێتە ناو ماڵێکیەوە . کەسێکی کەلەخەونی‌دا لێفەی لێ بکرێتەوە یابەڕووتی بکەوێ و یاببینێ کەلەئاوێ کەوتوە ، خۆ ئەگەر لەسەر تەختی نوستنێ درێژ بوو بێو پێی لەسنووری تەختەکەی تێ پەڕیبێ : لەوانەیە کەلە خەونی‌دا خۆی لەناو گێژاوێکی‌دا ببینێو یاوا ببینێ کەلەبەرزیەوە کەوتۆتە خوارێ . ئەگەر بەرێکەوت خەوتوو سەری بکەوێتە ژێر سەنیرەکەیەوە : لەوانەیە گاشە بەردێکی ببینێ کەلەژووری سەریەوە هەڵاوەسراوەو بەو زووانە بەسەری دادەکەوێ و سەری پان دەکاتەوە کەجێگایەکی لەشی یێشێ لەوانەیە کەلەخەونی‌دا ببینێ کەدەرمانی دەدرێتێ و چارەی دەکرێ و یا دوژمنان پەلاماری دەبەنە سەری و برینداری دەکەن .

مۆقبوئر) لەسەردەمی گەنجێتی‌دا لەخەونی‌دا دیتی کەلەدیوارێکی بەرزەوە کەوتە خوارەوە کەلەناوان وەئاگا هات دیتی کەتەختی نوستنەکەی شکاوەو لەبەر یەکتری دەرهاتووەو کەوتۆتە سەرزەوی .

مووری) چەند خەونێکی بەسەر چاوەکانیانەوە نیشان دەدات بەوچەشنە :

- بەبەرێکی باڵندان قدیلکەی لێوو کەبۆی نوستوویێکی درا ، ئەویش لەخەونی‌دا وای دیت کەئازار دەدرێ و قیرو زفتی لەسەر ڕووی دادەنێن و هەڵیدەکەننەوە پێستی لێ دەکاتەوە .

٢ - لەنزیك نستووێکی چەقۆیەکیان لەماشەیەکیدا ئەویش لە خەونیدا
دەنگی چەند زەنگێکی گووێ لێ بوو .
٣ - گوڵاویان لەکەپۆی خەوتووێکی نزیك خستەوە ؛ کابرای نوستوو
لەخەونیدا خۆی لەقاهیرەو لەکۆگای ( ژان‌ماری فاری ) یەدا دیتبوو
و هەنگامەیێکی سەیری وای بەسەر هاتبوو کەنەیەتووانی بیگێرێتەوە
٤- ئاسنێکی گەرم لەڕووی نستووێکی نزیك خرایەوە ، ئەویش لەخەونیدا
وای دیت کەدەستەیەك تونگچی لێ چوونە ژوورەوە و هەموو ئەندا-
مێکی ماڵەکەیان ناچار کرد کەبارەی خۆیان بەسەر جەغزی خەڕدا
بڕێژن‌و لەو دەمیدا پێیەکانی وی دەخەنە ناو ئاگری .
٥ - تنۆکە ئاوێکیان خستە سەر نێو چاوانی خەوتووێکی : ئەویش لە
خەونیدا دیتی کەلەئیتالیایەو بەسەختی ئارەقەی دەکات و لەمەی سپی
دەخوواتەوە .
٦ - چەند جارێکی ڕووناکی مۆمیان لەپشت قاقەزێکی سوورەوە لەنزیك
ڕووی خەوتوێکیان ڕاگرت : ئەویش لەخەونیدا دیتوویە کەلافاوێك
هەستاوەو هەوا بەسەختی گەرم بووەو خۆشی گرفتاری ئەو لافاوەی
هاتبوو ، لەکاتێکیدا کەبەدەریای مانش‌دا دەپەڕیەوە تووشی هاتبوو
(وولکێت) : وادە گێڕێتەوە کەدەنگ خۆشێك (دارد)ی لەخەونیدا دیت
کەوانەی بەقوتابیەکانی دەکوتەوە و بەتایبەتی دەبوێست چتێکی بۆ

وان ڕاڤە بکات لەئەنجامدا لەمنداڵێکی پرسی تۆی گەیشتی ؟ قوتابیە کە وەکوو جنۆکە دەستی لێ وەشاند بۆ هـاواری کردو کوتی ئـاه ، ئەی هاوار ، وای ئەوجار هەموو قوتابییەکانی پۆلەکە هاواریان کرد ئەی هاوار ، وەیـداد ، ئای ئاگر ، ئای گیتی سـووتا . کەلەخەونی‌دا ڕاپەڕی ئەو دەنگانەی هەروەکوو لەخەونی‌دا بیستبووی لەکۆڵانیشی دەبیست .

(مۆر) : خـەونێکی وای دیتـووە کەلەبەر سـەیری بەناو هـەموو گیتی‌دا پەخش و بلاو بـۆتەوەو لەلاپەڕە (١٦١)دا وانووسراوە : مـۆر باری باش نەبوو ڕاکشاو دایکیشی لەتەنیشتی بوو لەخـەونی‌دا شـۆڕش و شەڕو شۆڕێکی سامـداری دیت و لەئەنجامدا لەدادگادا ئامـادە کراو فەرمانی خنکاندنی درا کەبردیانە مەیدانێ دەستەیەکیش لەوێ هەڵاوە. سرابوون ، ئەسەقچی (جلاد) لەوێ بەساتۆری سەری بڕی ، کەلەترسان وەئاگا هات سەیری کرد میچی تەختەکەی نوستنی‌ی کەوتبوو چێتێکیش کەوەساتۆری دەچوو کەوتبووە سەر گەردنی .

(ئەرەستوو) ڕەنگە لەسەردەمی خۆی‌دا زانیبێتی کەخەون لەونەخۆشیانەی کەبەتازەگی لەلەشی ئێمەدا جێگیر دەبێو ئاگادارمان دەکات لەوانەیە کەلەکاتی بێدارێتی‌دا ئاوڕیان لێ نەداینەوە چونکوو هەستەکانی ئێمە لەکاتی خەوێ‌دا جیلوە دارترە .

چەند لێکۆڵینەرەوەیەك لەڕاست نهێنی دووانی خەون‌دا بێباوەڕن بەڵان سەرڕای ئەوەش ئەگەر هـەر نەبێ لەسەر هەڵدانی چــەند نەخۆشیێکی ئاگادارمان دەکات .

بۆ لاپەڕە(٣٠٧)

# بەسەرهاتی ابن سیرین

ناوی ( ابو بکر محمد ) و ناوبانگیشی ( ابن سیرین )ە . بەپێی قاموس الاعلامی شمس‌الدین سامی : ( ابن سیرین خەڵکی بصرایەو لەتابعینانە و نێوانیشی لەگەڵ « حەسەنی بەصری » زۆر خۆشبووە ، دایکیشی لەکەنیزەـ کەزێڕ کڕید (عبد)ەکانی أبابەکری صدیقی بووەو ئازاد کراوە،ابن سیرین دوو ساڵان لەپێش کوژرانی امامی عثماندا لەدایك بووەولە ١١٠ی کۆچی کۆچی دووایی کردووە ، چەند حدیثێکی لەزمانی تابعین و ئەصحابانەوە گێڕاوەتەوەو لەخەون لێکدانەوەش‌دا سەلیقەی هەبووە ) .

هەرچێکوو شاری (بصرا)یە چەند سەد ساڵێك پێش پەیدابوونی ئیسلام لەلایەن براکوردەکانی ساسانیانەوە کەلوورو فەیلی بوون دروست کراوەو لەوسەردەمە کۆنانەدا بەچەندین ناوی جیاواز لەمێژوودا ناو براوە وەکوو ( بیسترِا ، بەسترِا ، شاد بەهمەن ) . وە ابن سیرینیش لام وایە لەبنچینەدا (ابن سیرینی) یا ( بەر سیرینی )یە و ( بەرسیرین ) دێیەکە کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتی شاری ڕەواندزێ‌وەو بەپێیان ڕێگای دوو کاتژمێرانە .

مەلا محمد قادر کەبەکانی‌بە قوری ناو دەر کردووەو لەپێش‌دا مەلایەتی‌دە کرد وئێستاش مامۆستای قوتابخانەیەو پیاوێکی زاناو ڕاستو خودا پەرستە دەڵێ ( ابن سیرین ) نیە ( ابن شیرین )ە و نوختەکانی پیتی (ش) بەڕیوون یابـۆ شووێنە وونکە فرێدراوون و خۆشی خەڵکی دێی ( بەرسیرینی ) لای ڕەواندزێ بووەو کوردێکە لەئاوی شەوێ پاکترە . دێیەکیش بەناوی (سوورین) لەباشووری ڕۆژ ئاوای شاری بانەیە .

گیوی موکریانی

ئابیدە(مجسمە) : ژنە . کەسێکی لەخەونیدا هەبێ : ژنی دەبێ کەلەدەستی
دا بکەوێو شکێ : ژنە کەی بەرەڵادەکاو ؛ دەڕوا .
ئابڕو چوون بێ ڕێزی پێ کران : یەکتر ناسینو مرایی دیدەنی کردنە
ئابڕووی کەسێکی تر بردن و بێڕێزیپێ کردن :مووچەو ڕۆزی بتردەبێ .
ئابڕژێن هاتنە خوارو کەم کردن و نامی و پاشکەوتنە .
ئاخەفتن ( قسە کردن ) : ابن سیرین لای وایە کە ئـاخەفتن و یابیستن ـ لە
خەوندا لێکدانەوەی بەپێی زمانان جیاوازە ، کەبەیۆنانی باخووێ :
خەریکی زانیاریو ئەنبوژەنی(حکمت) دەبێ بە زمانی هیندی ..پایەی
نزم و سووك دەبێ جعفری صادق دەڵێ بەهەر زمانێکی لە خەونی دا
بدوێ یابیێ کە خەونە کە باش بێ باشە .
ئارەقە کە ـ لەخەوندا بە لەشیمرۆیدا بێتە خووارو بتکێ: زیان بەسامان
بەگاکە نەخۆشێك لەخەونی دا ـ بکا : چادەبێتەوە و ئاواتی پێکدێ .
ئارد ـ ی گەنم : سامانو ماڵی ڕەوا (حلال) یە سووتاندنی : زیانە ـ ی
گو.ە پێغەمبەرە (گەنمەشامی ) : بەد بەختی و نەگبەتی یە .
ئاردێژ :پیاوی چاکەکارە ، ژنی ـ ئاوری بنکایە ،نۆکەری سودێکی کەمە
ئاژنینەوە ـ زیان بە ماڵو منداڵ گەیشتنە .
ئازادی : کە لە خەونی دا خۆی ئازار بکرێ قەرزی بۆ دە دریتەوە ، لە نە
خۆشی چاك دەبێتەوە ئەگەر نۆکەرە ئازادە بێوە بەخۆشی وشادمانی دە گا
ئازار ـ و ڕەنج لە خەوندا نیشانەی کەنەفتیو بێچارەیی یە . کەیە کێك ئەوی
ـ بدات : زبانی پێ دە گەیەنی . کە ئەویە کێکی تر ـ بدا لە بەر چاوان
سوو کی دە کات

تاسـتانە ( سەرەدەرگانە و خوار دەرگانەیە ) . کەسێکی لەخەونی‌دا ـ ی دەرەوەو خوارەوە تێك دا میرد وژن دەمرن . کەچاکیشیان کانەوە ژنەکەی بەرەلاَ دەکاتو یەکێکی‌تر دێنێت . کە ـ ی ماڵی وی بکەوێ سووك دەبی . کەهی سەرەوە تێك دا ; خۆی دەمرێ . کە هی خوارەوە تێك دا ؛ خێزانی دەمرێ .

ئاسك . ـ گرتن ؛ ئافرەتی جوان دەست کەوتنە . کەبەدەست ـ ی بگری‌و یا بتەنێ ؛ منـداڵ بوونە لەکارە کەرێکەوە . ـ سـەر برین ؛ پەردەی کچێنی کچێکی درِاندنە . ـ کەولکردن ؛ لەگەڵ ژنێکی ئاوارە دەست تێکەڵاو دەکەن . ـ کوشتن ؛ لە لایەن ئافرەتـەوە ; خەم و خەفـەت پێکەیشتنە . پێچووە ـ گرتن ؛ لە کەنیزەکی منداڵ بوونە .

ئاسمان : دووارِۆژ و بەختەوەری و دلداریتی و سەودای تەواوە . گیرانی رووی ـ . شەرِو تالاَنە ، ـ ی ساو : رەفتارو کردەوەی‌ئابرِوو مەندانەیە کە ـ پرِلەستێرە بێ : جێگا گۆرِینە : ـ ی بەباوبارانە : تەلەز- گە(خطر) دەنگەو هەرا لە ـ : خێرو بەهرەیە . بەرەو ـ بەرز بونەوە : بەختەوەری‌یە بەرەو ـ فرِین : رِەنج‌و زیانە . بالندەیەك کەلە ـ موەقسەی لەگەلێوی بکا : شادمانی لە دووایە . کە لە ئاسمانەوە خۆی شۆرِکاتەوە : کارو باری پێکدێ کەبیێنێ دەرگایانی ـ کراونە تەوە : بارانەو ئاو زۆر دەبێ . هەلگوین لە ـ موە بباری : خێرو پیتوپیرۆزی‌یە بارینی‌خیز و خۆڵ لە ـ موە : خراپە . مارو دووپشك و پابەرد بباری : کێشەو کارەسات وئازارە . بارینی گەنموجۆ : روزی‌و بەهرەیە کەرِەنگی ـ سەوز ببینی ; تووشی خێرو چاکەی دێت ، کەسپی بێ : رەنج و نەخۆشی یە رەنگی سوور و رِەش ; شەرِو کێشە بەر پادە بێ کە ـ نیشانەی سووری پێوە بێ : ـ سەر کەوتن پیروزی‌یە . کە یەکێك خۆی لە ـ ێ دا ببێنێ : سەفەرێکی برِ سامانی لە پێشە

ئاسن : نۆکەر و سامان و ئاشتی و خۆشی یە .
کە ـ ی بدرێتێ : بەخشش و بەهرەی لەوەوە پێ دەگات .
کە ـ لەخەون دا لەبەردی بدرێ : سەختی و سەخڵەتی یە .
ئاسنکێش ( مغناطیس ) : بەدیداری دۆست و یارێکی شاد دەبێ .
ئاسنگەر . کەبینێ ئاسنگەرێتی دەکات و پیشەی خۆشی نیە : دوژمنایەتیە .
کەخۆی ـ بێ : خێر و سوود و خۆشی یە . کە ـ ببینرێ پادشایی و گەورەیی یە . کەبینی ـ ئاسنی دەتاوێنێتەوە : لەپاش ملە دووانی خەڵکیە
ئاسۆی شین : سەودای نهێنی و ڕاستە ، دڵدارێتییێکە کەبڕناکا دەری ببڕێ .
ئاش . دیتنی ـ : شەڕ و کێشەو دوژمنایەتی یە . گەنم بردنە ـ و بکرێتە ئارد :
بەهرەو ماڵ و ڕزقە ، کەسەیری گەڕانی ـ بکات : کۆچی دێتە پێش .
کەخۆی لەئاشی دا ببینێ : لەگەڵ یەکێکی تووشی دوژمنایەتی دێت .
ئاشەوان . دیتنی ـ : ڕۆزی یە . کە ـ گەنج بێ : باشتریشە .
ئاشپەزخانە : کارەکەرە . کەلەماڵی خۆیدا ـ لەگبن و تورِ دروست کات :
ژنێکی ئایینداری دەست دەکەوێ . کەبەخشت و کیچی بێ ، هی بێ ئایینە . کە ـ کە هی خۆی نەبێ : چاکە و خراپەی تێخەی خاوەندی دەگرێتەوە .
ئاشتی : ـ کردن لەخەون دا تەمەندرێژی و هێز و بیر و باوەڕی پەسندە .
ئاش چێتی : کەیەکێك ببینی کەلەخەونی دا ـ دەکرد : ئەگەر ئەوەی کەلێی دەنا خۆش بێ ، سوودی لەگەورەیەکی پێ دەگات ، کە ناخۆشیش بێ : بەپێچەوانەیە .
ئاشکە ( معدة ) . کەبینی ـ ی ژانی دەکات : تەمەنی کورت دەبێ کەژان نەکا : زۆر دەژی . ( جابر ) دەڵێ : کە ـ ی ساغ بێ و خواردەمەنی وردو خاش بکات : منداڵەکانی لەنەخۆشی دڵنیا دەبن .

ئاغـەڵ : ( ئاخورِ ) : ژیانێـکی پڕ ئارامی و ئاسوودەیی و مـیراتە . پاك کردنەوەی ـ : سەر کەوتن‌و پیرۆزیـێکی گەورەیەو بەئاوات گەیشتنە .

ئافتاوە (مەسینە) : دیتنی ـ لەخەونَدا : سامانەو تەگبیری ماڵداریێکی رِێك وپێکە . کە ـ ی تازەی هـەبێ یا یـەرێتێ : سوودە ، کارە کەرێکی دەبێتە کابانی ماڵێ . کە ـ کە بشکێ : کارە کەرە کەی نەخۆش دەبێ یادەمرێ . کەپادشایەك بیـداتێ : دەبێتە گەنجینەدارو رِاوێژ کاری وی . کەلە ـ دا ئاوێ بخواتەوە : منداڵی دەبێ . هێندێکیش دەڵێن : نۆ کەرە

ئاگانامە : ( اعلان ) . ـ ی سپی : فرشتەی باش‌و پیرۆزە . هی زەرد بەد نەکی و ناپایەداری‌یە . دانان و هـەڵاوەسینی ـ : گرێ و کۆسـپە دە کەوێتە ناو کاروبارەوە . لێکردنەوەی ـ : بەدخوویی‌و بەدرِەفتاریە .

ئالاَ وەڵامێکی دڵنیا کارە لەلایەن سوپا یادەوڵەتەوە . هـەڵگرتنی ئالا پیرۆزی و سەر کەوتنێکی دەمـەکی‌یە (موقت) . لەرینەوەی ـ لەسەر ماڵی : ئاشتی و ئارامی‌یە ، ـ لەخەونَدا دیتن : پیاوێکی زاناو یا خودا ناس‌و یا دەوڵەمەند و دڵ فراوانە . کەببینێ ئالای هـەیە لەو جۆرە پیاوانە سـوودی دەست دە کەوێ . کە ـ کە بکەوێ یا لەناو بچێ : بەپێچەوانەیە .

ئاڵقە : بەیەك گەیشتنی دڵدارانە . سەر گرتنی هاوسەری‌یە لە گەڵ دڵدار . ـ ی شکاو دیتن : جیایی و ئاوارەیی و دەست لێك بەردانە .

ئالیك : خواردنی ـ : پەرێشانی و کەنەفتی‌یە ، کۆ کردنەوەی ـ : هەرزانی و فراوانی‌یە .

ئامۆژگاری ( نصیحة ) : کەبیبنێ لەخەونیدا ـ یە کێـکی تر دە کات شادی‌یە
کەئەو خەونە نەخۆشێك بی بینێ : چاك دەبێتەوە .
ـ ی باش لەلایەن باشانەوە چاکە . هی‌خراپ لەلای خراپانەوە . خراپە
ئاو : خواردنەوەی ـ ی پاك‌و خۆش . تەمەن درێژی‌و گوزەرانێکی‌خۆشە .
« « سوێر بەپێچەوانەیە .
کەئاوی دەریایە هـەموو بخواتەوە . دەبێتە پادشا یامال و سامانێکی
زۆری دەست دە کەوێ کەئاوە کە ڕوون بێ . بـەلأن کەشلوێ بێ
بەپێچەوانەیە .
دیتنی ئاوی زۆر نیشانەی هەرزانی‌یە ، کەلە ـ یێدا مەلەی بکات :
لەڕەنج‌و ئـەرکی خۆی سـوود وەردە گرێ . کەلە ـ یێدا بخنکێ :
تەلەزگەو بڤە ( خطر ) یە کی گەورەیە . کەئاوی گەرمی پێـدا کرێ و
ئاگای لێ نەبێ نەخۆش دەبێ‌و یانووشی خەفەتێکی گرنـگ دێت .
بەسەر ـ یێدا ڕۆیشتن : زاتو ئازایی‌و سەر کەوتنە .
کە ـ بەرەوو هەوراز بڕوات وە کوو ئـاوی دەریاو ڕووبارو ئیتر :
بیرو باوەڕی وایە کەبکەوێتە ناو ـ : تووشی ڕەنج و گرفتاری دێت
کە ـ ێ بەجامی هەلگرێ : بۆمال‌و ژیان تـەفرە دەخوا . کەئاوی لە
کاسەیە کی‌دا بدا بەخێزانی : مندالی‌لەزگی‌دایە . کەکاسەیە کە بشکێ :
هاوسەرە کەی دەمرێ‌و منـدالە کەی دەمێنێ کەئاوە کەی بڕژێ و
کاسەیە کە بەبەتالی بمێنێتەوە تەنها مندالە کەی دەمرێ . کەبێ‌نرخ ئاوی
بدا بەخەلکی . خێری پێدە گات‌و کاولان ئاوەدان دە کاتەوە
کەبچێتەناوهەرمالێکی ئەوتۆ کەئاوی‌لێ‌ڕژابێ : توشی‌خەموخەفەتان‌دێ

ئاو : چوونە ناو ـ و لەوێش‌دا کەلەشی بەهێز بێ : دیارە خەریکی کارێکی سەخت دەبێ‌و تێ‌ی‌دا سەردە کەوێ‌و هێزو سوودە . بەبەر گەوە چوونە ناو ـ ی ڕِوونەوە : نیشانەی پایەداری‌و خۆڕا گرتنە لە کاراندا . کەبینی ئاوی بەرەو باخی دەبات : ژنێکی دێنێ . کە کەسێك ـ یێکی پاکت پێدا کات : لەو کەسەوە خێرو سوودت پێ دە گا . هی شلوێ وا نیە .

ئاوارە : کەلەخەوندا بینرێ ئاوارەیەك لە کۆچ گەڕاوەتەوە کاروباری بەستراوو بەك کەوتووی پێك دێتەوە یالەئاوارەیە کیەوە نامەی بۆدێت . کەئاوارە کە بەسـواری بگەڕێتەوە : وا دیارە کەبەمالْ و سـامانەوە دە گەڕێتەوە .

ئاواز : بڕوانە دەنـگ . ئاوازە بڕوانە گۆرانی .

ئاوەدانکردنەوە : لەخەوندا ـ ی خانوبەرە ، مز گەوت‌یاقوتابخانە : نیشانەی خێرەو مەندی‌یە . ـ ی مالْو دوکان‌و چتی وا : سوودو کەلکە .

ئاودان : ئاودەر پیاوێکی ئاینداره . کەئاوی بەبێ مز بەخەلْکی بدات : چاکەی لە کەلْ دەکا . کەخیـکەی بڕِ کات و بە کەسی نـەدات : مالْ کۆ دەکاتەوەو سوودیشی لێ نابینێ .

ئاودەستخانـە : دروست کردنی ـ : قرچـۆکی‌و مالْداری‌یە ، هێندێکیش دەلْێن : ژنێکی بێ ئابڕوو جادوو گەری ناپـاك دێنێ . کەمیزو پیسایی تێکا ، مالْو سامان دەچوێنی . کەلەوێ یالەچالْە کەی بکەوێ : مـالْ کۆ دەکاتەوە . کەبینی یە کێکی تر لەوێ کەوتووە : مـالْ و سامانی یە کێکی‌تر زەوت دە کەی . لەتێ کەوتنی‌دا جێگایە کی بشکێ : کێشەو گێچەلْە .

ئاودێری : ـ ی باخ‌و باخچەو ئیتر لەخەم‌و خەفەت ڕِزگار بوونە .
ـ ی گولْ و گیایان هەولْو تەقەلاْیە لەکاروباری بێ سوود دا .
ـ ی زەوی : فرمێسکی خەفەت و پەرۆشی‌یە .

ئاگر ڕِق و قـین‌و کێشەیە کی گەورەیە کەبـوو تێ سـەر کەتن و کامەرانی‌یە . کە ـ بکووژێتەوە : پیری‌یێکی پڕ بەختیاری‌یە .

ئاگری پەخش وبلاو ؛ سەودا (عشق)ی تازەوشیرینە. بلێسەی ـ لەخەوندا ؛ قسەی خراپە ،ئەگەر ـێکی سەخت وە لەشی هەر کەسێکی ترلە ـ بکەوێ ؛ رسی مەرگی لەپێشە . ـ لەش و ڕوو بسووتێنێ ؛ ڕەنج و زیان و نەخۆشی و کارەساتە . هەڵکردنی ـ ؛ ڕق و قینە ، شادمـانی و هێزیشە . پرِیشکی ـ ؛ سەوداو دڵداریێتی سەرزارە کیِیە ، سەودا سەریِیە کە کەخۆی سەرزەنشتی خۆی بکات . ـ لەماڵ بەربێ و لەش بسووتێنێ و نەترسێ : زیان و نەخۆش و کارەساتە . ـ ی زۆر : چارەنـووس و یارووداوانی تروسکەدارە . ـ ی سوور : پارێزگاری یە لەئاگر . ـ ی کەم : دڵنەوایی یە . ـ ی کوژاوەوە : ڕووشە و گێچەڵە لە مـاڵێ دا . ـ کەبەگرفـە و بلێسەو سـۆز بێ : تووشی نەخۆشی تاو لەرز دەبێ . ـ ێکی کە هـەڵکرێ : ( ئاشتی )یە . کەپادشـا هەڵیکا : هێزە . ـ ی بێ دوو کەڵ : ڕووناکی یەو مایەیە . هی دوو کەڵاوی : زۆر بێدادی و زیانە . ئاگری هـەمیشەیی : سەوداو ئەڤینی پایەدارە . هـەر کەسێکی لەئاگرێك باوێژرێ : بێدادی بەسەر دێت بـەڵام زوو ڕزگاری دەبێ و سەرکێشی بۆ دێت . کە ـ ئەوی نەسووتێنی : بەنابەدڵی زوو لەسەفەرێکی دەکات . ئاگر لەدوکانی هەر کەسێ بەربێ : ماڵی بەخۆڕایی دەڕوا . لەماڵێ بەربێ : شەڕو هەراو ناکۆکی ناو ماڵێیە . ـ کراسی هەر کەسێ بسـووتێنێ دوژمنایەتی لە گەڵ خزمان دەکا . ـ لەهەر شوێنێك بەربێ : لەوێدا گێچەڵ و شەڕو هەرا بەرپا دەبێ لە گەڵ نەخۆشی . ـ لەئاسمانی بەربێتەوە کەشار یاگەڕەك یامالێکی بسووتێنی : بەڵاو کارەسات تووشی وێ دێت . کە ـ لە ژێـر زەوی یەوە بۆ ئاسمان بـەرز بێتـەوە بەڵگەیە بۆ ئـــەوەی کەلەو شوێنەی درۆو بوختان و ڕق و قـین زۆر دەبێ .

ئاگر لەجێگایەك بەربێ‌و زیان نەدات ؛ سودو قازانج‌و سامانە . ـ لەئاسمان وەکوو بارانە بیارێ ؛ نیشانەی بەڵاو خوێنرێژی‌یە . چێشت لەسەر ئاگر لێنان ؛ کارو بار ێکهاتنە . ئاگر لەئاسمانەوە بێ‌و شێناوەردی بسووتێنێ ؛ لەو شوێنی مـەرگی کوتوبڕ زۆر دەبێ . ـ قوببە یاجێگایەکی بڵنـد بسووتێنێ پادشای ئەو وولاتی دەمرێ . دەشڵێن ـ لەهـەر شووێنێکی سەر هەڵدا ؛ لەوێ‌دا گەنج هەیە . خواردنی ئاگر ؛ خواردنی ماڵی نـا ڕەوایە . ئاگر لەزار دەربێت ؛ درۆو بوختانی لێ دێتە دەر . ئاگر لەکراسی هەر کەسێکی بسووتێنێ ؛ ڕەنج و ئازارە . دیتنی ـ ی بێ دوو کەڵ ؛ پەیدا بوونی هێزەو نێزیکی‌یە لەپادشایان . ئاگر کردنەوە بۆ ئەوەی کەخـۆی یایە کێکی تر خۆی گەرم بکاتەوە ؛ سوودو کەلکە . بەبێ هـوودە ئاگر هەڵکـردن ؛ شەڕو کێشەیەکی بێ هۆیە . ئاگر لەناو ئاگردان‌و یا تەندوورێ داکردنەوە بێ ئەوەی شێوی لەسـەر لێ بنرێ ؛ دوژمنایەتی نێو ماڵ‌و نێـو خزمانە . کەلەبەر ڕوونا کی ئاگری تۆ خەڵك ڕێگای خۆی بگرێ‌و بڕوا ؛ سوودت لێ دەبینن . چوونە ناو ئاگر ؛ سوودو کەلکە . پڕیشکی ئاگر ؛ قسەی خراپە ، کەپڕیشکی ئاگری بەمرۆی بکەوێ تووشی بەڵاو کێشە دێت ، وەهەر کووێ‌یەکی تر بکەوێ ؛ شەڕو کێشەی لێ پەیدا دەبێ .

ئاگر پەرستن ؛ باری زۆرداران بردنە و ئەرك‌و ڕەنـج کێشانە . کوڕنۆش بۆ ئاگر بردنە . ساهی چراو یاهی تەندووربێ ؛ خزمەتی ژنان دەکرێ . پەرستن‌و ماچ کردنی ئاگر ؛ لەئاکارانی نهێنی ئاگادار بوونە . لەناوئاگری داگەوزین ؛ تووشی بازرگانی هاتنەو ئەنجامیشـ بقەیە . کەزیانی بەلەش نەگات ؛ ساخی‌و خۆشی‌یە .

ئاگردان ؛ ئاورگ لەخـەوندا دیتن ؛ ژنێکە خزمـەتی ماڵی بکات .

کەئاگردانەکە ئاسن یا لەدار بێ : ژنەکە لەخزمانی ماڵەکەیە . کەـ
لەگڵ بێ : ژنەکە لەسەر کێشانە . ئاگردانەکە بەبێ ئاگر بێ : کۆشـە
گیری‌یە. کەئاگری تێدا بێ : شادمانی و خۆشی ناو خانەوادەیە .

ئاو ڕشێن : نزمی و هاتنە خوارو کەم کردنە .

ئاوریشم ( ئارمووش ) : (ـی سپی ) : بەهرەوروزیێکی زۆرو زەوەندە .
کە(ـی زەرد بێ ) : نەخۆشی‌یە . دیتنی ی کشتو بادراو لەهی‌خاو باشترە
کەئاوریشمی تـۆ بسووتێ و یاگوم بێ : زیانێکت پێ دەگات . کەـەکە
سپی‌و هی خۆت بێ : خێرو پیتو پیرۆزی‌یە . کەسەوز بێ : کاڵای هەمە
ڕەنگەت دەست دەکەوێ . دیتنی بەرگ و پۆشاکی ئاوریشمی: بۆپیاوان
ناپەسندو بۆ ئافرەتان باشە .

ئاوزەنگی : کەـ لە زەوی جوابەز بێ: نیشانەی‌مندان‌یانۆکەرە. کە بەزینەوە
بێ: منداڵە. کرمانیش دەڵێ : کەزێڕ بێ : منداڵێکی‌خۆ پەسندی دەبێ .
کەزێو بێ : منداڵەکەی بەماڵی گێتی لووت بڵند دەبێ .

ئاووس . کەخۆی بەئاووسی ببینی : کارو باری بەجێ‌یە ، پێشڕەوی خۆش
بەختی‌یە ، وەڵامی خۆش‌و بەهرەیە . کەژنەکە جحێڵ بێ : دەبی لەکارو
باری‌دا بەشێنە‌بی‌بێ . کەپیرێژن‌و یاسەرەژن بێ : توشی باداری دێت تەماشا
کردنی ـ کردن . نازو بەهرە زۆر دەبێ کەوولـس(حیوان)ێکی ببینێ
کەدەزێ : مەرگی یەکێکە لەدوژمنان .

ئارگیری (سقائی) : کەئاوی بەبێ مز (بەها) بدەی : چاکەی دەکەی
کەببینێ مەشکەیەکی پڕ کردووە لەئاوو بە کەسی نادات، ماڵداری‌دەکات
وخبەری لێ نابینێ .

ئاوڵـە : (خروێرکە) : نیشانەی زیانە . کە ـ لەسەر لەشت بێ : ماڵێکی
زۆرت دەست دەکەوێ هێندێکیش دەڵێن ا نیشانەی زیانی ماڵە .

ژنی دێنیو کوڕی دەبێ : کارو باری ڕاهی دەبێ ، لەترس و هەراس دڵنیا دەبێ . ئاوی ئەنبار ( سارداو ، سەرداو ) : بڤە ( خطر )یێکی گەورەیە

کەوتنە ئاوێ : بەد بەختیو ڕووشەو نەگبەتی یە .

ئاوی بارانە : هـەرزانی یە .

ئاوی پیرۆز : سەودا ، گراوی ، ئەڤینی یە .

ئاوی تکاو ( مقطر ) هەواو هەوەس پەرستی یە .

ئاوی چاڵو بیران کەیفخۆشی ناوخۆیی یە .

ئاوی حەوزێ : ڕقو قینو ئازارە ، ئاوی ڕوون : مزگێنیو بەهرەیە .

ئاوی ژیان : مەرگی ناکامە ، ئاوی سارد : ئارامیو ساخیو خۆشی یە .

ئاوی شلوێ : لەدەست چوونی پایەو ناخۆشیو مەرگی دۆستو خزمانە .

ئاوی کانی سەرکەوتنێکی گەورەیە .

ئاوی کەپۆ : منداڵە ـ هاتنە خوار : منداڵ بوونە ، لەخەمو قەرز ڕزگار بوونە ، کەنەخۆشیش بێ چاك ئەبێتەوە . ئاو لە کەپوی بەربێتەوە سەر لەشی : کوڕی دەبێ . ئاولە کەپوی بەربێتەوە سەر ئەرزی کچی دەبێ ئاو لە کەپوی بەربێتەوە سەر ژنەکەی : ئاووس دەبێو بەلاَن بەرداوێ .

ئاوی گەرم : ناخۆشیو ناکۆکی یە .

ئاوێنە ( ئەینۆك ) کەسێکی سەیری ـ ی زێوین بکا لەماڵ : لەپایەوڕێزی خۆی بێزاردەبێ . ئافرەت کەسەیری ئاوێنەی بکا کچی دەبێ . پیاوێکی کەلەخەویدا سەیری ـ بکا . ئەگەر ژنەکەی ئاوس بێ : کوڕی دەبێ . کوڕ سەیری ـ ی بکا برای دەبێ . کچ سەیری ـ ی بکا خوشکی دەبێ . میر سەیری ـ ی بکا : سەردەکەوێ . پیاوێکی ڕەبەن بی بێنی : ژنی دێنیو گەورە دەبێ . کە کچ سـەیر بکا : شووی دەکا بەبەختیاری .

کەئاوارەیەك ئاوێنەی دروست بکا تۆش سەیری کەی بەدیتنی دۆستێکی دوورە وولات شاد دەبی .

ئاوێنە : پایەو سامانە ، کەبیدەنێ پاهەیبێ ، بەقەد گەورەبی ئاوێنەکە پایەو سامانی دەست دە کەوێ ، کە ـ ی خۆی بدا بە کەسێکی‌تر ماڵ و سامانی خۆی لەلای یە کێکی دادەنێ .

ئاوێژتن ( هاوێژتن ) : بەرد ـ بۆ کەسێکی : قسەی ڕەق بەخەڵکی دەڵێ یاناوابێکی دە کا ، سووالەت ئاوێژتنیش هەر بەو جۆرەیە کەشە کر یابادام یاقەند ـ بۆ کەسێکی : ئەگەر کەسە کە ناسیاو بێ لەوەوە بەو ئەندازەیەی بەهرەی پێ دە گات ، کەناسیاویش نەبێ لەوەوە ئابڕووی پێ دە گات . کەئەوانە بەئازاڵ و ماڵاتاندا بدات : سامانە کەی وەبەر نەخوێندەواران دە کەوێت .

ئاویلکە گیاندانە . خۆ لەکاتی ـ دیتن‌دا : نیشانەی پیری‌یە ، دیتنی دایك یاباوك لەباری ـ دا : بەئاسانی میرات دەست کەوتنە . دیتنی کەسێك لە ـ دا : ڕزگاری‌یە لەگرفتاری . دیتنی یە کێکی نەناسراو لە ـ دا سوودو کەلکێکی چاوەڕووان نە کراوە .

ئاهۆ ( ئازار ) ( طاعون ) . دیتنی ـ : نیشانەی ڕووشەو گێچەڵ و کێشەیە کەلە لەشی خۆی‌دا ـ ی ببینێ : تووشی کارەسات دێت .

ئەژمار ( حساب ) فێر بوونی ـ : ڕێکی و پێکی کاروبارە و خۆش ڕەفتاری . ـ فێری خەڵکی کردن : خۆپەسندی‌و هەواو فێزو دەروون پیسی‌یە . کەیە کێك ببینێ یە کێکی تر ـ ی دە کا : لە گەڵ یە کێکی تر دە کەویە ناو مەینەتوئازارو کاروباری واناشیرن کەدەیێتە بنیشتی‌بندان

ئەژنۆ : گوزەرانە . کەبینی ئەژنۆی وی بەهێزو گەورەیـە : کاروباری
وی ڕێك‌و گوزەرانی خۆش دەبێ . کەبینی لەسەر ئەژنۆیان دەڕوا :
کاروبارو گوزەرانی ڕوو لە کورتی دە کەن .

ئەسپ بۆ بینەر : هەواو گەورەیی و بەختیاری‌یە . گۆشتی ـ خواردن :
میر ئەوی خۆش‌دەوێ‌و لەخۆی نزیك دەخاتەوە . کەلەپشتی کەسێکی‌یەوە
سوواری ـ ی بێ . دەبێتە گوێدێرو فەرمانبەری وی . کەکلکی
ئەسپە کە ئەستوورو درێژ بێ : پایەی بەرزو نۆ کەری زۆر دەبێ. کلکی
بڕابێ : نۆ کەری نابێ . کەئەسپێکی زۆر بەدەورەی ماڵێ یا کووچەی
تۆدا بگەڕێن : لەو شوێنەی‌دا بارانەو لافاو دەبێ . کەـ یێکی نەناسراو
لەشووێنێکی بێتە دەرێ : بە کێك لە گەورە کانی ئەو شووێنە دەمرێ .
سوواری ـ ی ڕەوان بێ : ژنێکی دەوڵەمەندبێنێ وەیا لە گەل ژنێکی
دەوڵەمەند ئاشنایـەتی پەیدا دەکاو ســوودی لێ دەبینێ . کەئەســپە کە
سەرەنگرێ بێ‌و زوو ڕاســت بێتەوە : لەوانەیـە کاروباری گرێی تێ
کەوێ بەلاَن چاك دەبێتەوە . کە ـ گووێ بڕابێ : نۆ کەرو ژێردەستی
لێ دوور دە کەونەوەو سەر کێشی دە کەن . ـ یێکی بێ کلك بکرێ و
سواری بێ : ژنێکی ناخانەدان دەخووازێ . کەبـەسوواری ـ ی بچێ‌ە
هەواو لەوێڕابێ‌یەوە خووارێ : بەدەستی پادشا لەناو دەچێ . کەئەسپ
لەقەلە کەسێکی بداو پایـکەزێ : خێزانە کەی بەدزی ناموسی خـۆی
دەفرۆشێ . کە ـ پامایێی وی بزر بێ یا لێی بدزرێ : لەوانەیــــە
خێزانە کەی بەرەلاَ بکرێ یابمرێ . سواری ئەسپ بوون پاشەو پێش :
زیانە . کە ـ سەر کێش بێ : هۆلمانی ( نفس)ی سەر کێشە . کەـ گوێدێر
وڕامی بێ : گوێدێـر دەبێ کەسێکی کەلەخەونی‌دا ئەسپی خـۆی
بفرۆشێ : پایەو گەورەیی لێ کەم و ژنـە کەشی لێ جوێ دەبێتەوە .

ئەسپ کەکلکی بڕابێ : بێ نۆ کەریی‌یە . کەپەلیکی ـ کە کەم و کوڕی هەبێ : کەم و کووڕی لەئابـڕوو ڕێزی وی ڕوو دەدا . بەسواری ـ ی باڵدار بەسەر هەوادا فڕین : نیشانەی بەهرەو گەورەیی‌یە . کەسواری ـی ئەبلەق ببێ : شایەدی نارەوای لەسەر دەدرێ . سـواری ـی رەش خۆشی وسامانە . سـواری ـی کوێت : لەگەورانەوە بەهرەیە . سواری ـ ی زەرد : نەخۆشی بەدووا‌وەیە .

سواری ـ ی ڕووت بی : ڕووشە و تاوانی پتر دەبێ . کەـ کە هی خـۆی نەبی ئێخەیَ خاوندی دەگرێتەوە ، کەسواری ـ بی بەچۆ کەوە : گەورەیی وزاڵ بونە بەسەر دوژمناندا. لەـ دابەزین لەئابڕوو گەورەیی کەوتنە . کەـ لەگەل وی بدوێ کارێکی سەرسوورِ هێنەری لێ ڕوو دەدا . کەـی وی خۆی بکەوزێنی : ماڵ و دەولەتی دەست دەکەوێ کەـ یێك ڕوو لەماڵی ئێوە یا کۆلانی ئێوە بکات پیاوێکی گەورە دێتە ماڵی ئێوە . کەـ لەماڵی ئێوە یالە کۆلانی ئێـوە بچێتە دەرێ : یەکێکی گەورە لـەو شوێنە دەڕوا یا دەمرێ حیلە حیلی ئەسپ : مـز گێنی خۆشـە . گۆشتی ـ خـواردن : بەگەوران نزیك بوونەوەیە . سواری ـ بوون : دەولەمەندی و سامانە .

ـ کەبەئێرغە بڕوات سەر کەوتنێکی گرنگە . ـ لەتەوێلەدا ببینێ : بارەی لێ گوم دەبێ . ـ بەبەستراوەیی : کێشەیە کە لەنێوانی دۆستان دا . ـ سپی بەختەوەری‌یە . ـی سپی و ڕەش : کەیف خۆشیە کی زۆرە . کەسێکی ـ بکوژێ مەرگی خۆشەویستیە کیە . ـهەلبێ : ساخی و خـۆشیت لەدەست دەچێ . ـ بەزینەوە سەفەرێکە ئەنجامێکی باشی هەیە . بەبێ زین سواری ـ بوون زاتداری و ئازایی‌یە .

ئەسپەناخ : دیتنی نیـکەرانی‌یە ، خەمە . خواردنی ـ زیانـە و کەم و کوڕی سامانە . کەبە گۆشت و ڕۆنەوە لێ‌نرابێ‌و بیخوا : خێروسوودو کەلکە

ئەسپۆن : خەفەتە و خواردنیشی نەخۆشی‌یە .

ئەسپێ . دیتنی ـ : ماڵ و منداڵی‌یە کەنانی وی دەخۆن . کەبینێ لەشی پڕ بووە لە ـ : ماڵ و سامانە . کوشتنی ـ بەسەر دوژمنان‌دا زاڵ بوونە .
کەبینێ ـ زۆر ئەویان دەگەزت : دەکەوێتە بەر زارو زمانانەوە .

ئەستێرە : لەخەون دا گەورەو سەرۆکە . ڕۆژ ( خۆر ) : میرو خونکارە . مانگ وەزیرە . کەـ ی کەیوان ( زحل ) ببینی : تووشی کاروبارێکی وادێ لەگەڵ جوتبەندان‌و ماڵو بەهرەی لەوان دەست دەکەوێت . کە هۆرمز (مشتری) ببینی : کاری بەپیاوێکی ئاشتی خوازو دڵو دەروون پاك دەبێ. کەبارام |مریخی| ببینێ : کاری بەخوێنخۆرێکی بەد کرداردەبێ کەناهید (زهره) ی ببینێ : بەندیواری بەخانوونان‌و کارە کەرو ژنانی پڕشکۆیەیدا دەکا خێرو خۆشی‌و سوودیان لێ‌دەبینێ کەتیر(عطارد)ی ببینێ : پیاوێـکی زانایە . دیتنی هەر ئەستێرەیەك : گەورەیی‌و پایەیە .
کەـ ی ڕەوشەن بکەوێتە سەر هەرشوێنێکی زەوی و گومبێ : زانایەك لەوجێگایەی لەناو دەچێ . دیتنی ئەستێران لەکاتی گەڕاندا : کێشەو هەرا دەکەوێتە نێوانی گەورانەوە . کەـی بەدەستی بگرێ : کوڕێکی دەبێ‌و لەپادشای نزیك دەکەوێتەوە ، ئەگەر لەماڵی خۆیدا ـ ی ببینێ: منداڵی زۆر دەبێ . کەئەستێران بەئاسمان دا بڵاو بووبنەوە : ناکۆکی دەکەوێتەوە نێوانی پادشا و گەورانـەوە و کارو باریان گەند دەبێ . کە ببینێ ـ ی بەختیاری کۆبوونەوە : کاروباریان باش دەبێ . کەئەستێران لەماڵی‌وی بێنە دەرێ : مناڵەکانی لەپادشاو سەرۆکان نزیك دەکەونەوە

کەبیێنێ ـ ان لەگوویەندێر بوون بەبێتە پادشا . کەبیێنێ ـ ان دەتاخۆتن .
پادشای ئەو کاتی دان بەر وەردە بێ . کە ـ ان پێکەوە شەڕێ بکەن :
لە و هەرێمی دا شەڕو کێشە روودە دا . ـ ی بگری و لە ناو قوڵی خۆی
بنێ : ماڵی دەست دە کەوێ . جابردەڵێ: کەبیێنێ ـ ێک کەو تەتەنیشتی
وی : منداڵێکی خۆشەویستی دەبێ . کە ـ ی بەخت لە ماڵی خۆیدا
ببێنێ منداڵی زۆر دەبێ .      کە ـ ی بێ کلك و باڵ
ببێنێ تووشی خەمو خەفەتێت و بەلاش بە سەری دازاڵ دەبێ سوتانو
ڕاکشانی ـ : مەرگ و کارەسات و نەخۆشی بەیە . ـ ی کلك داریش :
کێشە و ڕووشە یە روو لە تۆ دەکات . ـ ی تروسکە دار : بە سەر
چوونی ترس و هەراسە . ـ ی هەوری‌تاریك : باری ناپایە دارو بڕیار
نەدان و ماناى پایە دارى یە .
ئەستێرەناس : کەبیێتە ـ : لە گەوران نزیك دە کەوێتەوەودرۆیان زۆردە کات
ـ ی : لە هەموو چتێکی وورد بەوە ، بێ ناو ونیشان بژی تاپایەی خۆت
بۆ بپارێزرێ .

ئەسکەنجەبین : کە شیرین بێ و بخورێ : ماڵوساماتێکی زۆر وڕەوایە کە بە
ئاسانی دەست دە کەوێ . کە ترش بێ : خەم خەفەتە . کرمانی دەڵێ کە
نەخۆش بیخوا وشیرین بێ چاك دەبێتەوە ، کەترش بێ : نەخۆشیە کەی
درێژەی دە کێشێ

ئەشکەوت کەبیێنێ چۆتە ناو ـ ەوە تێیدا مایەوە : دەمرێ ، کەبینێ چۆتە
ناو ـ و هاتەدەرێ : تووشی کارێکی سەخت دێ . کەبچێتە ناو ـ ێکی
ڕووناکەوە : دەخرێتە ناو زیندانەوە . کە ـ تەنگو تاریك بی : دەمرێ

ئەنباری گەنم کەپڕ بێ : بازرگانی و سـەودایەکی سوودمەندە . کەبەتاڵ
بێ ؛ شەرمەزاری و بەد بەختی یە

ئەندام . کەلەخەوندا ـ زۆر بێ : خزم و کەس زۆر دەبێ . وەئەویش لەشوێنی
خۆی دەمێنێ . کەببینێ ـ ی براوەو یاهەڵوەریوە کوچ (سفر) دەکا،
خزمانیشی پەرِاگەندەدەبن . کەخۆی ئەندامی خۆی ببڕێو پەرتی بکاو فڕێ
بدات : ماڵو منداڵو خزمانی خۆی بەوولاتاندا پەرِاگەندە دەکات .
کە گۆشتی ـ ی لی بکاتەوەو بیدات بەباڵندان ؛ ماڵ بەخەڵکی بەخشینە
کە ـ ی وی لە گەڵ . وی قسە بکا ئابرووی دەچی لە نێو خەڵکی دا
کە ـ یکی بە ڕێگایەدا بڕوات : کارێکی دەکات کە لێی پشت قایم دەبێ
ئەندامی شەرم(عورت)لەخەونی دا کەئەندامی شەرمی ئاشکرابێ بەچەشنێکی .
وا کەخەڵك بی بینی : ڕازی ئاشکرا دەبێ ، کە دایپۆشی : بەخشان دەبێ
کەئەندامی شەرمی وی ڕووت بێ بەو مەرجەی کە کەس نەی بینێ زوو
لە نەخۆشی چاك دەبێتەوە ، کەقەرز دار بێ قەرزەکەی بۆدە درێتەوە ؛
کەترسی هەبی دڵنیا دەبێ .

ئەنگوستیلە دیتنی نەخش و نیگاری ـ : خێرو چاکەی بێ دەکات .
کەپادشا بیداتێ : وولاتێکی دە داتێ یا لە وولاتی پادشـا دا خرابەی پی
دەکات یابەخزمانی . گوم بوونی ـ یادزرانی : کێشە و گۆنگەل دەکەو-
ێتە کارو باری وی یەوە کە ـ بشکێو تەنها نەقیمە کەی مایەوە : کەورە-
بیوجێگا : ئابرووی دەمێنی کەنەقیمە کەی بشکێ . هەمووی لەناو دەچێ
کە ـ کەی ببەخشێ یابیفرۆشێ : هەرچی هەیەتی دەیفرۆشێ یادەیبەخشێ

ئەنگوستیلەی زێو : چتی پەسندەو مالّی ڕەوایە . ـ ی زێڕ : چتی نارِەوایە
— ئـاسن لەقامك دابوون : هەرچی هەیەتی کەم و سووك دەبێ .
— مس لەقامك دابوون : سوود لەناکەسان دەستکەوتنە .
— شووشە لەقامـك دابوون . قازانجە . کە ـ ی بەسپاردە ( أمانـەت ) یابەخشین پیدا بە کەسێکی و ئـەویش وەری نەگرێ : ژنی لـەری دەخوازی و ئەویش نایـداتێ . کە ـ ی خـۆی بشکێنێ : ناکۆکی دەکەوێتە نێوانی وی و مندالّەکانیەوە .
ئەنگوستیلەی دروومانێ : دیدارەو بەیەکتر گەیشتنی دلّدارانە .
ئـەیار : بڕوانـە پێوانە .
اعـلان بڕوانە ئاگانامە .
اعلانی شەڕ : بڕوانە جاری شەڕ .
ئۆتۆمۆبیلی بارکێش . دیتنی ـ دەست و برد و کاروبارێکە بەئەنجام بگا .

ئێستر . ـ کە گووێدێر نەبێ : مرۆی بەدخوە . کەڕام بێ : باشە . کەسواری بێ و نەزانێ هی کێیە . دەچێتە کۆچێ ، کەهی خۆی بێ سوودی لەو کۆچە دەستدە کەوێ . کەبینێ زین ، کورتان ، کەژاوە یاصندوقی لە سەر پشتی دانراوە . ژنە کەی دەبێتە نەزۆك بەو مەرجە کە ـە کە هی خۆی بێ . کەسوواری ـ یێکی ماچەو ڕەش و بالاّ بـەرز بێ ژنێکی دێنێ کەخاوەنـەی ڕێز و سەنگین و گران بێ . کە ـە کە سپی بێ : ئەو ژنەی کەئەو دەیەوێ جوان دەبێ . کەسوور بێ : کەیفچی و خۆش ڕاهووێر دەبێ . کەزەرد با سوور هول بێ : ژنە کەی ڕەنـگ زەردو نەخۆش دەبێ . کەئێستری مێ بکڕێ : داخـوازی ژن دەکا . کە ـ بیفرۆشێ کەنێزە کی دەفرۆشی . سوواری ئێستری نێر بوون : تەمەن درێژی و ئاوات پێك هاتنە . کە ـ بەدووی مرۆیدا غار بدات : تووشی خـەم و خەفەتێکی دێ .

ئێستر . ـ ی بکرِی شیوەن بکا ; ماڵت لەلایەن ژنانەوە زۆر پێ دە گا .
كە ـ قسەی کردبێ : كارێكی سەیری لێ ڕوو دەدا کەخەڵكی سەریان سورِ دەمێنی . کوشتنی ـ ; ماڵێ دەستکەوتنە . كە ـ بمرێ یاوون بێ : ژنیا کەنیزە کە کەی لێ دور دە کەوێتەوە گۆشتی ـ ; ماڵ ، نەخۆشیە شیری ـ خواردن : ترس و ڕەنج و سەختی یە . دیتنی جاش ئێستر : سوودو قازانجە . کەئێستربحیلێنی : سامانێکی زۆرو زەوەندە لەلایەن ژنانەوە . کەئێستری بکوژێ : ماڵ و سامان دەستکەوتنە . گۆشت و کەولیش ، ماڵە .
ئێسك : دیتنی ـ ماڵێکە کەمرۆی پێ بژی . ـ ی بە گۆشت ؛ خێر و ماڵ دەستکەوتنە . ـ کە گۆشتی پێوە نەبێ ؛ کەمی سوود پێ دە گا .
كە ـ ی بەەی بەیە کێکی تـر ؛ خێری پێ دە گەیەنی ـ ی شکاو هەڵبەستنەوە ؛ نیشانەی گەورەیی و کاری چاکە .
ئێش ، ئێشان . ابن سیرین دەڵێ : کەلەخەون دا هەموو ئەندامەکانی بێشی . ماڵێكی کەهەیـەتی لە ناو دەچێ . کەسـەری بێشێ ؛ دیارە تاوان و گوناهێـكی زۆری کردووە ، پێویستە پەشیـان بێتەوەو خێرێ بکات .
ئێشانی نێو چاوان : خەم و خەفەتە . کەچاوی بێشی و یە کێك دەرمانی بۆ تێ بکا : ئەو کەسە دەبێتە ڕابەرێکی بەڕاستی وی کە گوێی بێشی قسەی ناخۆش و جنێوی گووێ لێ دەبێ . کە کەپـۆی بێشی یا کەم و کووری لەزمانی دایە ؛ لە گەورانەوە زیانی پێ دە گات و قسەی نارەوا و ناڕاستی لێ ڕوو دەدا کەپێی بێشیو هەلاّمـێ لەمافی کەسێکیدا پێ گیری دە کاو ئازاری ژێر دەستان دە کا . کەزاری بێشی ؛ لەخزمانەوە خەفەتی پێ دە گات .
ئینجیل . خوێندنی ـ ؛ سوودی لەفەلانەوە پێ دە گا ، کەلەبەر ـ بخوێنی دەبێتە دۆستی فـەلان .

با . ـ ی سەختوتووش : ترسو لەرز تووشی دانیشتوانی ئەوشوێنی دێ . کەبا هێندەبەهێز بێت داران لەرِیشەهەڵکەنێ ئاهۆ ئازارو طاعونو سوریژە ورِشانەوەوئیتر تووشیدانیشتوانی ئەوشوێنی دێ . رِەشەبا و نەخۆشیانی سارده . ـ ی ساردی لەسەرەخۆ : نەخۆشیانی ئالۆزە بەڵان هی هێمن . نیشانەی کارو باری چاك و لەش ساخێتی خەڵکی‌یە . کە ـ لێرەوە بۆ ئەوێت بەرێ : سەفەری دوورت لەبەرەو تووشی پایەو گەورەیی دێ‌یت کە ـ تۆزاوی‌و تاریك بێ : ترس و نیگەرانی دانیشتوانی وێ‌یە . کە بایەکی سەخت مرۆی بۆ هەوا ببات : ئاکام ( اجل ) نزیکە کەبا لە ئاسمانەوە مرۆی بهێنێتەوە سەرزەوی : نەخۆش دەبێ ، بەڵان چاك دەبێتەوە . سوواری بای بوون : بەرەو گەورەیی‌و فەرمانرِەوایی چونە کەبای رِۆژئاوا نەرم بێ : ماڵ و بەهرە رِوو لەوخاکێ دەکات . کەبای باکوورِ بەنەرمی بێت : خۆشی‌و ئاسوودەیی ئەو وولاتی‌یە . پێچەوانەی ئەوان : باش نیە . کەدەنگی بابیبستری : خێرو خۆشی‌لەلایەن میری‌یەوە رِوو لەو وولاتی دەکا .

بادام : دیتنی ـ : لەش‌ساخێتیو زانیاری‌و بەهرەیەکی‌زۆرە . کۆ کردنەوەی‌ـ هێندەی وی ماڵ و بەهرە و رِۆزی‌یە بەئەرك و رِەنج دەستدە کەوێ بادامێکی کەداویانەتێ یاهەیەتی کەبەتێکولەوە بێ : بەسەختی و رِەنج ماڵی لەچروو کێکی دەستدە کەوێ کەلەمەغزی بادامی تاڵ رِۆنی بێنێتە دەر : هێندەی وی سوود لەچروو کێکی دەست دە کەوێ .

باران . ـ ی دەزوو یا گوریس : کۆچ ( سفر ) ە بەپێی درێژی و کورتی وان ئەویش درێژو کورت دەبێ . کەبۆ درومانی با بدات بۆ بەرژەوەندێکی کار دەکات و یا بۆ دادرکاندنی هۆڵەنی خۆی رەنج دە کێشێ .

بادە : بڕوانە پیاڵە .

بادەوە ( کۆلارەی قاقەزو ئیتر ) . دیتنی - : کەوتن و پەرێشانیو بێچارەیی.یە

بار . -ێکی سووك لەسەر پشت ببینرێ : بایی وی سوودی پێدەگا ، بەڵان کەگران بێ : تووشی گوناه و کاروباری نارەوا دێت .

بارانە : بەزەیی و پیت و پیرۆزی.یە کەگشتی بێ ، لەکاتێکا ببینرێ کەخەڵك داوایدەکەن زۆر باشترەبارانەی سەخت کەتەنهالەسەرماڵێ یا کۆلانێکی بباری : نیشانەی ڕەنج و نەخۆشی.یە بۆ دانیشتوانی ئەوێ . بارانەی لە سەرەخۆ : نیشانەی خێر و سوودی دانیشتوانی ئەو جێگایەیە کە لێی دەبارێ کەبینرا - لەسەرەتای مانگ یاسالێ دا دەبارێ : لەو سالی یا لەومانگی.دا سوودو بەهرەو هەرزانی دەبێ . کە- سەختو شلوێ بێ : نەخۆشیەکی مرۆمرێنە . ابن‌سیرین دەڵێ بارانەی سەختو بێوەخت لەهەر شوێنێکی دا ببینرێ ببارێ لەو خاکی.دا لەلایەن لەشکریانەوە ڕەنج و ئازار ڕوو دەدات . کەبارانەبەسەر وی.دا باری : نەچێتەکۆچێ و بەسوودو قازانجەوە دەگەڕێتەوە کە- وەکوو لافاوببارێ مەرگی کوتوپڕ ڕوو دەدات . کەلەهەر تنۆکە بارانەیەکی ئازارەیەك هـات : پایەو ڕێزی زۆر دەبێ . کە- یەکی سەخت و گەورە ببارێ و چەند جۆگەیەکی لەبەر بڕواو چ زیان بەخەون دیتوو نەگەیەنێ لەشەڕی مـیری ڕزگاری دەبێ ئاوی بارانە بخواتەوە کەڕوون بێ : سوودی پێ دەگا ، کەلێل و شلوێ بێ نەخۆشی و ڕەنجە .

بارمتە ابن‌سیرین دەڵێ کەببینێ لەجێگایەکی.دا خۆی لە- داناوە : لـە گوناه ترسانە کەماڵ و منداڵی لە- دانابێ زۆرو بێـدادی لەگەڵ دەکرێت کەیە کیان خۆی بە- لالای وی دانابێ : ئـەو کەسە ئاتاجی وی دەبێ .

باز کەبیگری یابیدرێتێ کەبازە کە ڕامی وی بێو لەسەردەستی هەڵنیشێ: نیشانەی گەورەیی وڕێزو پایەیە کی بەرزە . کە- یکی سپی لەسەردەستی هەڵنیشێ ؛ لەلایەن گەورەو میرانەوە فەدرو نرخی دەستدە کەوێ . کە -ی لەدەستی بکەوێو بمرێ : لەڕێز دە کەوێو تووشی بێچارەیی دێ کە-ی سپی دەستکەوێ و هی پیاوێکی پادشای بێ ؛ لەلایەن پادشاوە ڕێز و قەدری دەستدە کەوێ . کەیە کێکی تربازی بدات بەوی ؛ منالێکی جوانو بەختەوەری دەبێ . کە- لەسەر بانی وی بنیشێ لەگەڵ گەورە- یەکی ئاشنایەتی پەیدا دەکاو سوودیشی لێ دەبینێ . کەباز هەڵبێو بچێتە ناو ماڵی وەیا لەناو داوێنی ژنێکیدا خۆی بشارێتەوە ؛ ئەو منداڵێکی جوانی دەبێ . کە-ە کە زەنگوڵەی زێوین یازێڕینی لەپێدا بێ ؛ ژنەکە کچی دەبێ . کەسێکی بازێکی دەستکەوێ و بیکوژێ : کەمـ ووچە خۆر بێ لێ دە کەوێ ، کەوانەبێ لەلایـەن خانەوادەوە تووشی ڕەنجو ئازار دێت . پادشایەك بازی لەسەر دەستی بفڕێ و نەیەتەوە : وولاتی لەدەست دەچێ . کەبازە کەبکەڕێتەوە : دەیێتە خاوەندی وولاتو توانا

بازدان : کەسێکی ببینێ بازی دارە : لەبارێکەوە دە کەوێتە بارێکی تر . کە مـاوەی بازدانە کە دوور بێ : کۆچێکی دوور دە کا . کەبەهـۆی دار دەستێکەوە باز بـدات : بەپشتیوانی پیاوێکی گەورە تێ دە کۆشێ و بەئاوات دە گا . کەلەسەر دیوارێکی یەوە بازداتە سەر پشتی ئێسترێکی: دەمرێ . کەبازداتە سەربانێکی وا کەلەژێـر پێیدا ڕۆچێ و نەمرێ ژنە کەی لێ جووێ دەبێتەوە و بەڵان دێتەوە لای کە لەخانوویێکی نەناسراوەوە بۆ خانویێکی تری نەناسراو بازدا : دەمرێ . کەهەڵبازێتە ناو هەواو لەوێ باڵندەیـەکی بگرێ : واز لە ژنە کەی خۆی دێنێ و ژنێکی تر دێنێ .

بازنە : کەئافرەت ـی ببینێ کەزێرِ بێ : لەدەستە خوشكو خەڵکی ترخەمو خەفەتی پێدەگا کەزێو بێ لەدەستیدا : کچ خۆی یابرازاو خوشکە زای خۆی بەشوودەدات ، ماڵو خشڵ و کاڵای رِازاندنەوەیــە . کەزێو یائاسن بێ : لەبرای هێــز و تــوانای دەستدە کەوێ . کەبشکێ یا وون بێ بەپێچەوانەیە .

ـ بۆ پیاوان خەمەو بۆ ژنان مێردە . کەیەکێك ـی بدا بەوی : منداڵ یا برایەکی دەبێ . مغربی دەڵێ : کەهەردوو دەستی ـ ی تێدابێ : ماڵ و بەهرەی بەرِەنج دەستدە کەوێ

باسك . ابن سیرین دەڵێ : لەخەوندا دیتنی ـ : برا ، منداڵ ، دۆستی بابەخدارە کەببینێ ـی بەهێزە : لەوسێ یانە سوودو هێزی دەست دە کەوێ . کە وانەبێ‌وانیە . کەباسکی بکەوێ یاشکابێ یا بەلێکی ببرِێ : برایاهاورِێ یەکی وی دەمرێ یادوور دە کەوێتەوە . ئەگەر ـی خۆی ساخو گەورە ببینێ : لەدۆستێ و برادەران سوود و رِێز دەبینێ . کەتوو کی باسکی بتاشێ قەرزی بۆ دەدرێتەوە و بێ خەم دەبێ .

باسك بەند کە ـ ی زێرِینی لەباسکی خۆیدا ببینێ : سەخڵەتی لەخەڵکی پێدەگات . کە ـ ی زێو لەقۆڵی خۆیدا ببینێ : کچی خۆی یا کچی‌برای بەشوو دەدات . ئەو خەونە کەئافرەتێك بی‌بینێ : ماڵو بەهرەو خشڵو سامانە کەببینێ ـی زیوبێ یا ئاسنینی هەبە هێز و یارمەتی لەلایەن برایەوە دەست دە کەوێ کە ـ ە کەی بشکێ : بەپێچەوانەیە .

باشوو ابن‌سیرین دەڵێ : کە ـ ببینێ گوێدێر بێو بانگی کاتو بێتە لای خاوەنەکەی بابەی‌دەستدە کەوێ . کەـی‌لەدەستی‌بفرِی‌ورِستە کەی‌بەدەستی

بهێنێتەوە ، گەورەیی لەدەست دەچێ . کەهەر کەسێکی لەهەر جێنێکی ببینێ کەباشووە کەی مردوە یابمرێ : زیانو نەگبەتیو کارەسات دەبێ.

باغ : ژنە . کەببینێ باخی ئاودەدا ، لەگەلْ خێزانی دەست تێکەڵاو دەکا

کەببینێ لەناو ــ یدا گولْو رِیحانەی دەچێنێ : مندالێکی باشی دەبێ هولوو و خۆخ چەقاندن ، مندالێکی وای دەبێ کەزووفێری هونەر و زانست دەبێ . کەلەباخی ویدارِیحانە رِواو هەلچوو بۆنی گەیشتە دەماغی : مندالێکی ئازاو زاناو ژیری دەبێ . بۆنی رِیحانە ، مندالە . کەلەپایزێ لەناو باخێکی نەناسراودا ببینێ خەزەلوەرانە ، خەم و خەفەتی پێدەگا

کەببینێ باخی هەیە یا کەسێکی تر داویەتیو میوەی باخەکەی دەخوا : ژنێکی مالدار دەخوازێ و مالەکەی دەخــوات . کەلەباخی دا بــەری داران لەداری بلندەوە بەسەریدا بکەوێ : لەگەلْ پیاوێکیدەولەمەند دوژمنایەتی لێ رِوو دەدا و بەسەریدا چیرە دەبێ کەلەناو ــ یدا لەسەر داری نوستبێ : مندالی زۆر دەبێ. لەکاتی بەهار یاهاوینیدا باخیببینێ کەگەشەو پــرِ میووەو گولْ و رِیحانەبێ وئاوی رِەوانی تێدا پەنگی خواردبێتەوە : مەرگی وی مــەردانەیە . باخ کەلەهاوینێ دا سەوزو پرِ میوە بێ لافاو یاچۆمێك رِووی تێکاو لەرِیشەی دەرێنێ : پادشای ئــەو وولاتی ترسی مردنی هەیە یالێ دەکەوێ . کەئاگر ـ بسووتێنێمەرگی کوتو پرِ تووشی پادشای دێت . کەلەناوباخیدا ووشترەوانی لێ ببینێ : پادشای ئەو وولاتی بەسەر دوژمناندا زالْ دەبێ . کەلەناو ــ یدا مەرِان ببینێ : مالْ و بەهرەی لەپادشای دەست دەکەوێ و ســام و شکۆیەکی شاهانەی دەبێ کەلەناو باخیدا پەرِندان‌ببینێ : لەشکری پادشا لەسەر بەیمانی خۆیان دەبن بەلاَن جێگای باوەرِ نین .

میوە لەناو باخیدا کۆ کردنەوەو بردنەوە ماڵێ : هێندەی وی خـێرو سوودی لەپادشا دەست دە کەوێ بەڵان بەرەنجو تەر کەوە. ـ بەسەوزی دیتن : چاك و کارسازبوونی کارە .

کەبەوشکی بیو میوەی ببینێ لەبەهار یاهاو ینێدا زۆرو یێدادیوجەورە ـ لەنووێوە دامەزراندنو نەمام چەقاندن کەخۆبکرێو میوەی لێ پـەیدا ببێ ژنێکی دەولەمەند دینی ، ماڵو سامانێکی زۆرو گەلێکی منداڵ دەبێ . لەناو ـ یدا لە کاتی خۆیدا ترێ دیتن : ماڵ و پایەیە . لەباخێکی نەناسراودا گەڵا بوەرێ : خەفەتە .

باقلە : بڕوانە ( پاقلە ) .

باڵ ( گەز ) . هەرچێك بەباڵ یا گەز بپیورێت : سوودو کەلکە . کە گوریس یا کاڵای خوری بێ بپێورێ لە کۆ چداهێنەوەی وی ماڵی نارەوای دەستدە کەوێ باڵاپۆش . ابن سیرین بەژنی داناوە . کە ـ ی فراوانو خاوێنی هەبێ : ژنی وی خاوەندی بیرو باوەڕو ڕەووشتی باشە کەبەپێچەوانەبێ : ژنە کەی بەدخو و ناساز گارە . ـ کەبدڕێ یاپیسـووتێنی : ژنە کەی لێ جـووێ دەبێتەوە. ـ ی کۆنو چڵکن : خەفەتە. ـ ی زستانی لەبەر خۆیدابیبینێ : ماشترە باڵەباڵ . ـ ی مەڕ خۆشەویستێکت خەفەت بارە ! یارمەتی بدە .

باڵندە ابن سیرین دەڵێ : لەهەر شوێنێکیدا ـ ی زۆر ببینرێ کەبانگ وجیکە جیکێ بکەن : کارەساتێکی خراپ ڕوو دەدات . کەهێلکەی هەبێ : منداڵی دەبێ ابراهیم دەڵێ : کەببینێ ـ لە گەڵ وی دەدوێ : کاروباری بەرز دەبێتەوە .

ـ پارچە گۆشتێکی لەلەشی وی بفرێنی : ماڵی بەزۆر لێ دەستێنرێ کە- لەدەستی ویدا بەرێ : مایەی خەفەتە . کە گۆشت لەلەشی خۆی بکاتەوە بیداپەو ماڵی خۆی دەدا بەخەڵکی کەچەند ـ یـە کی هەمە جوورە

لەشارێکی کۆبینەوە : لەشکری بێگانە دێتە ئەوێ . خوێنی ـ خواردن زیانی ماڵە . لەخەوندا دیتنی ـ : کەیف خۆشی‌یە بەهەموو چەشنێکی بۆلێك ـ : کۆچی دوارِۆژە . دیتنی ـ لەسەر تێلی برووسکە(تەلگراف) وەلامی نوێ پەیدا دەبێت . کەبەشەو ـ ببینرێ : وەلامی‌مەرگە . کەـی بکەیە نیشانە : دڵدارێتی جوانو زۆرو زەوەندی‌منداڵە . کە ـ ی هەبێ و لەدەستی بفرێ و دووبارە بێتەوە سەردەستی وی : نیازو ئاتاجی وی پێك دێ بەلام کەنەیەتەوە ماڵی لەکیس دەچێ .

بالۆنی هەوایی : کەلەکەلەو رەنگێکی گەورە رژتنە ، پایەو جێگا پەرستی وقرمێکی زۆرە . چـوونە سەر ـ : خـەم و پەرۆشە . لەبالۆن کەوتنە خوارەوە   ناوو ناوبانگ لەدەستدانە .

بالیف   بروانە سەنیر ( سەرین ) .

بان : کەببینێ لەسـەر بانێکی نەناسراوە : تووشی ژنێکی بەرێز و بەقـەدر وخۆشەویست دێ   کە ـە کە ناسراو بێ   تووشی گەورەیی و ئابروو مـەندی دێو کاروباری رێك دەکەوێ   جابـری مغربی دەڵێ : کەلە سەربانی پادشا بێ : گەورەیی و پایەو بەهرەیە . کەلە ـ بکەوێتە خوار: کەنەفتی و خـەفەتە .

بانك : بەخت و کامرانیەکی بەدە ، پارە بزر کردنە ( بوونە خاوەن ـ ) پارێزگارێکی پرسوودو لاگرێکی بەگیان و دڵت دەبێ .

بانگ : کەلەشوێنێکی دوورەوە ـ بکرێو وەلامی بداتەوە   زوودەمرێ کە وەلامی نەداتەوە : زوو نامرێ . کرمانی دەڵێ   شادمانی‌یە .

باوەش : ئەگەر منداڵێکی لەباوەش بگرێ : منداڵی خۆش دەوێ .
ئەگەر ژنێکی لەباوەش بگرێ : خێرو بەهرەیە .

باوەش : ئەگەر خۆی لە ـ بکیرێ : نیکەرانیو سوو کیو دڵ پیسی‌یە .
کەشێرێکی لە ـ بگرێ . لەگەڵ دوژمن ئاشت دەبێتەوە .
یەکێکی نەناسراو لەباوەش گرتن : کڕین و فرۆشتنەوەیە .
لە ـ کردنی پێشەر گەیەکی : بەخت و بەختەوەری‌یە .

باوەش و سینگ . ئەنجامی بەپەلە پێك گەیشتن و بەیەکتر گەیشتنە .

باوڵی : کێشەو پیلەی نـاو خانەوادەیـە . دروست کردنی ـ : کۆ چێکی لەناکاوە . هەڵگرتنی ـ : سەر کەوتنە لەپلانو کەلکەڵاندا خۆشی‌یە .

باینجان : خواردنی ـ لەکاتو بێ کاتدا ، بەکاڵی یابە کوڵاوی یابەتەڕووشکی خەم و پەرۆشە . کە ـ ی زۆر هەبێ بەڵان ئیی نەخوا هەموی ببەخشێ ویابیفرۆشێو یالەماڵی خۆی دورخاتەوە : لەخەمو پەرۆشی‌ڕز گاردەبێ

بـەر : ابن سـیرین دەڵێ : ئەگەر کەسێك سـەیری بەری خـۆی بکاو وا بزانێ کەهیچ کاتێکی مووی نەبووە : کاروباری پە کی دە کەوێ .
کەبینێ ئـازار لە ـ ی وی‌دا هەیە : هێندەی وی تووشی ئازار دێ .
کەمووی ـ ی زۆر بێ : پەرێشانی دەستی ژیان دەبێ .

بەر ( بەری داران ) بڕوانە میوە .

بەراز . ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەوندا پیاوێکی دەوڵەمەندو بەهێزە بەڵان سووك و بێ خێرە . کەبینێ ـ ی هەیە : بەدڕەفتاری و ناتۆرەیی خزم ودایك و باو کە . کەبینێ ـ ان زۆر کۆ دە کاتەوەو پارێز گاریان‌دە کا وبەرەڵایان ناکات : ماڵێکی زۆر و زەوەند کۆ دە کاتەوە کرمـانی دەڵێ : ڕاگرتنی ـ بۆ کێتی باشە ، بەڵان بۆ ئایین زیانی هەیە .

دیتنی کوودەڵە بەراز لەخەوندا : خەم و خەفەتە . خواردنی ــ : سووت
خواردنە . کەبینێ ــ ان لـەجێگایە کەوە بـۆ شووێنێکی تر دەبات :
هەواڵی گێتی وی باش دەبێ . کەبینێ بەناو بەرازاندا دەخولاوە : بـە
شووێنماڵی نارەوادا دەگەڕێ و کۆی دەکاتەوە ، دەڵێن خواردنەوەی
شیری ــ : خەمو خـەفەت و کارەساتـە . کەلەناو ــ اندا دانیشتبێ : زاڵ
بوونە بەسەر دوژمناندا . پێستی ــ ی : ماڵی نارەوایە . کەبیتە شووانی
ــ ان لەسەر دەستەیە کی ناپەسند گەورە دەبێ . کەبینێ لە گەڵ ــ ێکی
کێوی شەڕیدە کا لە گەڵ گەورەیە کی خراپو بێداد کێشەی لێدەقەومێ
کەبینێ موو ، پێست یائێسکی بەرازی هەیە و هێندەیوی ماڵی دەبێ .

بەرە شادمانیو شاگەشکەبییە . کەبەرەی ڕاخاولەسەری دانیشێ : ڕۆزی
فرەو تەمەنی درێژ دەبێ . مغربی دەڵێ : کەـ تازەو گەورەو پان بینێ
نازو بەهرەو سوودی زۆر دەبێ بـەتایبەتی کەڕاخرابێ . کەـ ی خۆی
بفرۆشێ یابیبەخشێ بە کەسێکی تـر : کەم و کووڕی دە کەوێتە ماڵی .
کەـ ی بـەستێ : دەرگای ڕۆزی بەسـەردا دەبەسترێو باری زۆر
گرانو سەخت دەبێ . کەـ پێچراێتەوە : نیشانەی کورتی تەمەنە کە
بینێ لەسەر ــ یە کی گچکە دانیشتووەو لەژێری دا پانو بـەرین بوو :
نیشانەی وەیە کەلەژیان ورۆزیداتووشی گوشادی دێ . کەـ بپێچێتەوە
ولە گۆشەیە کی دابنێ ڕێزو سامانی خۆی لەناو دەبا . کەـ بەپشتی خۆی
دادا ماڵی بێ سپێرراوی لەلابـە کە بەپێچراوەوەی ــ خۆی بدا بـە
کەسێکی تر : دروایی تەمەنیەنی .

بەرەلاّ کردن ( طلاق ) داوێن پیسیو رووداوانی هۆڵمانیو دادارێتییە
بە ێلاّتژنە کەی بەرەلاّ بکا کەبەتەنها ژنێکی هەبێ : نیشانەی تابرومەندی

و گەورەیی‌یە . بەڵان کەژنێکی تری هەبی : کەم و کووری‌یە .

بەربوونەوە : بەدبەختی‌یە کەبەیادت دا نەهاتبێ ( بڕوانە کەوتن ) .

بەرخ . ـ نێر بێ یامێ : منداڵ و خێرو سوودە . کەبینێ ـ ی هەیە یایە کێك داویەتێ ؛ منداڵی بەڕووی دەبی. کەبینی ـ ی کوژتەوە :منداڵی دەمرێ کەگۆشتی ـ ی بخوا : بەهۆی مناڵەکانیەوە خەم و خەفەتی بێ دەگا .

بـەرد . کرمانی دەڵێ : ـ لەخەوندا ماڵ و گەورەیی‌یە . ـی نەرم سوودی پترە . کەبینێ ـێکی سپی‌هەڵگرتوە یایە کێك داویە بەوی : دۆستایەتی پیاوێکی گەورەو ڕووخۆش دەکات و سوودی لێ دەبینێ . ـ کەڕەشبێ لەگەڵ گەورەیەکی ڕق ئەستوور دەبێتە ئاشناو کەلکی لێ دەبینی . کە زەرد بێ یاسوور : لەگەڵ گەورەیەکی بـەدخوو ئاشنا دەبێ‌و سوودی ای دەبینێ کە لەچیایەکی ـ ان بینێ و هێندێکی لـەداوێنی بکات هەروە کوو سەرەوەیە ، ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لەخەوندا : سەختی‌یە لەکاروباراندا . کەبینێ ـی لەژێـر ئاوی کۆ دەکردەوە ماڵێکی بەڕەنج و فێڵ پێکەوە دەنێ . کەلەکێوێ ـی بتراشێ : لەگەورەیەکی دڵڕەق بەفرت و فێلان ماڵی دەستدە کەوێ . کەلەچـۆلێ ـی کۆبکاتەوە لەکۆچی‌دا بەفێڵ ماڵی دەستدە کەوێ . کەـی بەخەڵکی دادا : بەڕەنج ماڵی خۆی دەدا بەخەڵکی . ووردە بەرد بردنەوە ماڵێ : ماڵێکی زۆرە مغربی دەڵێ : کەبەردی بەکەسێکی دابدات : بوختانی داوێـن پیسی‌و گوناهی دەکات .

بەرداش : کەبشکێ ئاشەوان دەمرێ ، کە ـ بقەڵشی یازیانی بی بکات : گوزەرانی ئاشەوانی ڕوو لەناخۆشی دەکات .

بەرگ ابن سیرین دەڵێ : کەبینێ ـ ی گەورەی پۆشیوە ، ئەگەر لێی بوەشێتەوە کاروباری بەهێز دەبێ . کەـی وەزیری پۆشیبێ : ماڵێکی زۆری دەستدە کەوێ بەڵام لەلایەن خەڵکیەوە سەرزەنشتی دە کرێ کەبەرگی پیاو کوژی بپۆشی : سودە . کەـی ئاغایان لەبەر بکا هێمن وبەدەم و پل دەبێو خەریکی ڕێکخستنی کاروباری خەڵکی دەبێ . کەـی بازرگانان بپۆشی : باشە . ـی پاشای پۆشین : باشە ، ـی خراپان خراپە . ـی جوولەکان پۆشین : بەنێـڵ و فەرەج دەجوولێتەوە . ـی فەلان پۆشین : کارێکی وای لێ ڕوو دەدا کەبەهۆی ویەوە لەدۆستان دڵنیا نابێ . ـی بوتان پۆشین : خزمەتی گەورانە . ـی گرتووخانە پۆشین : خەم و بێچارەییە . ـی حەمباڵی پۆشین : پێك هێنانی راسپاردەیەو ناوبانگ پەیدا کردنە . ـی قەسابان پۆشین خەم و خەفەتە .

ـ یێکی پرشکۆ لەبەر کردن لە گەڵ ژنێکی ئاشنایەتێکی سەرزارە کی پەیدا دە کات . ـی زێڕین باشە ، ـی زێڕبافت : ژنی ژیرو کەنیزە کی هۆشمەندە . ـی سپی و تازە : سوودی ئایین و گیتی‌یە .

ـی ئەستوورو تەنگ : خراپە دیتنی ـی چڵکن و دڕاو خراپە . ـی سوور بۆ ژنان باشە . ـی کەسك : خەم و بەوختانە . کەـی ڕەنگاو ڕەنگ ببینێ ووتەی ناخۆش لە گەورەیێکیەوە گووێ لی دەبێ . ـی لێ وون بێ یا لێی بستێنن و ڕووت بمێنێتەوە : پایەو ڕێزی کەم دەبێتەوە . کراسی خۆی بدڕێنێ لە گەڵ ژنی خۆی شەڕێ دە کا .
ـی قەد کراو کردنەوە ، کۆچ کردنە . ـی کراوەوەقەد کردن : لە کۆچ گەڕانەوەیە کەسێکی ـ ی ژنان بپۆشێ ماڵی زۆر دەبێ ، دەشڵێن تووشی ترس‌و خەم دەبێ . ـ ی پیاوان پۆشین : خێرو سوودە .

بەر گی خەوێ ( جلکی شەوێ ) . ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ ژنە . کەبەسپی
وپاکی بێ : خێزانی بەتۆرە (مۆدب) ە و ئایینداره . کەرەش بێ : لە
ژنەکەیەوە خەم و خەفەتی پێ دەگات . کە ـ لێ بەزرێ یا وون بێ :
دەست لەژنەکەی هەڵدەگرێ . کە ـ ی بسووتێ : ژنەکەی دەمرێ .

بـەرگی پینەکراو : دەست کورتیتی‌یە . کراسی چڵکن لەهەر جۆرێکی
بێ : خەفەتە . ـ لەپێستی ئاژەڵان بێ : نیشانەی خـێرو سوودە . ـ ی
نەدرواو وەکوو کفنی لەبەر کردن : کۆتایی تەمەنی دێت . کە کەوڵی
کەرێی پۆشی بێ : رێزو قەدرو پایەی دەست دەکەوێ .

بەرگەروو پاش ملە ( غیبت ) و ووتەی خراپەو بـیر و باوەڕی خراپـە
لەراست تۆدا .

بەرماڵ : ابن سیرین دەڵێ کەلەمزگەوتی دا ببینێ : نیشانەی چوونە ماڵە
خوایە . کە ـ ە کە خوری یا کرباسی هەبێ یابکرێ : هەواو هەوەسی
خودا پەرستی دەبێ .

بەرِوو رۆزی رەوایە . کەلەماڵی خۆیدا هەنبانەی بەرِووی زۆر هەبێ و
هی خۆی بێ : ماڵ و بەهرەیەکی زۆری لەو ساڵی‌دا دەست دەکەوێ .
ئەگەر لەماڵی خەڵکی ببینێ : خەڵك لەلای وی گرك ( أمانة ) دادەنێن

بەش کردن ابن سـیرین دەڵێ کەببینێ ماڵی خـۆی بەسەر خەڵکی دا
بەراستی دابەش دەکا : نیشانەی مـرۆڤایەتی‌یەو یاژن بۆ کوری دێنی
کەماڵی خۆی بەناخۆشی و شەرِ ببەشێتەوە : باری دەشێوێ .

بەشی خودا ( زکاة ) کە ـ لەماڵی خۆیدا ببینێ : سامانی پتر دەبێ .
کرمانی دەڵێ لەخـەوندا ـ دان : مـاڵی وی رەوایـە ( حـلال ) و
بەلا گیرەوەیە .

بەفر . ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لەخەون دا خەم‌و ئازارو خراپی کارو هەژاری‌یە کە ـ بە سەریە کدا کەوتبێ : پەسندە . خۆبە ـ شوشتن : دامرکانی ئازارە ئافرەتی ئاوس ـ ی‌بخوات بەرداوێ . بەفرماڵین : دادخوازی مرافعە یە کۆمای بەفر : ئومێد و ئارەزوو وانی‌باشە جابری مەغریبی دەڵێ دیتنی کرێوە (بەفر بارین‌بەدەم‌باوە)؛ لەشکرێکی‌شکاوە

بەقاڵی ؛ ابن‌سیرین دەڵێ لەخەون دا ـ کردن ؛ رِۆزی پەیدا کردنە وهەو لە لەکارانەدا

بەلەك ؛ دیتنی ـ ماڵی خەڵکەو گۆزە رانێکە کەپشتی پێ دەبەستێ . هێندـ ێکیش لەسەر ئەوەن ـ بۆ مرۆڤان ; پایەو قەدرە . کە ـ ی بەهێز بێ : کاروباری باش دەبێ . کەبێ تێن بێ : کاروباری چرووك دەبێ . کرمانی دەڵێ : کە ـ ی ئاسن بێ یاپۆلا تەمەنی درێژو سامانی پایەدار دەبێ . شکانی ـ ی : بۆ لەشی خراپە . جابر دەڵێ ـ ژنە بۆ پیاوان ، بۆ ئافرەـ تانیش مێردە . کە ـ ی بتاشێ : قەرزی بۆ دەدرێتەوە .

بەلغەم ماڵێکە بەئابۆری و بەرژەوەندی دەیچووێنی . کە ـ فرِێی داتە ناو جەرگەی خەڵکی : بەپێچەوانەی سەرەوەیە : کە نەخۆش ـ فرِێ دا : چاك دەبێتەوە کە ـ ی رِەش فرِێ‌دا : خەفەتە . کەهی خووێناوی فرِێ دا کەم و کوورِی ماڵە .

بەن ابن سیرین دەڵێ کۆچـە ، هێندێکیش دەڵێن : کاری پیاوێکی‌یە لەگەڵ ژنان بەندیـواری هەبێ کەبینێ ـ ی لەلۆکە یا ئاوریشم یا کەتانی دەرِست : کارێکی رِەوا دەکا بەلان بۆ پیاوان باش نیە . ـ ی بباتە لای جۆلا کەبیکاتە بەرگ : لەتەگبیری کارێکی‌دایە کەدوژمناتی تێدایە . کرمانی دەڵێ کەژنێك ببینێ ـ ی لەخوری یالەمووی دەرِست : بەکێکی ئاوارەی لەدوورەوە دێتەوە . لەکانی رِستنی‌دا بپسێ : ئاوارە کەی لەهەندەران دەمێنێتەوە کەبینێ ـ ی زۆر هەیە : تەمەنی درێژدەبێ

بەند ( تۆق ) . ابن سیرین دەڵێ : ـ ی ئاسن لەپێدا : درۆزنی و ناڕاستیبە مرۆی باش ـ ی لەدەستی خۆیدا ببینێ ، واز لەکاروباری خراپ دێنێ کە ـ ی لەئەستۆی دابێ ، بارمتەیەکی لەگەردنیدایـە باشی ڕەفتار نەکردووە . کە ـ ی داری لەپێدا بێ : ڕوو لەخودای دەکاو لە کۆچێ دەگەڕێتەوە بەساخی . کە ـ ە کە زێو بێ : لەژنانەوە ئازاری پێدەگا کەزێڕ بێ : ئازاری لەماڵەوە پێ دەگا . کەچواربەندی لەپێ دا بێ : چوار کوڕی دەبێ . ـ ی لەپێ بێتەدەرێ : لەخەمو خەفەت ڕزگاربوونە

بـەند : بڕوانە زیندان .

بەندە : کەببینێ لەخەونیدا خۆی ناسیوە ( بلوغ ) ، ئازار دەبێ . هـەر کەسێکی ببینێ کەبەندەی خۆی ئازاد کردووە : زوو کۆچی دووایی دەکا . کەیفرۆشی : شاد دەبێت .

بەور . ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لەخەوندا : دوژمنێکی بەهێز و ئازایـە بەڵان دڵ فراوان و میهرەبانە . کەلەشەڕدا لەسەر ـ دا زاڵ بێ : زاڵیە بەسەر دوژمناندا کە ـ بەسەر وی دا زاڵ بێ : بەپێچەوانەیە . کرمانی دەڵێ : تیسك و پێست و مووی ـ لەخەوندا : نوخشەی باشەو سوودێکە لەدوژمنانەوە بەوی دەگات . کەسواری ـ بی و ڕامی بێ : دوژمنانیش ڕامی وی دەبن .

بەهار : ابن سیرین دەڵێ : لەکاتی خـۆیدا پادشایە . کەلەخەون دا بەهـار ببینێ لەکاتێکیدا کەهەوا ( گەرم یاسارد ) وناساز گار بێ : خەڵکی ئەو وولاتی لەلایەن پادشاوە تووشی ئازارو ڕەنج دێن . کەبـەهار خۆش و ـاز گار بێ : خێر و سوودیان پێ دەگات .

بەهەشت : شادی و خۆشی یە . کەمیوەی بەهەشتی هـەبێ یا کەسێك بەوی دابێ و یخوا : هێندەی وی فێری زانیاری دەبێ بەڵان بێ سوودە .

کەببینێ لـە ـ یێ دا دەربانکرد : لەگێتی دا تووشی ناپاکی و داوێن پیسێتی دەبێ .

کەئاوی بەهەشتی بخوواتەوە : بەسەر دوژمنانەدا زاڵ دەبێ . کە کۆشکێکی
بەهەشتی بدەنێ : دلارامێك و یا کەنیزەکێکی جوان دێنێ. کەخۆی
لەگەڵ پەریانی - ی ببینێ : گیاندانی ئاسان دەبێ . کەدەرگای - ی لێ
ببەسترێ : دایك و باوکی لێی زیـزن . کەفرشتـان دەستی بگرن و
بیبەنە - ێ : بەئاواتی خۆی دەگات .

بڕبەند ( کارتیغ ) . کەسێکی ببینێ کە - ی هـەیە : دەرگای کارو باری
لەسەر دەکرێتەوە ، هێندێکیش دەڵێن : دیتنی - بەئاوات گەیشتنە .

برژان . ابن سیرین دەڵێ : - لەخەوندا : ووتەی بـەدە ، خواردنی گۆشتی
مەڕ بەبریانی : هێندەی وی ماڵ بەسـەختی دەست دەکەوێ . بریـانی
گۆشتی ڕەشە وولاخان : لەترس ولەرز دڵنیا دەبێ . هێ بەرخ خواردن
کەمێکی ماڵ دەستدە کەوێ ، هێندێکیش دەڵێن کوڕی دەبێ .
کەبەرخی برژاو بخووا : سوودی پێ دەگا . لەگەورەیە کەوە کەهێ
باڵندەی برژاو بخوا لەژنێکەوە بەمەکرو فێڵ سوودی دەستدە کەوێ
هێ ماسی برژاو بخوا : کۆچ دەکاو وەدووی زانستی و زانینەدە کەوێ
و یا دەبێتە هاودەمی پیاوێکی گەورە .

برسێتی : ابن سیرین دەڵێ : کەمرۆ لەخەونیدا برسی بێ لەتێری باشترەوله
تینوێتیش باشترە . کەلەخەونیدا ببینێ برسی یە و هیچی نیە بیخووات :
نیشانەی قرم ( طمع ) ە . لەلای جابریش برسێتی : کارەساتە .

برووسکە (صاعقة) . ابن سیرین دەڵێ : خەزینەداری پادشایە . هێندێکیش
دەڵێن : - دوواڕۆژێکی هەڕەشە لێ کەرە . کە - بدرەوشێ لەوساڵیدا
بەهرەو هەرزانی دەبێ بەتایبەتی کەبای لەگەڵ بێ . ئاگری - بکەوێ
خەڵکی ئەو شووێنی تووشی ئازار دێن .

بڕکە . - ی خەیارو ترێزوو و ئیتر : پیاوانی پەست و نزم و سووکە .

برنج : ـ دیتن : ماڵێکە کەبـەرِەنج دەست دە کەوێ . کە ـ ی کولاو بخووا ئاتاجی وی پێکدێ و خێرو چاکەی پێدە گا . ـ بە گۆشتەوە : باشترە . ـ بەشیرەوە خواردن : زۆر زۆر باشترە . ـ بەدۆوە لێ نرابێ : خەفەتە

بزۆ : ئاینە . ـ تەواو بێ : چەت (زینة)ی وی تەواو دەبێ . کە ـی هەڵوەری یابێ توك بێ : هەوای چتێکی دە کەوێتە کەللەیەوە کەدەبێتەهۆی بەدناوی

برین : ـ ی بەبەستراوی ببینێ : دەردو ئازاری دادەمر کێ . ـ ی ئاوەڵە : سەرئێشە و رِووشە و هەنگامە تازە دەبێتەوە . برینداربوون : دوژمن دەبێتە دۆستی . ـ لەلەشیخۆیدا ببینێو خووێنو کێمی لێ بێ : هێندەی وان ماڵ و بەهرەی دەست دە کەوێ . جابر دەڵێ کەهەموو لەشی خۆی بەبرینداریێکیوە ئازار ببینێ : خەفەتو کەم و کورِی ماڵە . ابن سیرین دەڵێ : کەلەناو لەش خۆیدا ـ ی ببینێ و جل و بەر گیشی خووێناوی بێ ماڵی نارِەوای دەست دە کەوێ و زیانیشە .

بزمار : پیاوێکە بەندیواری بەخەڵکەوە هەبێ . کەچتێکی بە ـ ی قایمبکات کاروباری پەرێشانی خۆی دە کاتەوە . بزماری لێ بزر بێ : بەپێچەوانەیە کە ـ ی لەدیواری دا : برای لێ دە گیرێ .

بزن : ژنە ، ـی سپی : سوودو سامانە ، ـی رِەش : نەخۆشیێکی سەختە . ـ یێکی نەناسراو بکوژێ : بەسەر پیاوێکی گەورەدا زاڵ دەبێ . کە کەولی بکا : مـاڵێکی زۆری دەست دە کەوێ . کە گۆشتی ـ بخوا : ماڵێکی زۆری دەست دە کەوێ . کەسواری ـی بێ و بۆهەموولایە کێ بازووێ : لە گەڵ پیاوێکی گەورە فێڵ و فەرِەجی دە کا . کەدووشاخە کانی بشکێنێ : پە کی کاری پیاوە کەیدەخا . کەترو کیدرێژبێ : ماڵی زۆر دەبێ . کە ـێکی دەستکەوێ : ژنی دێنێ . کەشیری ـ بخووا ماڵی لەژنێکی دەست دە کەوێ . کەـ ە کە لەماڵی وی بچێتە دەرێ : ژنە کەی دەرِوا .

بللور : ژنی نا کەسە . کە ـ ی هەبێ یابە کێك بیداتێ : ژنێکی نا کەس دێنێ کەبیبنێ ـ ە کەی شکا یاوون بوو . ژنە کەی بەرەڵا دە کا یالێی وون دەبێ . کە ـ ی بفرۆشێ : دەبێتە دەڵاڵی ژنانی ناپەسند .

بلوێر . ـ لێدان : ڕووشەو کارەساتەو بیستنیشی خەفەت هێنەرە .

ابراهیم دەڵێ . لێدانی ـ وەڵامی بێ سوودە بەخەڵکی دەدات .

بناخە دانان : ابن سیرین دەڵێ : ـ سوودێکی زۆرە لەخەڵکی دەبینێ .

کە ـ لەشوێنێکی نەناس دانێ : لەکاروباری ئاینی و گیتی لەناودەچێ

کە ـ لەسەر زەوی خۆی دابنێ : سوودو ڕۆزی ڕەوای پێ دە کا .

ـ بەخشتی برژاوو گێچ : سوودی نارەوایە . کەبەلکبنی ـ لەسەر هەوا دابنێ : دڵەزنی ( همة ) یە . ـ دانانی شار : دەستە مرۆڤێکی لەپەنای ـخۆی دە گرێ : ـقەڵاتدروست کردن : لەدوژمنان دڵنیا بوونە ، ـ ی کۆشك و تەلار : خەریك بوونی کاروباری گیتی یە ، بنیاد نانی باخ : ژنێکی پارێز گارو دەوڵەمەندی دەبێ .

بنانکووێ لەخەوندا دیتنی کورێکی پیرۆزە ، هەردووك ـ : دوو کوڕە . کرمانی دەڵێ دیتنی ـ پاێەو پلەو ڕێزە جا بەزۆری و کەمی .

بن هەنگڵ : دیتنی ـ لەخەوندا : سەر کۆنەیی و ناشیرینی یە کەبەوی دە گات . دیتنی مووی ـ : بەمراد گەیشتنی دوژمنانە بەسەر ویدا .

بۆنی ناخۆشی ـ : ماڵی نارەوای دەست دە کەوێ .

بنیـاد : بڕوانە بناخەدانان .

بنێشت ، کەلەسەر ئاگر دابنرێ : کەمو کوڕی دە کەوێتە ناو ماڵ وسامانی وی یەوە . کە ـ ی بجوێ . ماڵ بەدووڕ مناوەتی و گفتو گۆو چەنە بازی پێدە برێ

بوتری : جێژنومیوانداری‌یە . -بەتاڵ ببینی : دەکەوێتەبەر ئاورلێدانەوەی گەورانەوە . - پڕ ببینی : لەگەڵ مەستان شەڕی لێ دەقەومێ . دیتنی - ی شکاو : کێشەو قڕەیە لەنێوانی دۆستان دا .

بۆڕەی ڕەشە وولاخان : مەرگێکی ڕاستەو خۆیە .

بۆق : کەکەسێك لەخەونی‌دا - هەبێ : لەگەڵ پیاوێکی پارێزکار دەبێتە دۆست . کە - ی بکوژێ و بیخوا : لەگەڵ ناوبراوی زۆرو پێدادی دەکا . کەبینێ - زۆر لەشوێنێکی‌دا کۆبوونەوە و قیرە قیرێ دەکەن ئازاری خودای لەو شووێنی‌دا پەیدا دەبێ . کە - ئەوی بگەزێ : لەناو براوی زیان دەبینێ .

بووك : کەبینێ - ێکی خوازتووە نەیدیتووەو ناویشی نازانێ : زوو دەمرێ . کەبینێ -ی‌هێناوەو لەگەڵی نوستووە : گەورەیی‌یە . ابراهیم دەڵێ - بەدەهۆڵ و زوڕناو زەماوەند بێ کارەساتە . ژنێك ببینێ کەوا بەبووکی بۆمێردە کەی دەبەن : دووایی تەمەنیەتی .

بوولەرزە . ابن سیرین دەڵێ : کەبینێ زەوی - ی هەیە :.دانیشتوانی وێ پێدادی لەپادشای دەبینن ، هێندێکیش دەڵێن :ئاهۆو کارەساتە بەخەڵکی دەگات . کە - زەوی سەرەو ژێر بکا : هەروەکوو سەرەوەیە . ابن سیرین دەڵێ :. کە - بکەوێتـە ئاسمانێ : لەو وولاتی‌دا کارەسات و ڕووشەو پێدادی ڕوو دەدا . کەبینێ مانگ و خۆر لەرزین : پادشاو سەرۆکی ئەو خاکی زیانی پێ‌دەگات . لەرزینی کێویش : زیانی بۆ پادشاو گەوران هەیە .

بولبول : لەدڵداریتی‌دا بـەئاوات گەیشتنە . ابن سیرین دەڵێ : منداڵێکی

دەنگخۆشی و جوانە . دەنگی بولبول : ئالو گۆڕی دۆستایەتی و پەیمانی پێك گەیشتنە . کرمانی دەڵێ دیتنی ـ : مندالّی گچکەو نۆ کەرە . کە ـ بفرێ : مندالێ یاغلاّمی وی لەناو دەچێ . کە ـ لەناودەستیدا بمرێ : هەروایە . کەبولبولی زۆر هەبێ : بەقەدوان نۆکەری دەبێ . کە ـ ی بکوژێ و گۆشتی وی بخوا : میراتی بەنۆکەران دەبڕێ . ابن سیرین دەڵێ : کەلەناو باخیدا بیگرێ لەگەڵ خەڵکی ڕووخۆش و دەوڵەمەند تێکەلاّوی پەیدا دەکات . ابراهیم دەڵێ : ژنێکی دەنگ خۆشە .

بۆمباردمان دیتن : هەواڵێکی بێ سوود لەئازاری تۆدا دەدەن . هاوکاری لە ـ مەرگێکی نزیکە .

بۆن : ابن سیرین دەڵێ : بۆنی خۆش و ناخۆش : بێ هەڵکەوتن و لەپشت سەردان و وتەی نارەوایە کەبۆن خۆش بێ : چاکەی لەگەڵدە کرێ کەلەخەون دا ـ ی خۆش ببینێ : مەرگە . کەبۆنت خۆش کەن : پێت هەڵدەڵێن . کەبۆنی ناخۆش کەن وەیا تێی بدەن : ڕیسوا دەکرێ .

بێ ( بەهێ ) . لەلێکدانەوەی ـ دا چەند بیروباوەڕی جیاوازهەیە : هێندێك دەڵێن گەورەبی و خێر و سوودی دەست دەکەوێ . هێندێك دەڵێن منداڵە ، هی واش هەیە دەڵێ نەخۆشییە . ابراهیم دەڵێ ـ لەکات و بێ کات دا دیتن دا : نەخۆشییە .

بێ نین : کەببینێ چاوی ـ بووە ژن یا کچی دەمرێ ، کەباسکی ـ ببینێ ژنەکەی نەخۆش دەکەوێ و باباری براو منداڵی دەشێوێ . کەخۆی ـ ببینێ : لەدڵفراوانێتی دوور دەکەوێتەوە کەدڵی ـ بێ بیروباوەری کەم دەبێ .

بیابان . ـ لەخەون دا بەهرەو ڕۆزی و شادی و گوشادی یە .
کەخۆی بەتەنهایی لە ـ دا ببینێ : بەتێکۆشانی خۆی مالێکی زۆر کۆدەکاتەوە . کەلەگەل دەستەیەکی لەبیابانێدا بگەڕێ : لە کۆچێ دا مالێ و سامانێکی زۆری دەست دەکەوێ و دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە . ابن سیرین دەلێ : چوونە نلو ـ : خەفەتە ، اوێی هاتنە دەرێ : لەخەم و خەفەت رزگاری دێ .

پێدادی : ابن سیرین دەلێ : کە ـ لەگەلێ بکرێ : بەسەر وی‌دا زالێ دەبێ کەئەو ـ لەگەلێ یەکێکی تر بکات : خۆی لەژێردەستی کابرایدا دەچروسێتەوە

بێ ڕێزی . ـ بەسەر هاتن : یەکترناسین و مرایی دیمەنی کردنە . ـ بەسەر کەسێکی هێنان : مووچەو مانگانەی پتر دەبێ .

پێزو بۆ . لەخەون دا ـ کردن : پێزوبۆ کردنە لەپێدادگەرێکی بەسەری‌دا زالێ دەبێ . هێندێکیش پێیان وایە کەبەپێچەوانەیە . ـ لەهەژار کردن : پێخەی خۆی دەگرێتەوە .

پێژنگ : نۆکەرێکی خاوێنە ، کەببینێ ـ یێکی نووێی هەیە : نۆکەر یا کارەکەرێکی خاوێنی دەستدەکەوێ کە ـ ە کەی لەناوبچێ : نۆکەر یاکارەکەرەکەی لێ جووێ دەبێتەوە . ابراهیم دەلێ : کەببینێ دەغلی بە ـ ی پاك دەکردەوە کارێکی وادەکا سوودی خەلك‌و زیانی‌خۆی تێدایە . ئەوەی کەبێی دادەپێژت کەهی خۆی بێ . سوودی تێدایە .

پێلێ : کاروباری پڕ سوودو بەکەلکە ، ابن سیرین‌یش دەلێ : نۆکەرە . هێندێکیش دەلێن : ـ دیتن : کارێکە بەڕەنج و ئازار پێك دێ . پێلکاری کردن : هەولێ و تەقەلای کاریگەرو پڕسوودە .

بێ نوویێژی ( حیض ) ابن سیرین دەلێ : لە ـ کەوتن بۆپیاوان پایەداری‌یە لەداوێن پیسێتی‌دا

بۆ ئافرەتانیش : مایەی زۆرو زەوەندی ماڵە . کەپیاوێك خۆی ببینێ لەبێ نوویژی کەوتووە ؛ روو لەخرابی و داوێن پیسی دەکاو خەم و خەفەتە . بۆ ژن ؛ هێندەی خووینە کەی ماڵی نارەوای دەست دەکەوێ پیاوێك ببینێ ژنەکەی لە ـ کەوتووە ؛ کاروباری لەسەروی دەبەسترێ کەببینێ ـ ە کەی لە ـ پاك بۆتەوە ؛ دەرگای هەموو کاروبارێکی لەسەر دەکرێتەوە . کە پیاوێك لەکاتی ـ دا لەگەڵ خێزانی بنوێ : دەرگای خێری لێ دەکرێتەوە ، هێندێکیش دەڵێن : کاروباری روو لەسەختی دەکات .

بێ هۆشی : کەبێهۆش بێ : تووشی کارێکی دێت کەتێیدا سەرگەردان دەبێت بەڵام لەئەنجامدا کاری باش دەبێ .

دەڵێن بێ هۆشی لەکاتی خەون دیتنێدا : دوونیشانەی لێ دەوەشێتەوە :

١ ـ سەختی کاروبار .

٢ ـ سەرگەردانی .

بێ هێزی : بڕوانە بێ تینی .



پابەند : بڕوانە پێ بەند .

پاچە : بڕوانە سەرووپێ .

پادشا : ابن سیرین دەڵێ : کە۔ بچێتە ناوسەرایەکی یادێ و شارێکی : بەڵا ڕووی لەوێ دەکا . کەلەشەڕێدا بەسەر ـ ی‌دا زاڵ بێ : تاتاجی پێکەنێ کە ـ دەستی ڕاستی وی ببڕێ : سووێندەدرێ . کە ـ گیان بدا : شێت دەبێ . کە ـ لەسەر تەخت یالە کورسی بکەوێ یاتەختەکەی بشکێ یا ئەسپەکەی لەقەی لێ بدات یاشیری بشکێ : نیشانەی تێك چوونیەتی . کە ـ ڕۆژباشی لەکەسێکی بکاو یا یەکێکی تر ڕۆژباشی لەوی بکا : نیشانەی ئاشتی و ئارامی یە .

پاڕانەوە ( دوعا کردن ) . ابن سیرین دەڵێ : پاڕانەوە : ئاوات پێك هێنانە . کەبۆخۆی داوای بەخشین بکات و بپاڕێتەوە : ئەنجامی کاری خێرەو ئاوانی پێك دێ کەبۆخەڵکی بپاڕێتەوە : وادیارەچاك خوازی خەڵکە هەموو مرازێکی پێکدێ کەبەتایبەتی بپاڕێتەوە : منداڵی دەبێ .

پارە ( پووڵ ) : هات و بەختەوەری‌یەکی گەورەیە . ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ : پارە دەست کەوتنە . هێندێکیش دەڵێن ـ دیتن : بیستنی ووتەی خۆشە . پارەی سپی باشە ، بەڵان هی ڕەش : شەڕو دوژمنایەتیە هێندێکیش دەڵێن : کەببینێ ـ ی گچکەی دەستکەوت : منداڵی گچکەیە کە ـ ی لێ وون بێ یابدزرێ لە منداڵێکی گچکەوە خەفەتی دەکەوێتە ناو دڵەوە . کە ـ وون بووەکەی بدۆزێتەوە : خەمەکەی دەڕەوێ ، کەنەیدۆزێتەوە : منداڵی دەمرێ کرمانی دەڵێ: لەدەست بوونی پارە قسەی باشە . هی شکاو : ووتەی پەڕاگەندەیە . پارەی زۆر : سامانە .

کەببینێ لەگەڵ خێزانی ـ ی بەش دەکا : لەنێوانی واندا ووشتو مڕ پەیدا دەبێ کەببینێ ـ ی زۆر هەیە هێندەی وی سامانی دەست

زە كەوێ . كەببینێ ـ ی زۆر كۆ دە كردەوە : خەڵكی لەرێگـای ڕاست لادەدات . كە ـ ی سپی لەدەستی خۆیدا ببینێ : منداڵێكی دەبێ كەببینێ ئەوی لێ گوم بوو : منداڵی دەمرێ .

پارچە ( قماش ) . كەخوری بێ : بەماڵو پایە دەگات . هی ئاوریشم : شكان وتێدا چوونی پووڵ و ماڵە . كەببینێ ـ ڕەنگ دە كرا : ئازارێكی دێتە پێشی .

پاروو : ابن سیرین دەڵێ كە ـ ێكی شیرین لەزاری بنێ : قسەی خۆش دەكا . كە ـ ە كە ترش بێ : بەپێچەوانەیە .

پاژنە دانیال‌دەڵێ كەلەخەونی‌دابببینێ ـ ی زۆرهەیەیا ـ ی بێ‌ی‌شكاوە:خەمە

پاسەوان : ابن سیرین دەڵێ : كە كەسێك ببینێ لە گەڵ پاسەوانانی باشـی دەگەڕا : سوودە . ابراهیم دەڵێ كەببینێ ـ ان ڕووتیان كردو بردیانە گرتووخانە لەپادشا پێدادی دەبینێ .

پاسەوانی : ابن سیرین دەڵێ : ـ ی شووێنی باش بێ : خێرو بەهرەیە . كەـ سەرای پادشای بێ : لەپادشاوە سوودی پێ دە گا . كەبازرگان خەونی وابببینێ : زۆر قازانج دەكا . پاسەوانێتی كشت و كاڵ كردن : سوودیان لێ دەبینێ . كەمرۆ ـ لەخەودا ببینێ ببینێ : دەبێتە خاوەندی قـەدرو پایەو وولات و چارەی كاران دەكات .

پاقلە . بەووشكی و تەڕی ، بەكاڵی و كوڵاوی لەكات و بێ كاتی‌دا : خەم و خەفەتە . كەنەیخووا : زیانی كەم تـره ، كەفرێ‌ی داتە دەرێ و لێ‌ی نەخوواو كانی خۆی بێ : بێ زیانە .

پاك كردنەوە ( ـ ی ماڵ ) : بەدیداری دۆستانی دوور شاد بـوونە . ـ ی جل و بەرگ : خۆت كاروباری خۆت هەڵسووڕێنە . ـ ی زبـڵ و پیسایی : گێڕانەوەی نێو و نێو بانگ و ناموسـە .

پالێ . ـ بەهەر کەسێکەوە بنرێ : دەبێتە دوژمنی .
پالوودە . ابن سیرین دەڵێ : ـ خواردنی ـ : قسەی خۆش کردنە . کە ـ لە
زاری کەسێکی تر بنێ : نیشانەی وەیە کە کارێکی چاك بۆ وی‌دەکات
پانیەی بێ : دیتنی ـ : نیشانەی ڕێکی‌و پێکی کاروبارە . کە ـ شکا بێ :
تووشی کارێکی وادێ پەشیمانی لەدووایە . کەقەڵەشتبێ : کارە کەی
پەشیمانی کەمتر لەدووە .
پاوانە : بۆ پیاوان : ئازارو ڕەنجە ، بۆ ئافرەتان : مێردە . کەلەزێڕ بێ :
ملك و سامانە . کە ـ ی دا کەنێ پالێی وون بێ : مێردی‌لێی زیزدەبێ
پەپووسلەمانکە پیاوێکی گەورەیە پاوەڵامە . کەلەگەڵ ـ باخووێ : بەسەر
کاروباری گیتی‌دا ئاگادار دەبێ . صادق دەڵێ دیتنی ـ : خێروخۆشی و
گەورەیی و پیرۆزی‌یە .
پەپوولە: نەخۆشی‌یە لەناوی دڵداریتی خۆی وەلەبەر نەفامی خۆی‌لە کێشە
داوێ . ـ ی سپی ئارەزو و نومێدی باشە . هی ڕەش : خەمو پەرۆش
وتازیەداری‌یە کە ـ کە لەپشتیەوە بفرێ : لە کەنیزە کێکی کوڕی‌دەبێ
کە ـ ی بکوژێ و پالەناو دەستی‌دا لەناو بچێ : منداڵی دەمرێ .
پەڕ : ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ وەکوو باڵندان پەڕی هەیە گەورەیی‌و
هێزو پەناو قازانجە کەپێ‌یان بفرێ : کۆچێکی پڕ سوودی لەپێشە
کەلێی هەڵبوەرێن : لەگەورەیی و سـوود دە کەوێ . کەبیبنێ ـ ی
باڵندانی لەلاهەیە : سوودە شاپەڕ : خەمونیگەرانی‌یەوخواردنیش زیانە
پەڕەسلێرکە . ـ لەماڵی‌دا : سەودای پایەدارە . کەبفرێ : کۆچێکی دوورە
کەـ ی لەدەستدابێ : سەر کەوتنە . کەبیبنێ هێلانە دروست دەکات :
پیرۆزی‌و پیتە لەماڵی‌دا کەـ ت هەبێ یا کەسێك بتداتێ : بەئاوارە کەت
شاد دەبیەوە کە ـ بکوژێ پالەدەستی‌دا فرێی بـدات : لەدۆست و
ئاشنایان دوور دە کەوێ و یادەمرێ .

بەرە کردن . دیتنی بەرە کار : پیاوێکی دەستەڵاتداری وایە کەکارو باری خەڵکی بێ رێك دەکەوێ . کەبینی بەرەی‌دەکرد : لەگەڵ پیاوێکی وادۆستایەتی بۆ ساز دەبێ .

بەرتووك ( کتێب ) . ابن سیرین دەڵێ : کەبینی ـ ی‌دەخوێندەوە : رێگای ئایین دەگرێ و کارانی بەستراوی بۆ دەکرێتەوە . کە ـ ی رێنوێنی (حکمة) بخوێنێتەوە : خەریکی کاروباری گیتی دەبێ . ابراهیم دەڵێ کەبینی ـ ی هەڵبەستان دەخوێنێتەوە : خەڵك بەسەری دەرۆن و سەرزەنشتی دەکەن . کە ـ ی ئەژماری بخوێنێتەوە : هەمیشە خەمناك دەبێ . کە ـ ی ئەفسانەو بۆیێکەنین بخوێنێتەوە : خەڵکی‌لەپاش ملەی دەدوێن و ریسوا دەبێ .

بەردە . ابن سیرین دەڵێ : ـ ی هەڵاوەسراو دیتن جاتەنك بێ یا ئەستوور خەم و ترسە . کەبینی ـ سووتاوە یالەناو چووە وەیا دراوە : لەخەمو ترس رزگار دەبێ . ـ ی کۆن و تازە بۆ پادشا و ئیتر باشە بۆ ژێر دەستان گەندە . دیتنی ـ لەبەردەرگای سەراو یامز گەوتو یابازاریدا خەم و ترسە .

بەردەدار : کەخۆی بە ـ ی ببینێ : کۆسپە لەپێش کاروباری لادەچێ و بەپایەو رێز دەگا . ـ کەپیاوێکی باش و دادگەر بێ : کاروباری باشی لێ روو دەدا کەخراپ بێ بەپێچەوانەیە .

پەرستن . ابن سیرین دەڵێ : ـ ی خودا : خێرو چاکەیە . کەلەمز گەوت وپەرستگایاندابێ : خێراتی زۆر دەکا بەلان لەشوێنی ناپەسندا بەپێچەوانەیە .

پەری : دوژمن و نەیارە ، لەلای هێندەکانیش بەختەوەری‌و گەورەیی‌یە . دەست لەناو دەستی ـ نان و لەگەلی ئاخەفتن شادمانی‌یە . ابن‌سیرین دەڵێ کەلەخەونداـ خۆشخوو وجوان و شادمان ببینێ : رێزوسامانە کەخەمگین و ناحەز بێ : خەم و خەفەتە .

پەری : کەبەنەخۆشیو یا بەمردوویی ببینێ : کاروباری ئالۆز دەبێ . کە شەرِی لەگەڵ ـ بکا : کاروباری تێك دەچێ . کەخۆی لەناو پەریاندا ببینێ : کۆچێکی زۆر پیرۆز دەکا . کە ـ دەستی لەملی کردبێو برِوا رِێزو پایەو گەورەیی‌یە .

پەسلان (قیامەت) . ابن سیرین دەڵێ : کەبینێ بوویە ـ : خودا لەو وولاتی دا داد بلاو دەکاتەوە .

پەسیوی : برِوانە ( هەلامەت ) .

پەشیمانی (تۆبە ) . لەخەودا لەخودا داوای ـ کردن : لەگوناهان لادەدا و خودا ماڵ و منداڵی زۆر دەداتێ .

پەلاس :لەخەوندا ـ دیتن : دەروێشیو پارێزگاری‌یە ، دەشڵێن‌ماڵی رِەوایە کە ـ ی لەبەردابێ : تووشی پیاوێکی وادێتو خێرسوودی لێ دەبینێ ـ ی تازە : کەنیزە کێکە هی کۆن ببینی ژنێکی پارێزگار دێنێ .

پەلامار :برِوانە (هورووژم)

پەنجەر، چوونە سەر ـ وەکوو شێتان : شەیدا و گراو دەبێ لەو هاتنە خوار : دووا کەوتن و لەناوچوونە .

پـەند ئامۆژگاری‌یە .

پەنیر : ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ ی ووشك : ماڵێکی کەمە لەکۆچی‌دا دەستی دەکەوێ . ـ ی تـەرِ : ماڵێکی زۆرە . نان و ـ خواردن لـە کۆچێکی ماڵێکی کەی بەخەمو پەرۆشەوە دەست دەکەوێ .

پتر چتی چاك ـ دیتن باشە . هی خراپیش خراپە کەلەلەش خۆی دا ـ ی ببینێ نیشانەی ماڵ و خواستەمەنیە .

پرچ : دیتنی - : پایە و خۆشەویستی یە بۆ ئەوانەی کەپرچیان هەیە وەکوو دەرویش و ژن . بۆدەڵەمەندانیش : ماڵە .

پرد : ابن سیرین دەڵێ : - لەخەوندا : پادشا یاپیاوێکی گەورەیە کەخەڵك بەهۆی وی یەوە بەئاوات دەگەن . بەسەر - دا تێپەڕێ لەلایەن پاشاوە بەرێزو پایە دەگا . بناغەدانانی - یادروست کردنی : پادشایی یەو ماڵێکی زۆرە . کە - بڕووخێ باری پادشا وەردەگەڕێ .

پریشك . - ی ئاگری : سەوداو دڵداریێتی سەرزارە کی یە

پزیشك ابن سیرین دەڵێ : کەبیبنێ - ێك نەخۆشێکی تیمار دەکردو چاك بۆوە : نیشانەی وەیە کەلەڕێگای خراپ یەکێکی دەباتەسەر رێگایەکی چاك . کەدەردی نەخۆشەکە گران تر بێ بەپێچەوانەیە .

پزشکێتی چاو . دیتنی پزشکی چاو باسی کار و ڕابەری یە لەو کارانەدا کەتێیدا وون بووە کەبیبنێ - ی دەکردو دەرمانی بۆ چاو باشبوو چاکەی خەڵکی دەوێ و ڕابەری گومڕاهان دەکات .

پزمل . ابن سیرین دەڵێ : کەبیبنێ زللەیەکیان لە - ی داو هەڵامسا : لەوی سوود دەبینێ ، کەئەوو کی زۆر لە - ی خۆی ببینێ : قەرزدار دەبێ . کەموی - ی خۆی بتاشێ : قەرزی بۆ دەدرێتەوە . ابراهیم دەڵێ کەبیبنێ لەخەونیدا زللەیەکی وای لە - ی درێ کەخووێنی لەبەر بڕوا : دوژمنایەتی لەگەڵ کەسێکی دەکات و زیانی لێ دەبینێ .

پسپسۆك ( تسبیح ) . ابن سیرین دەڵێ : لەخەوندابە - ناوی خوا ئەژماردن : نیشانەی وەیە کەلەڕاست فەرمانی ڕاستدا سەر شۆڕەوە لەخەم و خەفەتان ڕزگار دەبێ . کەبیبنی لەخەونیدا - ی بێ بوو تووشی خەم و

خەنەت دێ بەڵان لەلایەن خواوە دەرگای چاکەی لەسەر دە کرێتەوە

پشت . ـ دیتن : پیاوێکە کەهێزو پەنا و یارمەتی لێ دەخوازێ . کەبیینێ ـ ی شکاوە : ئەو کەسەی کەپشت و پەنایەتی لەدونیایەدا کۆچی دوایی دەکا . کەبیینێ ـ ی بریندار بووە : ئازار و دەرد دەگاتە کابرای ناو براو . کرمانی دەڵێ مۆرەکانی ( گرێی ـ ) هێزو منداڵە ، هەر ساخی ونەساخێکی لەواندابێ : تێخەی هێزو منداڵەکان دەگرێتەوە. کەبیینێ ـ ی بەهێزە : منداڵی قایم و بەهێز و ژیری دەبێ . کەبیینێ چتێکی لە سەرپشتی هەڵگرتووە بەقەد وی تووشی خەم و پەژارە دەبی . کەبیینێ مردووی بەپشتی هەڵدە گرێ : مێینەیەکی کەس مردوو بەوی دەبرێ کەپشتی وەر گەرێ : باری تێك دەچێ . جابر دەڵێ ـ ی دوژمن دیتن لەشەری وی دڵنیا بوونە . دیتنی ـ ی ژن : تێك چرنی گیتیەبە .اسماعیل اشعث دەڵێ : دیتنی ـ : برایە . کەبیینێ ـ ی شکاوە : برای دەمرێ .

پشکەڵ : لە ( ڕیخ ) دا بیدۆزەوە .

پشکۆژەی داران : بڕوانە گۆپکەی داران .

پشمین : ابن سیرین دەڵێ : کەبیینێ دەپشمێ و بڵێ سوپاس بۆ خودای : لە لایەن گەورەیەکی یەوە ئاتاجی پێك دێ . کەسێ جاران بپشمێ : باشە کەزۆر بپشمێ : ئاواتی بەدژواری پێك دێ . کەلەکاتی ـ دا خووین لەکەپۆی بێ : قسەی ڕەق و ناخۆشی پێ دەڵێن .

پشیلە ابن سیرین دەڵێ : دیتنی پشیلە لەخەونلدا پیاوی بەگێچەڵ و دزە کە ـ بچێتە مـالی وی : دزی دەچێتێ . کە ـ چتی لەمالی ویدا بخوا :

دز چتی لەماڵی وی دەدزێ . کەسێکی ـ بکوژێ : دوژمنی دە کوژێ یالەناوی دەبا .

پڵنگ . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەوندا : دوژمنی بەهێزوزۆرداره . کەبینێ لەگەڵ ـی شەڕی دە کرد : لەگەڵ دوژمنی خۆی شەڕ و دوژمنایەتی دەکا . کە ـ بەسەر ویدا زاڵ بێ : دوژمن بەسەر وی‌دا چیره دەبێ . کەبەسەر ـ دا زاڵ بێ : بەسەر دوژمن‌دا زاڵ دەبێ و ئابڕوو گەورەیی دەست دە کەوێ . کەسواری ـ بێ : مایەی پایەو بەختەوەریەو بەسەر دوژمنانیش‌دا زاڵ دەبێ . کەشیری ـی بخوات : ترسێکی لەدوژمنەوه پێ دەگاو ڕزگار دەبێ . ـ کوژتن : خێری تێدایە . کەپێست یائێسك یامـووی ـی دەستکەوێ یادابێنیانێ : هێندەی وانی مـاڵی دوژمنان دەست دە کەوێ .

پلووسك . کەبینێ ـ لەشووێنێکی کەوتە خوار : لەوشووێنی‌دا خووێن دەڕژێ کەبینێ بارانه دەبارێ و بە ـێ دا بێتە خوار : خـەڵکی ئەو وولاتی زیانیان پێ‌دەگا کەبینێ بەبێ بارانه ئاو ـ دەهاته خوارێ لەگەڵ خەڵکی ئـەو وولاتی بەبەزەیی دەبێ . ـ تێگرتن سووده . کەوتنی ـ ؛ زیانه .

پلیتەی هەڵکراو دیتن : وەکوو چرا خەڵکی لەدەوری دەئاڵێ و خزمەتی دەکەن . کەهەڵە کرابێ : بەپێچەوانەیە .

پۆڕ : ـ لەخەوندا : ژنی جوان و بەدکرداره لەگەڵ مـێردی ناسازگاره کەبینێ ـی هەیە یاداویانەتێ ژنێکی بەوجۆره دەوێ .
کە ـ لەدەستی وی بفرێ ؛ ژنه کەی لەلای نامێنێ یابەرەلا دە کرێ

پۆشەمەنی باران دیتن : سوودو ئلوبانک و خێرو چاکەیە .

پۆلا توانەنەوەی ـ : پایەداری و ویستی قایم و مرۆڤایەتی و گەورەیی یە
پوول : بڕوانـە پارە .
پۆلوو ( پەنگر ) . ـ ی ئاگری سوور : پیاوێکی گەورە لەوێ دەبینرێ .
ـ ی لەماڵی خۆیدا ببینێ و ماڵەکەی ڕووناك کردبێتەوە : کاریسازو دەوڵەمەند دەبێ. کوژاندنەوەی ـ : دوژمنایەتی و ناکۆکی ناوخانەوادە کۆتایی دێت .
پیاڵە . ابن سیرین دەڵێ : کەلەخـەونیدا ـ ی ببینێ : کەنیزەکە . کەلە ـ دا ئاو یاقەنداوی بخواتەوە . لەگەڵ کەنیزەکێ بەدەستوورێکی ڕەوایی دەست تێکەڵا و دەکاو منداڵیشی لێی دەبێ . ئەوەی کەلەپیاڵەکەیدایە بیرێژێ : منداڵەکە دەمرێ کەـ ی هـەبێ یابیدرێتێ : ژنێکی دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکرێ و منداڵێکی پارێزگارو ئایینداری لێی دەبێ کەئاوەکەی بێنێ و پیاڵەکە بشکێ : منداڵەکەی دەمێنێ و ژنەکەی دەمرێ . کەـ کەی بشکێنێ و ئاوەکەی بڕێژێ ژن و منـداڵەکانی دەمـرن .
پیاو . ابن‌سیرین دەڵێ : کە ـ یێکی ناسراو لەخەونـدا ببینێ : لەبێداریدا هەر ئەوە . . . کە ـ یێکی نەناسراو ببینێ : دوژمنی ویـیە . صادق دەڵێ : پیاوی پیر : فێڵ و فەرەجە . کەگەنجێکی ببینێ مـووی سپی بووبێ : نیشانەی ئایینداری‌یە . کەپیرێکی ببینێ مووی ڕەش هەڵگەڕا بێ : بەپێچەوانەیە . لەخەونـدا کەقـەی ڕەق بە ـ یێکی لاواز بڵێ : لەگەڵ پیاوێکی وا تووشی دوژمنایەتی دێ . کەلەخەونیدا ببینێ خۆی بۆتەوە منداڵ : کارێکی ناشیانـە دەکاو سەر کۆنەی دەکەن . ـ یێك کەببینێ ژنەکەی سیرەتی‌وەکوو پیاوانی هەیە : کوڕێکی دەبێ کەدەبێتە گەورەی ماڵێ کە ـ یێك ئەندامی شەرمی خۆی وەکوو ژنان‌ببینێ : شکست و نزمی و سـووکی‌یە .

بێ کەلەخەونیدا ـ یەکێ شکابێ یابراێتەوە. نیوەی سامانی لەناودەچێ. کەهەدووك ـ ی شکابێ ، هەموو سامانی لەدەس دەچێ یادەمرێ . هێندێکیش دەڵێن کەهەردووك ـ ی خۆی بەبراوی یا بەشکاوی ببینێ کۆچە کەبێی لەئاسن یالەمس بێ : ماڵو سامانیشی زۆرو پایەدار دەبێ . ـ ـ ی شووشە تەمەن کورتیومالّلەکیس چونە. کە ـ ی لەکار کەوتبێو سستو شەل بوبێ : نیشانەی بێهێزیبە لەهەموو ویستێکی خێروشەڕیدا کە ـ ی بەگوریس بەسترابێ . لەیەکێکیبەوە سودی بێ دەگا کەبێی ڕۆیشتنی نەبێوبەدار بەڕێگایەدا بڕوات : پشتی بەکەسێکی نەستوورەو ئەمەگی لێنایەنێ کە ـ ی بێشێ : تووشی دەردێکی دێت کە ـ ی بەداوەوە بێ یالەچاڵێکی ڕۆبچێ ؛ تووشیداوێکی یافێڵو فەرەجێکیدێ کە ـ ی هەڵخلیسکێ لەکاروباری ئایینو گێتی، دوودەکەوێو بەووتەیەکی خراپ دڵی دەشکێ کرمانیش دەڵێ : هەر دووك بێ دایك و بابە هەر کەم و کورێکی لەوانی ببینێ ئێخیەیوان دەگرێتەوە کەبێی زۆر بێ : کۆچ دەکاو دەولەمەند دەبێ، کە ـ ی خۆی وەکووهی گاو ووشتری ببینێ : ماڵی زۆر بێ، کە ـ ی خۆیوەکووهی کەروێستر ببینێ هێزوپایەی بتر دەبێ . کە ـ ی خۆی وەکوو چەنگاڵی باڵندان ببینێ هێـزو ماڵی زۆر دەبێ وەبەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ .

بێ بەند ( بەت یازنجیری بێ ) : قسەی خۆش و ناسکە یاماچەکە لەمنداڵ و خزمانی خۆی بێدەکات وەیا بەدۆستێکی خۆی دەدات . ـ ی زۆردیتن : ماڵو بەهرەی رەوایە کەببینێ ـ ی زۆرهەیەو هەمووی دا بەخەڵکی و یالێی بزر بوون : ماڵ و بەهرەی لەدەست دەچێ .

پێچە ( ڕوو پۆش ) ابن سیرین دەڵێ ! دیتنی ـ لەخەوندا بۆ ژنان مێردە بۆ پیاوانیش نیشانەی ژنە .

پێچ : بڕوانە ( مەندیل ) .

- خوواریی لەمێردی دوور دەکەوێتەوە . کەبینیی -ی کەمێك سووتاوە مێردەکەی وی ترسی لە دادبرس ( حاکم ) هەیە . پێچەی هەر ژنێکی سەوز یاسپی بیی : مێردەکەی ئایینداره . کەسووربیی : مـێردەکەی دلْ تەڕه . کەزەرد بیی نەخۆشی‌یە .

پیر . پیرەمێرد : باری بەرزو پایەی بڵندە. پیرەژن : قرچۆکی‌و چرووکی ڕووتیی دەکات . پیر بوون : هەوای گەنجیەتی کەوتنە سەرە .

پیرۆزە، ابن سیرین دەڵیی ؛ لەخەون‌دا دیتنی - : پیرۆزی و سەر کەوتنە . کە -ی لیی وون بیی ئاواتی پێك نایەت .

پیری . کەسێکی لەخەون‌دا بینیی کەپیر بووەو سەر و ڕیشی سپی بوونە : ئابڕووو ڕێزی دەست دەکەویی . کەپیرێکی نەناسراو بینیی کەشادمانە لەوەوە چتێکی بیی دەکات ، کەمۆن و گرژ بیی : بەپێچەوانەیە . پیرێکی بینیی کەجێیڵ بۆتەوە : لەپایەو گەورەیی وی کەم و کووڕی پەیدا دەبیی‌و بەفیـز دەبیی . لاوێکی بینیی کە- بووە خۆشەویست و گەورە دەبیی .

پیست . -ی لەشی مرۆ لەخەون دا خۆ ڕازاندنەوەو کەیخودایی‌یە . کەپێستی مرۆ بتـراشی : ماڵ و بەهـرەیە . کەسێکی -ی لەشی خـۆی لێکراوەو بەفڕیی دراوی وەیا کەوتوویی بینیی : ڕازی وی ئاشکراو ماڵیشی لەناو دەچیی -ی خۆی شـین یا ڕەش بینیی : خەفەتە . -ی ماڵات و ئاژاڵان : ماڵـەو ڕۆزی‌یە .

پیسایی . - مرۆڤ ماڵی ناڕەوایە . کەبینیی لەناو جێگای نوستنی‌دا ڕیاوە هێندێك لەماڵی خۆی دەدا بەخێزانی کەلەشی خـۆی لەپیسایی یەوە بدات ، دەکەوێتە ناو گوناهانەوە . کەلەناو - دا بڕوا یا تیی‌یدا نقووم بیی : لەپادشاوە خەم و خەفەتی بیی دەگا کەپیی لیی بنیی‌و یاتیی‌وە بچیی : زیانی بیی دەگا .

یسی دیتن لەخەوندا ـ دەولەمەندی و سامانە . کەلەشی خۆی بەیسی ببینێ
هێندەی وی ماڵ و بەهرەی پێ دەبڕێ . هێندێکیش دەڵێن ـ ی، میراتە
پیشە ـ ابن سیرین دەڵێ : کەببینێ ـ ی خۆی واز لێ هێناوەو ـ یەکی باش
تری گرتووە : کاروباری باشتر دەبێ . کە خەریکی چەند ـ یەکی بێ
کەباش بن باشـە .

پێشەرگانە ( ئاستانە ) . کەبسووتێ یاتێکچێ : کابانی دەمرێ یابەرەڵادە کا

پێشنوێژ : کەلەخەوندا ـ ببینرێ : سەربڵندیو ئابرووە . چێتێکی بەدەی
بە ـ یالەگەڵ وی چوونە ناو ماڵێکی یا ـ چێتێکی بەدا بەوی کەلەگەڵ
خواردەمەنی بیخووا : خەفەتـە .

پێشنوێژەی . ـ بۆ گەلێکی کردن کەخۆی پێشنوێژ نەبێ : گەورە دەبێ
پادشا بەیەکێکی بلێ ـ ی بۆ گەل بکەو بیکات : دەبێتە میروخونکار .

پێغەمبەر . لەخەونیدا ببینێ کەبۆتە ـ : لەپێشدا توشی ئازار دێو لەدوایەدا
بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێ .

پێشکاری ( قەراشی ) . کەببینێ بۆتەپێشکار : نیشانەی ژنێکی دەلاڵە کەبۆ
پیاوان ژنی بخوازێ . کەببینێ ـ دەکا : بۆخۆی یابۆخەڵکی ترژن دێنێ
پێکەنین . ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەوندا ـ : خەم و خەفەتـە . ـ بەقاقاوە :
خەمێکی گەورەترە . بەلان هی لە سەرەخۆ : خەمێکی کەم تـرە .
لەلای کرمانی : بەئاوات گەیشتنە . لەلای صادقی : منداڵی باشە .

پیو : خواردنی ـ خێرو سوود و هەرزانی و ماڵە .

پێنووس ( قەڵەم ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا : فەرمانی خودایە
لەوانە کاروباری لەپادشایەکی هۆشیار بکەوێو بۆی پێك بێ کەببینێ
ـ ی بەدەستەوە گرتووە : منداڵێکی زاناو هۆشیاری دەبێ . کەبە ـ ی
زانیاری فێربێ : ماڵی دەستدە کەوێ . کەببینێ ـ ی هەیە یاداویانەتێ :
فێری زانست و هونەر دەبێ و بەئاواتیش دەگات . کەچتی باش بە ـ
بنووسێ : باشـە و هی گەندیش گەندە . کەببینێ بـەدوو پێنووسانی
دەنووسێ : ئاوارەیەکی لەدوورەوە دێتەوە .

کەلەدەستی‌دا قەڵەم بشکێ و خۆی لـەزانایان بێ : بێ ڕێز دەبێ و لە کاروباری‌دا ڕەنەق نامێنێ . کەـبنوسێ‌و ‌بیخوێنێتەوە : نیشانەی مەرگە

پیواز . کرمانی دەڵێ لەخـەوندا ـ : ماڵی نارِەوا و ووتەی ناخـۆش و ڕەقە . خەون دیتوو ڕاست و داوێن پاك بێ : خـۆی لەوانەی سەرەوە دەپارێزێ . کەناپاك بێ : بەپێچەوانەیە بەتایبەتی کەپیوازە کە سـوور هی کوڵاو خواردن : لەچتی نارِەوا دوور کەوتنەوەیە .

پێوانە . کە ڕبە ، کۆل ، ئەیارو چتی تر بێ . ابن‌سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەونـدا ڕێك و پێکی کاروبارەو مرۆیەتی‌یە لەگەڵ خەڵکی . کەپێوانە ڕاست بێ . هێندێکیش دەڵێن : نێوانـگەرێتی (میانجی) یە . کەسێکی ببینێ کەچتێکی بە ـ دەپیوێ : ئەگەر خاوەندی هـونەر و زانستە : دەبێتە قازی کەوانەبێ تووشی محاکـەی قازی دەبێ . هێندێکیش دەڵێن : پیاوێکی ڕاست گۆیەو دادی مرۆڤـان دەدات .

پێوەند . ابن سیربن دەڵێ ؛ کە ـ ی لەپێی خۆیدا ببینێ : ترس و هەراسە کرمانی دەڵێ : کەببینێ ـ ی لەپێدایەو ئارەزووی کۆچی هەیە لەو کۆچەدا زۆر دەمێنێتەوەو لەوێ‌دا جێگیر دەبێ . ، هەرچەندێکی ـ ە کەی ئەستوورو درێژو قایم تر بێ . لەوێ پتر دەمێنێتەوە . جابری مغربی دەڵێ نەخۆش ـ ی لەپێی‌دا خـۆی دا ببینێ : لەو ڕەنجەی ڕزگاری دێت . کەبادشا ـ ی لەپێی خۆی‌دا ببینێ ، پادشایەتی بە کەی پابەدارەبێ کرمانی دەڵێ کەـی دارینە لەملی خۆیدا ببینێ چتی بێ ئەـپیر ـ راو ( أمانة ) ی لەلایەو نایداتەوە کەـە کەی گەردنی زیو بێ : بەهۆی ژنی‌یەوە تـووشی ئازاری دێ . کەـ مس بێ لـەکاروباری‌دا ڕەنج دەبینێ کەـ ی دەستی بشکێ ترسی زیان هەیە . کە ـ ی لـەپێ داکەنن لەکاروباری پادشاو خەفەتان ڕزگار دەبێ کەچووار ـ ی لەپێدا ببینێ چووار کوڕی دەبێ دەڵێن کەزێ، بێ ژنی دێنێ و پاگراوی دەبێ .

ـا : بڕوانە ( نۆبەتێ ) .

ابووت : دیتنی ـ لەناو خانەوادەدا ئەوانە دەگەیەنێ : مندالێ بوونە کەیف خۆشی نهێنی و پەنهان ، نەخۆشی پڕ ترس ، دوژمنی نهێنی .

اج کەشا بی‌بینێ : ملك و سامانە ، ژن ـی ببینێ : مێردە ، بۆخەلکی تر کاروبار چاکیە . کە ـی زێڕو گەوهەر بەندی لەسەربێ : ڕێزو پایەی گەورە دەبێ بەڵاں لەلایەن ئاینەوە سست دەبێ کەژن ئەوخەنە ببینێ مێردێکی گەورە دەکا . ـ لەگولێ : هیوای با بردوە . ـ لەناسن ڕەنجێکی سەختە ـی گولێ کەبۆ سەر تەرمی دەبەن : خەم و خەفەتە . کەپادشا ـی بداتێ و لەسەری بێ : ژنێکی جوانو دەولەمەند دێنێ . کەسێکی ببینێ کە ـی پادشای لەسەری خۆی ناو کەوتو شکا : ژنەکەی بەرەلادەکا

ار . ـ لێدان : درۆو ووتەی وێ نەچووە و بەدرۆ بەخەلکی هەلدەلێ !! کەسێك لەلای وی ـی لێ بدا ووتەی وێ نەچوو و درۆ دەلێ !. تار لەگەلێ چەنگ و چەقەنەو بلوویری لێ بدرێ خەمو کارەساتە تووشی دانیشتەانی وێ دێ .

تاریکی : سەر لێ شێوانو گومڕاهی‌یە خەمو خەفەتە . ـبکرێو پاییدرێتێ سەری لێ دەشێوێ کەتاریکی ڕووناکی بەسەر دابێ : واز لەکاری ناپەسند دێنێ . کەببینێ هەوا تەوش و تاریك بووە خەلکی وێ تووشی خەم و خەفەت دێن و کاروباریان دەبەسترێ . کەهەوا ڕووناك بێ لەپرێکا ببێتە تاریکی‌و هەوری پەیدا بێ : مەرگی کوتڕو پرە .

تازە : ابن سیرین دەلێ ؛ چتی تازە لەخەون دا دیتن باشە . کڕینو فرۆشتنی جلکی ،ورێش هەر باشە .

تاس دیتنی ـ نیشانەی کەنیزەکێکی گچکەیە ، نۆکەرە کەببینێ ـی هەیە کار بەکەرێکی دەباتە مالەوە یا کەنیزەکێکی دەکرێ کەهە کەی لێون بێ

ئەوانی لێ جووێ دەبنەوە کرمانی دەڵێ کە - ی پڕ ئاوی هـەبێ و بیخواتەوە : لە کەنیزە کەی منداڵی دەبێ . کە - ە کە بشکێ و ئاوە کەی بێنێتەو کەنیزە کە کەی دەمرێ و منداڵە کەی دەژێ .

تاڵان . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا ماڵی وی تاڵان کرێ : خەم‌و خەفەتە کەماڵ‌و سامانی یە کێکی تر بەتاڵان ببات : تووشی خەم و خەفەت دێ بەزیانەوە . دیتنی - : گۆڕان بەسەر ژیان دێ ، گرفتاری پارەیە ، بەد بەختی‌و پەرێشانی‌یە . دیتنی - و کوژتار ( هاوکاری لەوان‌دا کردن ) : سەرەخۆشی ( تعزیە )یە لەخانەوادەدا .

تانە . ابن سیرین دەڵێ ؛ - لەسەرچاوی بێ بەوجۆرە کەنەیبینێ : کەم‌و کوڕی دە کەوێتە ئایینی‌یەوە بەتایبەتی کەچاوی شین بێ ، بەڵان کەسەوز بێ : تووشی کاری نارەوا دێ . کەببینێ -ە کەی لەسەر چاوی لابراو چاوی کراوە پەشیمانی یە هێندێکیش دەڵێن منـداڵی لەنەخۆشی چاك دەبێتەوە ، یا کەئاوارە بێ : دێتـەوە .

تاوە ابن سیرین دەڵێ ؛ - لەخەوندا دیتن : نۆ کەری ماڵ‌یە کەماڵی‌خاوەند ماڵ لەمنداڵی خۆی‌و خەڵکی تر دادەچووێنێ . کەـیە کی تازەی هەبێ یایە کێك بیداتێ : نۆ کەرێکی باشی دەست دە کەوێ یا لێی جووێ دەبێتەوە . کەلە -دا چتێکی لێ نابێ : نـۆ کەرە کەی باش دەبێ . کەلە ناو -دا چتێکی بخووات لەنۆ کەرە کەی بەهرەی دەست دە کەوێ . کەخواردنە کە ترش و ناخۆش بێ : خەم و خەفەتە .

تاووس : جووانی‌و شەباڵی خۆبەستدانەیە کە - دەنگی لێ‌بێ : بارانێکی سەختە . ابن سیرین دەڵێ ؛ تاووسی نێر . پادشایە . کە - ی نێر ببینێ : لە پادشای مـاڵ و پایەی دەست دە کەوێ کەببینێ - ی مێ‌ی هـەیە : ژنێکی جوان دێنێ‌و لەوەوە ماڵ‌و منداڵی دەست دە کەوێ . دانیالدەڵێ - لەخەوندا ژنێکی سەر بە گێچەڵە کە - یێکی نێر لە گەڵی باخووێ : وولاتێکی دەست‌دە کەوێ - لەماڵی ویەوە بفرێتە دەرەوە ژنە کەی بەرەڵا دە کا جابر دەڵێ کە -ی بکوژێ کچێنی کچێکی گەند دە کا .

تەبەك . ژنێکی پارێزگارو خەم خۆرە کەماڵی خەون دیتوو ڕەنێو دێنێ و ڕێگای باشیش نیشانی خەڵکی دەداتو لەخراپەو شەڕ پەشیمان دەبێتەوە کرمانی دەڵێ ؛ کەبینێ ـ ی وی شکا یاوون بوو : ژنەکەی لێ جووێ دەبێتەوە یادەمرێ .

تەبالە : بڕوانـە پیسـایی .

تەبمی ( سوء الهاضمة ) . ـ لەخەون دا : بار شێوانە .

تەپە : پایە بەرزێتی یە . کەلەسەر ـ یاقیتکەی چیایـەکی دانیشتبێ : ئابڕوو و پایەیەکی زۆری دەست دەکەوێ . کەلەسەر ـ ی ڕاوەستابێ ؛ بـەو زووانە گەورە دەبێ و ماڵ و ڕێزیشی دەست دەکەوێ . کەبینێ ـ ماڵ و مڵکی وی یە : پیاوێکی گەورە ڕقی لێ هەڵدەگرێ و ماڵ و سامانی لێ دەستێنێ . کەلەسەر ـ بکەوێتە خوارێ یالەوێڕا هەڵیدێرن : بەهۆی مردنی پیاوێکی گەورەوە بێ ڕێز دەبێو زیان دەبینێ . کەبەڕەنج سەر کەوێتە سەر ـ یەکی : خەم و خەفەتە .

تەپڵ : وەڵامی ناخۆش و ووتەی درۆیە ، کاروباری ڕەوشەن و ئاشکرایە ئەوانە ئێخەی تـەپڵ لێدەری دەگرنەوە . کەبەهەوای دەنگی ـ ە وە هەڵپەڕێ و بێ بەزەوی دادا : خەم و کارەساتە . کەخۆی ـ ی لێبدا : کار یاووتەی نابەسندی لێ ڕوودەداو پێی سووك دەبێ .

تەپ و مژ کەهەموو شوێنێکی بگرێ : گومڕاهی یە . بـەڵان کەڕوون بێتەوە کاری باش دەبێ کەبینێ ووڵات ڕووناکەو بـووبـە ـ : مەرگی کوت و پڕە .

تەخت : ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ لەسەر ـ دانیشتووەو چێتێکیشی لەسەر ڕاخستبێ : دەچێتە کۆچ (سفر) . کەچێتێکی لەسەر ڕاخرابێو لەسەری نوستبێ : گەورەیی دەست دەکەوێو بەسەر دوژمنانیدا زاڵ دەبێ لەبەر ئەوەی کەدووزمانە لەئەنجام دا لەدار دەدرێ . کەبینێ ـە کە شکاوو ئەویشی لەسەر کەوتە خوارێ : باری دەگۆڕێو ڕوو لەنزمی دەکات .

تەختە. کە ـ بەسەر ئاویدا بڕوات : لەگرفتاری ڕزگاری دێت .
ـ ی زۆر : هۆی ساخی و ڕزگاری‌یە .
ـ ی شەترنجێ . ـ بینێ : ژیانێکی ڕێك و پوختی دەبێ .
تەختی ڕەوان : نەخۆشی یەکێکە لەخزمان ، مەترسی تاکە سەربازێکە .
هەڵگرتنی ـ مەترسی و سامێکی بێ ئەندازەیە . کەڵکەڵەی ترسێنەری وەڕاست گەڕاوە .
تەرازوو : داد پرس ( قاضی )ە . کەبینێ ـ ی تازەی‌هەبوو یا کەسێك دایبویە لەو ناوەدا داد پرس و پیاوێکی چاك هەیە . لنگە تەرازوو : گووێی دادپرسی‌یە . بەردی تەرازوو : داد و مـرۆڤایەتی‌یە . بەرد لەناو ـ دا : گێژەو کێشەی لای داد پرسە . کە ـ ی راوەستابێ و بێ میـل بێ : داد پرس بەداد دەجووڵێتەوە . کە ـ ڕاست نەبێ : ئەویش ناڕاستە . شەهێنی بشکێ : داد پرس دەمرێ .
تەڕە . هەرچیەکی تامی ناخۆش و تـاڵ بێ : زیان و ناخۆشی پێوەیە .
ـ خواردن . خەم و خەفەت و ناخۆشی و نابووتی‌یە .
تەڕەفرۆشی . ـ کردن . قازانجـە . خوواردنی : خەم و خەفەتە .
تەرزە . ابن‌سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەوندا دیتن : ئازارو تەنگانەیە مەگەر کەم‌بێ کە ـ لەکاتی خۆی دابێ : بـەهرەو گوشادی ڕوو لەدانیشتوانی ئەوێ دەکات . ـ ی بێ وەخت : خەم و خەفەتە .
تەرس ، تەرسەقول : بڕوانە ( ڕیخ ) .
تـەرم ( جنازە ) . کەبینێ ـ یان دەبرد : بەسەر چـەند کەسێکی‌دا دەبێتە فەرملن ڕەواو پێـدادیشیان لەگەڵ دەکات . کەبینێ خۆی مردووە و دەیبەنە سەر گۆڕستانێ : پایە و قەدرە . کە ـ ی هـەڵگرێ و بیبات : سوودی لەگەورەیێکەوە پێ دەگا . کەبینێ چەند کەسێك لەپشت ـ ی وی‌یەوە دەڕۆیشتن و بۆ هـەوا بـەرز بوونەوە : پیـاوێکی گەورە

لەسەفەری . کە ـ ی بکەوێ یافڕێ دڕێ : بێ ڕێز دەبێ .

تەسبیح : بڕوانە ( بسبسۆك ) .

تەشت . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون‌دا کەنیزە کێکە کاروباری ماڵێ بەوی دەسپێرێت ، کرمانی دەڵێ : ژنێکی خـزمەت کارە . کە ـ ی هەبێ یا بیدەنێ یابیکڕێ : ژنێکی کارەکەر دێنێتە مـاڵی و یا کەنیزە کێکی دەکڕێ‌و مارەی دەکات . کە ـ ە کە بشکێ یابڕزێ : کەنیزە کە کە هەڵدێ تەگبیر . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەسێکی لەخەونی‌دا ـ بکا لەشـەڕی دوژمنان دڵنیا دەبێ‌و دەرگای خێری لەسەر دەکرێتەوە .

تەڵاق : بڕوانە ( بەرەڵا کردنی ژن ) .

تەماتە : بڕوانە ( باینجان ) .

تەناف : بڕوانە ( گوریس ) .

تەنەکە ـ ی مەی : جێژنەو میوانداری‌یـە . ـ ی ڕۆنی : ناوبانگێکی بێ ڕەنگ و بۆیە . ـ ی ئاوێ : لەکۆچی دەریایە خۆت دوورخەوە . ژن بی‌بینێ : بێ ئابڕوویی و بێ ناموسی‌یە .

تەنبوورە : ابن سیربن دەڵێ : کەبینێ لەماڵی وی‌دا ـ لێ دەدرێ وەڵامی کارەساتە . کە ـ بشکێ : پەشیمانی‌یە . کەنەخۆش لێی بدا : دەمرێ .

تەنوور گەورەتری‌یە ، کوویخای ماڵی‌یە ، یا کابانی ماڵی‌یە . کە ـ ی بەدەستەوەبێ : نیشانەی لەش ساخی و کاروبارێکی خاوەندماڵە کە ـ بکەوێ و تێك‌چێ : نیشانەی ڕەنج و کارەسات و نەخۆشی خاوەندماڵە کە ـ نانی ببرژێنێ : ڕۆزتی‌یە .

تەنگانە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ لە ـ ڕزگاری هات و کەوتەخۆشی و گوشادی : دیارە کاروباری ڕوولەخۆشی دەکاتو بەئاسوودەیی‌لەڕەنج ڕزگار دەبێ ، بەڵان کەواش نەبێ وانیە . جابر دەڵێ : کەلەجێگایە کی تەنگ دا گرفتار بێ ؛ تووشی تەنگانەیە کی دێتو ڕزگاری نابەت .

کەبۆخواردەمەنی تووشی - بووبێ : ڕۆژی بەسەختی دەست دە کەوێ تەنگی و تەنگانە باش نین .

تەنگی : بڕوانە ( تەنگانە ) . تەنیشت : بڕوانە ( کەلەکە ) .

تەواو بوون : هەر کەسێکی ببینێ کە کاروباری بەڕێکی تەواو بووە : باری دە گۆڕێ . کەببینێ تەواو نەبووە : لەوانەیە تەمەنی کۆتاو پێداد بێ و تۆڵەشی لێ بسێنرێتەوە .

تەوور : تۆ کەرێکە کارێکی پێ بسپێرێ و چاکی نەکا تاجارێکی تـر پێی نەکەن . جابر دەڵێ ؛ لەخەوندا - پیاوێکی ترسەنۆکەو هاودەمی پیاوانی خراپو دووزمانە کەببینێ -ی لەدەستدایەیا کەسێك داویەتێ لەگەڵ پیاوێکی وەکوو سەرەوەدۆستایەتی پەیدا دەکا . کە -ی بشکێ ئاکامی دەگاتە سەری و دەمرێ .

تەورات . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ -ی دەخوێنێ : هێزی دەستدەکەوێ لەپیاوێکی گەورەوە . کەببینێ -ی فـێری کەسێکی دەکرد : لەوەوە خێرو سوودی پێ دەگا .

تەویلە -ی ئاژاڵ ومالاتان : داوێنپیسی و بێ ئابڕوییو ڕیسوایی وبێزێزیە تەیلەسان . ابن سیرین دەڵێ ؛ پایەو گەورەیی یە . کەببینێ - ی خاوێنی هەیە دڵ فراوانی و مرۆڤایەتی دەکا .

تەحت البحری : بڕوانە ( ژێر دەریایی ) .

تڕ !! - کەنەن لەنێو خەڵکیدا گووێیان لێبێ : ووتەیەکی ڕەقی لەزاری دێتە دەرێ و پێی ڕیسوا دەبێ . کەسێکی -ێکی دەنگدارو بۆگەنی لێ بقەومێ : کارێکی وای لێ ڕوو دەدا کە خەڵکی لێ توورە بێ و بەسەریدا بـرۆن . کەدەنگی هەبێ و بێ بۆن بێ : لەکاری گەنـە دوور دەکەوێتەوەو خێریشی لەدووایە .

ترسان : ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا - : هێمنو دڵنیاییو پیرۆزی یە . کەسێکی کەلەخەونیدا ببینێ کەدەترسێو بەڵان نازانێ لەکێ دەترسێ . لەو کەسەی

کەلێ ی دەترسێ تووشی ناخۆشی دێ . کەلەوزیاتر لەجانەوەرێکی بترسێ :
لەنزیکانی خۆی زیانی پێدەگا .

ترش . - خواردن لەخەوندا ; خەم و نیگەرانی یە بەتایبەتی میوەی ترش .
کەیەکێك چێتێکی ترشی بداتێ : لەوەوە خەم و خەفەتو ئازاری پێدەگا
کەخۆشی هی وابدا بەخەڵك . خەمو ئازاری پێدەگەیەنێت خواردنی- بێ سودە

ترنج . دانیال دەڵێ ؛ - هەرچەندە بەرەنگ زەردیشە بەلاّن تام و بۆنی
خۆشی هەیەو بەدیمەنیش جوان و خاوێنە دیتنی لەخەوندا باشە ، یەك
یادوو یاسێ - ان لەخەوندا دیتن نیشانەی منداڵ بوونە . کەزۆر ببینرێ
ماڵ و بەهرەیەکی زۆرە . -ی سەوز دیتن لەهی زەرد باشترە . کەسێ
هەبێ یایەکێك بیداتێ ; لەگەڵ وی دەبێتە دۆست . کەیێکی لەکەناری
خۆی ببینێ منداڵێکی جووانی دەبێ .

ترێ : رژدی و چاو چنۆکی یە . خوواردنی - هەوا و هەوەس پەرستی یە .
دیتنی - ی گەیشتوو ; بەختەوەری یە بەلاّن هی گەیشتوو هەوپاو هومێدی
نەپشکووتووە . -ی رەش ; خەم و دوژمنایەتی و ترسەو بەربەرەکانی یە
لەکاتو بێ کاتدا . - لێ کردنەوە : سوودو کەلکێکی زۆرە . -ی سپی
لەکاتی خۆی دا خواردن ; مـاڵ و بەهرەیە ، لەبێ کات دا : زیانە . هی
سووریش وەکوو -ی رەش وایە . - کوشـین و شیرەکەی لەکوو پە
بکرێ ; ماڵی زۆر لەگەوران دەست کەوتنە . هێندێکیش دەڵێن ترێی
رەش و سپی لەکاتو بێ کاتدا منداڵی باشە ، ماڵی رەوایە ، زانیاری یە
دەڵێن کوشینی - ; ماڵی پرپیت و پێزە ، بەهرەو گوشادی یە ، لەقانی و
فری رزگار بوونە . - لەناو تەشتی دا کوشین خزمەتی ژنێکی گەورە
دەکا . کەلەکاسەدا بکوشرێ : خزمەتی لەچەران دەکا .

ت ریاك . دیتنی - : خەم و خەفەتە خوواردنیشی : خەم و گێچەڵ و کارەساتە
لەسێکی لەبەر نەخۆشی - بخرا رزگاری یە لەخەم ، بەپێچەوانە خەفەتە

تس . لەخەوندا ـ کەندن : ڕاز ئاشکرا بوونە ، یاوونـەیێکی وادەر کێنێ کەئابڕووی بیات .

تف . ابن سـیرین دەڵێ ؛ لەخەون‌دا ـ فڕێ دان : نیشانەی وەیە کەووتەی نارەوای لەزار بێتە دەرێ . ـ بـۆ هەر لایە کی فڕێ بدا : قسە لەبابەت خەڵکی وی‌وە دەکات . ـ بەدیواری دابکا : ماڵی خۆی پێجێ دەچوێنێ ـ بەزەوی داکا خـۆی لەناو دەچێ . ـ ی بەدیواری داکا : پەیمانی دەشکێنێ و سووێندیش بـەدرۆ دەخوا کرمانی دەڵێ ؛ ـ ی گەرم : تەمەن درێژی‌یەو هی‌ساردیش مەرگە . ـ ی ڕەش : خەفەتە . ـ ی زەرد نەخۆشی‌یە . کەببینێ تفی لێ دەکەن : تانووت لەماڵ و منداڵی دەدەن ـ ی خووێناوی : ماڵی نارەوا خواردنە .

تفەنگ . دیتنی ـ تـووش بوونی پایەیەکی بەرزە . ـ باوێژێ : وەلامی ناخۆشە . ئاوێژتنی ـ : پیلەو کێشە کێشە لەسە ماڵ و سامان .

تفنك : بڕوانـە کەپۆ .

توو ( مـەنی ) منداڵە ، ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخـەوندا : ماێکی پایەدارە کە ـ لەسیرەتی بێتە دەرێ : هێندەی وی، ماڵ دەستدە کەوێ .

توو . ـ ی سپی و شیرین خوواردن : ڕۆزی‌یـە لەکاتی خۆیدا ابن سیرین دەڵێ ؛ بێ وەخت : خەمو خەفەتە . کرمانی دەڵێ ؛ کەببینێ ـ ی شیرینی دەخووارد : لەمرۆڤێکی ڕەندو جووامێر بەخشش و بەهرەی دەست دەکەوێ . ی ڕەش‌و بێ تام خواردن : خەم و خەفەتە . تووديتن باشترە

تۆبە : بڕوانە پەشیمانی .

تۆپ (چەك) . دیتنی ـ : پاداش و تۆڵەی چاکەیە بەشێوەیە کی دڵنیایی بیستنی دەنگی ـ : مـردنی یە کێك لەخزمانی ، ئاوێژتنی سێ تۆپ : سەر کەوتن و پیرۆزی‌یە کی گەورەیە .

تۆپێن : تێشكانێكی كەمە لەئەنجامی گوونێ نەدان و خـاوێنی دا دیتنی

تۆپێنكاران : ڕووداوێكی كەمە كەجێی مەترسی نەبێ .

تۆو . ـ ی ترش و تاڵ و ناخۆش ; خەم و خەفەتە ! كەبخورێ خراپتریشە بەڵان ئەوەی كەتامی شیرین و خۆش بێ كەمێك سوودی هەیە . جابر دەڵێ دیتن و خواردنی ـ ی : باشە .

توانەوە : پێشكۆیی و خەونێكی خراپە لەهەموو بارێكی دا .

تووتن . دیتنی ـ كەیفخۆشییەكی دەمەكی یە ، كێشانی ـ دۆستایەتێكی سادەیە

تووتی . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخـەونـدا : منداڵی نێر كەرە . كەبینێ ـ یە كە لەدەستی ویدا فڕی ; منداڵە كە كۆچ دەكا . كەـ لەگەڵی باخوێ : چتێكی وا دەكا لەخەڵكی سـەرسام بكا . دیتنی ـ مێ : كچە . هی نێریش پیاوێكی ئایندارە . یانۆ كەرێكی پارێز گارە ..

تووتیا : لەلای كرمانی ماڵە . كەبینێ ـ ی لەچاو دەكێشێ و مـەبەسیشی ڕووناكی چاوە نیشانەی ئاینداری بە كەمەبەسیشی وانەبێ : خۆی بەدرۆ بەئایندار نیشان دەدا . جابـر دەڵی كەسێكی ببینێ كە ـ یان داوەتێ هێنەی وی ماڵ دەسـتدە كەوێ . كەـ ی بخوات : هەژارو دەستكورت دەبێ . ـ لەبن هەنگڵ نان بۆ بۆنخۆشی : خۆنووواندنە .

تۆوچێن : زۆر باشە پێشكەوتنی كاروبارە ، پێش بینی یانی بـڕسوودە ، بیر لەدووا ڕۆژ كردنەوەیە .

توور دیتن و خواردنیشی خەم و خەفەتە . هەر كەسێكی توورێ بداتێ خەم و خەفەتی لەوەوە پێدەگات . كەخۆی ـ ی بدا بـە كەسێكی تر یا فڕێی دانە دەرێ و لێی نەخووا لەخەم و خەفەت ڕزگاری دێ .

توورە كەو خورجێن ی بڕ ; ئاسوودەیی و گوشادی یە . بەتاڵ قەرزدارییە

توورە كەی سـەری وولاخان . دیتنی ـ كەتازە بێ خێرو سوودە كە ـ ی هەبێ یایە كێكی بیداتێ : سودو كەلكە لە ناوچوونوبزربوونی بەپێچەوانەیە

تۆز كەبینێ ـ لەسەر چتێكی نیشتووە : بەقەد ـ كەی ماڵی دەست دەكەوێ ابراهیم دەڵێ ، كەببینێ ڕووی تۆزاوی بووە تووشی ڕەنج و ئەشكەنجە دێ .

کەتۆزی لەسەر زەوی خۆی ببینێ : هێندەی وی مــالێ دەستدە کەوێ کەلەنێوانی زەوی‌و ئاسمانێ دابگرێ : نیشانەی وەیە کەکارێکی نهێنی لەوشووێنی‌دا هەیە خەڵکی نازانن کەچۆن لەژێر باری بچنە دەرەوە .

تۆشکەی سەری مرۆیان : ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـ لەسەری هەڵوەری لەیە کێکەوە زیانی پێدەگات . کەببینێ ـ ی لەســەری دانەما : لەزیان هێمن‌و دڵنیادەبێ کەلەگەڵ ـ توو کی‌سەریشی‌هەڵوەری : پێخەفەتدەبێ

تۆق . کە ـ ی لەپێی خۆیدا ببینێ : ترس و هەراسە . کەدوو ـ ان لەپێی خۆیدا ببینێ : پایەداری‌و دڵقایمی‌یە لەئاین و گیتی‌دا . کەببینێ خەریکی کۆچێکی‌یە بەڵان ـ ی لەپێدایە : لەو کۆچە زۆر دەمێنێتەوەو نیشتەجێ دەبێ . نەخۆش ـ ی لەپێی خۆیدابینێ : چاك دەبێتەوە . پادشا لەپێی خۆیدا ـ ی ببینێ لەپادشایەتی دا دەمێنێتەوە . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ گومراهی و ئارەزووی ناڕەوایە . کەسێکی تۆقی لەگەردنی خۆیدا ببینێ: بەگومراهی‌دەمرێ . کەلەپچەی لەدەستبێ : ڕژد بخیلی‌یە

تۆ کەتان : دیتنی ـ : خەم‌و خەفەتە . خوواردنیشی کەم بوونەوەی ماڵە .

تونکەی پڕ : مەستی‌و هەواو هەوەس پەرستی‌یە . ـ ی بەتاڵ : خەموخەفەتە

تیانچە (تیانە) : کابانی ماڵی‌یە . کە ـ ی نووێ بکڕێ یایە کێکی تر بیداتێ ڕووشەیێك بەسەر کابانی ماڵی دێت . کەخووارەمەنی لەناو تونکەی دابێ : لەلایەن کابانی ماڵی‌وە سوودی پێ دەگا . چتی ناخۆشی تی‌دا بێ : لەوەوە زیانی پێ دەگا .

تیر . دانیال دەڵێ ؛ پیاوێکی ڕاستبێژو سوود گەیێنە . لەلای هێندەکانیش پاشملە (غیبة)ە . کەیە کێکی تر بەرِ کەوە بۆی باوێ ؛ وەڵامێکی بۆدێ جابر دەڵێ ؛ دیتنی ـ هێزە لەگوفتــارێکی دا کەلەڕاست دوژمنان دا

دەیلێ بەتایبەتی کە ـە کە بۆلاو ڕووناك بێ . هی شکاوو ژەنگاوی وانیە دانیال دەڵێ : دیتنی ـ لەخەون دا مەرگێکی بڕ مەترسی‌یە . کەتـیری هەبێ یا دایێتیانێ : کاروباری دروست دەبێ .

تیراوێژ : باوەڕی و دڵنیابی بەخۆ بوونە . کەپێشمەرگە بێ : ئازایەتیکی بڕ سوودە .

تیرو کەوان : سەر کەوتن‌و چیرەبی‌و دەستەڵاتە . ـ لەشوویێنی پێشمەرگە-یێتی‌دا دیتن : لەپەلامار و هێرش و دەست درێژی‌دا پێشکەوتنێکی پـڕ سوودە .

تێراوی . لەلای دانیالی تێراوی : لەتینوویتی باشترە .

تێری . کرمانی دەڵێ ؛ ـ بێ نیازی‌یە . کەخۆی بەبرسی ببینێ : تاوان دەکا باشترین خەون لەوبابەتەوە ئەوەیە کە نەبرسی بێ و نەتێر .

تیژ کردن . ـی شیر : پێشمەرگەیێکە نەخۆش یا برینـدار دەبێ .

تێکوڵ . ـی دار کە سەوز بێ : خەون بـین . بـەهرە و ڕۆزی دەست دەکەوێ .

تینوویتی . ابن سیرین دەڵێ ؛ تێراوی لە ـ باش‌ترە . کەببینێ زۆر تینووەو ئاوی دەست ناکەوێ : تووشی خەم و خەفەت‌و ڕەنج دەبێ . کە ـ بێ و ئاوی دەست کەوێ و یا کەسێکی تر بیداتێ و نەیخوواتەوە : لەڕەنج و گێچەڵان ڕزگاری دێت و بەئاواتیش دەگات .

کەتینوو بێ و ئاوی دەست کەوێ و بیخوواتـەوە : تووشی داوێـن پیسێتی و تاوان بـاری دێت بەڵان پـەشیمانی دەکێشێ و دەبێتـە پارێزگار .

جاتره : ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون‌دا : خەم و خەفەتـە . خوواردنیشی : دوژمنایەتی و کەم و کووڕی ماڵە . دیتنی ـ لەخەون دا بێ سوودە .

جادوو : دیتنی ـ لەخشتە بردن‌و دەست برِین و ساختە کردنە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ ی کردن لەخەوندا کارێکی پووچە . کەببینێ لەخەونداـ ی کرد کارێکی پووچ‌و بێ سەرەو بەرەیە . بەبیرو ڕای هێندێکان ـ کردن : پیکوڵچاندن و دووزمانی و درۆ و لەخشتە بردنە .

جاڕ (جاڕی شەڕ ) « اعلانی‌جەنگ » پیرۆزی‌و دەستەڵاتە بەسەر دوژمنان

جاسوس بڕوانە ( شۆفار ) .

جاشك : ابن سیرین دەڵێ : کەببینێ ـ یکی هەیە : تالان و بەهرەیەکی پێ دەگات کەببینێ سوواری ـە کە بووە و ڕامی بەتی : سەر کێش و گوناهکار دەبێ کەشەڕێ لەگەڵ جاشکەکەی بکا دوو پیاوی بێ ئایین بۆ وی شەڕ پێکەوە دەکەن . کەجاشکەکە بێتە ناو ماڵی : بێ ئایینێکی دێنێتە ناو ماڵی کەجاشکەکە لەبەر دەستی وی‌هەڵبێ ڕوو لە خراپــــــــە دەکا .

جاڵی لۆکە ( داپیرۆچکە ) دیتنی ـ دبارە داوێك لەسەر ڕێگای هاتو بەختیارێتی تۆ دانراوەتەوە دەست لەـ دان بەهردو بەشـە . کەـ بەخەون دیتووەوە بدات : پاش ملەو بەدگۆیی بێ جێیە ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەون دا ـ دیتن : نیشانەی پیاوێکی بێ تـین و گومڕایە . کەسێکی ـ ی بگرێ بەسەر پیاوێکی دا زاڵ دەبێ لـە لای ابراهیمیش جۆلایـە .

جام : کرمانی دەڵێ ؛ کەجامێکی پڕ ئاو یاگولاوی هەبێ یا بیدەنی و لێی بخوواتەوە : ژنی دەخوووازێ یا کەنیزەکێکی دەکڕێ و منداڵێکی ئایینداری دەبێ

کەلەوەوە ئاسوودەیی دەبینێ . کەئاوی جامەکەی بڕێژێ و جامەکە بهێنێتەوە منداڵی دەمرێ . کەجامەکە بشکێ و ئاوەکەشی بڕژێ : نیشانەی مەرگی ژن و منداڵەکەیەتی . جابری مغربی دەڵێ ؛ کەچەند ـ یێکی لەسەر تاقە و رفحە دانابێ : بەئەندازەی وان کەنیزەك و ژنی دەبێ کەجامی سپی وەیا سەوز ببینێ : ژنی ئایینداری دەبێ . ـ ی سوور : ژنی هاودەمو دوو زمانی دەبێ . ـ ی زەرد : ژنی نەخۆشدەبێ

جانەوەری درندە : ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـ هەنو هەموویان بوونە کەر یایە کێکی بوو بەکەرو ئەویتر بووبەگاو یایە کێکیان بوو بەمەڕ : دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە بەڵان زیانی بۆ وی هەیە کە ببینێ چووار پێیەکانی دی بوون واتابەکانی بەپێچەوانەیە . مغربی ‌ی وایە کەببینی گۆشتی جانەوەرانی دەخوارد ماڵی خەڵکی بەفرت و فێـڵ وەدەست دێنێ . کەببینێ خۆی بۆتە ـ : هۆشی نامێنێ . کەببینێ ـ ان لەگەڵی داخوون : دەبێتە پادشا . کە ـ ان بکوژێ : بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . دەنگی ـ : دەنگی دوژمنـانە .

جـەردە : بڕوانە ( ڕێگر ) .

جەرگ . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا : ماڵی نهێنییە کەببینێ ـ ی مرۆیانە : ماڵی شـار ـ راوەی دەست دەکەوێ . کەببینێ ـ ی خاو یا کوڵاوی زۆر دەستکەوت . گەنجە . ـ ی گاو مەڕیش بـەهرەیە . هێندێکیش دەڵێن ـ لەخەون دا منـداڵـە . کەببینێ ـ ی لەماڵی وی دەبەنە دەرێ یا بەئاگری دەیانسووتاند ماڵی لێ دەستێنرێ .

جەنگەڵ : پێشنیاز و داخوازیانی لەبەر چاوان باش و لەنهێنی دا خراپە ـ ی بڕو زۆرو تێکچڕژاو ماڵ و سامانێکی زۆر و ئاوەدانییە کەران بەناو جەنگەڵ دا ئارەزوو سەودای خۆ دوور خستنەوەیە

بەرهەم هێنان و دامەزراندنی ـ بۆ سووتاندن : ماڵ و سامانێکی زۆرە . نیگەرانی لەچوونە ناو ـ : دڵ و دەروونی پیس و کرداری بێئابڕوویانەیە
جەواڵ . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ نیشانەی پیاوێکی زانایە . کەبینی ـێکی تازەو گوشادی هەیە : سوودە . هی گچکەش هەر بەسوودە .

جەهەننەم : بڕوانە ( دۆژە ) .

جبە . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ژنە کە ـی پاك و فراوان بێ : ژنێکی چاك و خۆشخوو دێنێ . کەوا نەبێ وانیە . کە ـ کەی بدڕێ یابسووتێ لەگەڵ ژنە کەی لێك جیاوابەز دەبنەوە . لەبەر کردنی ـ بەزستان لەکۆەکانی تر پەسند ترە . کە ـ ێکی نوێی هەبێ یا کەسێك دایبێتێ و سەوز بێ : ژنێکی پاك ئایین دێنێ .

ججاڵ ( دجال ) . ـ لەهەر شووێنێکیدا ببینرێ : لەو شووێنیدا درۆزن و کڕ و گێچەڵ کۆ دەبنەوەو خێرو پیت و پیرۆزی لێ نیە .

جحێل . ابن سیرین دەڵێ : کەسێکی لەخەونیدا ببینێ جحێڵ بۆتەوەو مووی سپی ڕەش هەڵگەڕاوەتەوە داوەمینێ . جحێڵێکی نەناسراو ببینێ : لەدوژمنی خۆیەوە کەنەفتی دەبینێ و ئاواتیشی پێك نایەت . کەبینی جحێڵێك پیر بووە : ڕێزی پتر دەبێ . ژنانیش لەو لێکدانەوەیە وەکوو پیاوانن .

جریوەی باڵندان سپلەیی ژن و مێردانە .

جـزا بڕوانە ( سزا ) .

جل و بەرگ : بڕوانە ( بەرگ ) .

جلاد : بڕوانە ( خوێن ڕێژ ) .

جل شۆر : دووا ڕۆژێکی ڕووناك ر تروسکەدارە ـی ماڵێ : گیران و زینـدانە .

جل شۆری . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیبنێ ـ دە کرد لەگوناهان پەشیمان دەبێتەوە جابر دەڵێ ؛ کە ـ ی دیت پیاوێکە خێرو چاکەی دەکات .
جندۆکە . دیتنی ـ شەرو کێشەی ناو ماڵە ڕەنج و ئازاری گیانیە ـ هێنانە ژێر دەست ؛ بەسەر دوژمنان دا زاڵ بوونە . کە ـ جادووی لێ کردبێ بەخت و هاتە . کە ـ مرۆی ببات بەد بەختیەکی ترسێنەرو سامداره . کە ـ ی ببات ئارەزووی پێك دێ .
جنێو . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ بەکێك ـ ی پێ دەدا باری چاك و بەسەر ـ دەریش‌دا زاڵ دەبێ . کەئەویش ـ بەیەکێکی بدات هەروایە
جۆ کرمانی دەڵێ ؛ کە لەخەونی دا ـ ی ووشك یاتەڕ یا کوڵاو بخووا ؛ سوودێکی کەمی پێ دەگات . ـ ی هەبێ یادابیانێ هێنان وی خێر وسوودی پێ دەگات ، نیشانەی لەش ساخیشە ـ چاندن ؛ ماڵداری کردنە . جۆ لەخەوندا ؛ ماڵە .
جوو ( جوولەکە ) ؛ ابن سیرین دەڵێ ؛ کەسێکی لە خەونی دا ببینێ بۆتە ـ کارێکی نارەوای لێ‌ڕوو دەداو یارمەتی وان دەدا . کەببینێ بۆتە ـ یا و فـەلە یابوت پەرست ؛ گومڕاهی یە . کەلەخەونی دا ببینێ کە ـ یەك موسڵمان بووە ؛ موسوڵمان دەبێ یا دەمرێ .
جۆگە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ ی ئاوێ لەخەون دا کەئاوەکەی خاوێن‌و تامی خۆش بێ ؛ زیندەگانی خـۆش دەبێ کەببینێ لە ـ یەکی نەناسراو دا ئاوی ڕوونی دەخواردەوە کەئەو کەسە لەهەندەران یالەجێگای بێگانان دابووبێ خەریکی کارێکی بێ سەر و شوێن دەبێ و تەمەنی خۆی لەوێ‌دا بەسەر دەباتو بەقەد ئاوەکەی کەلێی خواردۆتەوە سوودی لێ دەست دەکەوێ . کە ئاوی ـ سوێر یا تاڵ بێ زیانی بەرەو ناخۆشی دەباتە سەر . ابن سیرین دەڵێ ؛ کە ـ کە ئاوی ڕەوان و پاك بێ ؛ بەرێزو خۆشەویست دەبێ ، کەوا نەبێ وانیە .

جۆلآبی . ابن سیرین دەڵێ ـ پیاوێکی ڕاڕەوە یا پەیکە بە گێتیدا دەگە.
ڕێ . کەبیبنێ ـ بەرگی دەچنی : لەگەڵ یەکێکی شەڕ و دوژمنایەتی
لێ دەقەومێ . کەبیبنێ بەرگەکەی بەتەواوی چنیوە : خـەمناك و
بەپەرۆش دەبێ .

جێژنە ابن سیرین دەڵێ ؛ کەجێژنەی قوربانێ ببینێ کاری بە پیارێکی
تێکەیشتوو دەبێ . کە ـ ی ڕۆژووان ببینێ : سوود لەپارێزگارێکی
دەبینێ ابراهیم دەڵـێ ؛ کەببینێ جـەژنەیە و بەڕازاوەوەیی دەچنە
دەرەوەی شاری کەخەڵکەکە ئابڕوومەند بن : ئابروویان پتر دەبێ .
کەگیرا بێ بەر دەبێ . کەئەو خەونەی لەنزیك جەژنەی ببینێ لەگەڵ
زۆر سەودایەکی دەکات و کاروباری بەسەختی ڕێك دەکەوێ .
ئەو خەونە کەلەسەرەتای سـاڵ دابێ : باشترە .

جیوە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەسێکی ببینێ کەچۆتە ناو کانی ـ و ـ ی لێ
دەردێنێ : ژنەکەی تووشی کاری خراپە دێ . خواردنی ـ : ڕەنج و
زیانە . کەبینێ لەناو کانی ـ دا نقووم بووە : ژنان جادووی لێدەکەن
کە ـ ی بفرۆشێ یا بیدا بەیەکێکی تر : لەمـــەکر و فـرت و فێڵی
ژنان دڵنیا دەبێ .

جیوەی دارێ ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـ ی هەیە و خوواردی : ماڵی
کەسێکی دەچووێنی . کەببینێ ـ هـەیە و داویە بەکەسێکی تـر
ماڵی خۆی دەدا بەخەڵکی .



چار شێو . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ــ پەردەی نامووسی ئافرەتانە . کە وەکوو ژنان ــ ی پۆشیبێ : نیشانەی خێر و شەڕی دەنووێنێ ، خەڵکی بێزو بۆی لێ دەکەن . کەچار شێوی بدڕێنێ و یا بیسووتێنێ : پەردەی ڕاز یا نامووسی وی، دەدڕێ ، کرمانی دەڵێ ؛ کەسێکی ــ ی هەبێ و یا بیدرێتێ : ژنێکی تازە دێنێ . کەــ یکی نووێی کڕی بێ : کەنیزەکێ دەکڕێو منداڵی لێ دەبێ . ئافرەتێك ئەو خەونەی ببینێ : مێردی دەکا ژنێك ــ ی بە دڕاوی و یا بەسووتاوی ببینێ : بــەڕەلا دەکرێ و یا مــێردی دەمرێ .

چاکە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ــ لەگێتیدا نیشانەی گەورەیی‌یە . ابراهیم دەڵێ کەببینێ چاکەی لەگەڵ یەکێکی دەکا : نیشانەی سپڵەیی‌و دەیشکێنێ

چاڵ . ابن سیرین دەڵێ ؛ دۆزینەوەی گەنج‌و دەستکەوتنی ژنە . لەــ کەوتن بڤە (خطر)ە . لەــ دەر کەوتن : دڵداریێتی ڕاستەقینەیە . ــ هەڵکەندن: سوودو سامان و ماڵی زۆرو ژنە کەیەکێك لەکاتی هەڵکەندنی ــ دا یارمەتی بدا : نیشانەی وەیە کەیەکێك لەنێوانی وی‌و ژنەکەی خۆیدا دەلاڵەو دەیەوێ بەفێڵ و فــەڕەج ژنەکەی بدات بــەو ؛ چوونکوو هەڵکەندنی چاڵ : فێڵ و فــەڕەجە .

چالاو . هێندێك دەڵێن : هەڵکەندنی ــ و دەرهاتنی ئاو : مارەیی برینە کەببینێ ــ بۆیەکێکی هەڵدەکەند : دەیێتە دەلالی وی بۆ ژن چارە کردن .

چاندن : ابن سیرین دەڵێ ؛ تۆ چاندن لەخەون دا و دووبارە کۆی کاتەوە ئابڕوو و گەورەیی دەست دەکەوێ . لەو شــووێنەی کە چاندوویەتی ئەگەر دەیخووارد : باشترین و بڕ بەهرە تریشە .

ئەوەی کەچاندوویە ئەگەر لەخەونی دا چتێکی بۆ بەرهەم نەیەو نەزانی بارانە چی‌یە و کەم و زۆری چیە : خەم و خەفەتە .
گەنم ـ خێر و چاکەیە . کەجۆی چاندبێ : ماڵ و سامانی بۆ کۆ دەبێتەوە . کە هەرزنی چاند بێ ماڵێکی کەمی دەست دەکەوێ
کەنیسک و پاقلە و لووبیای چاند بێ خەم وخەفەتە
کەلەزەوی خۆیدا بچێنێ ژنێکی دێنێ کاروباری پێك دێ و ماڵ و سامانیشە کەزەوی خۆی بەنەچێنراوی ببینێ دوژمنایەتی لەگەڵ یەکێکی لێ پەیدا دەبێ کە دیتی بۆ شووێنێکی مەجهول تۆوی دەچاند و شین بوو کاری خێر و جوامێرانە دەکات .
کەجۆ یا گەنم یاداری لە زەوی خۆیدا دەچەقاند پایەو خۆشەویستی و رێزی پتردەبێ
دانیال دەڵێ دیتنی چاندن و دروێنە لەخەوندا بەمەرجێ کەگوڵەکانی دەخڵ بێ و گەیشتبێ نیشانەی سوودە کە نەگەیشتبێ و سەوز بێ نیشانەی نەخۆشی‌یە

چاو ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەون دا پیاوێکی ببینەرە کەبەوی رێی رزگاری دەست دەکەوێ ـ ی شین ناپەسندە ـ رەش کەشین بنووێنێ منداڵە کەببینی کوێر بووە : لەرێگای راست وون دەبێ یا منداڵێکی دەمرێ . کەببینێ چاوێکی کوێربووە تاوانێکی گەورە دەکات بەدەستێکی یا بەلاتێکی یا بە یەکێك لە

ئەندامەکانی ، یاکارەساتێکی لەکار و باری خزی بێ دەگات .

کرمانی دەڵێ ؛ کەکلی لەچـاوی بکات ; باشە . کەکلی بۆ جوانی لەچاوی بکات ; خۆی بەئایندار دەنوێنی تا بەرێز بێ کەکلی بدەنێ لەچاوی بکات ; ماڵی دەست دەکەوێ کەبینێ چـاوی کز بورە : بەدزی و ئاشکرا دوو ڕووە کەبینێ لەسەر لەشی وی چاو زۆر هەیە و هەموو چتێکیشی بەچاکی دەدیت : کارو باری ڕاست دەبێ . کەبینێ چاوێکی وی کەسێك هەڵیکەند ئەوەی کەچاوی وی بەوی ڕەوشەنە وەکوو ژن ، منداڵ ، ماڵ ، باخ و ئیتر لەبەرچاوی وی وون دەبێ . کەچاوی وی لەئاسنی بێ : پەردەی وی دەدڕێ . کەبینێ هەر دووك ـی هـەڵاەـا بوون و نەتوانی هەڵیان بێنی : لەگەڵ مرۆیەکی هاودەمی گفتو گۆیەك دەکات . کەهەر دووك چاوەکانی هەڵکەندرابێ : لەئایینی بەریە . کەبینێ تەنها چاوێکی هەیە وونەیەکی نارەوای بەسەر زاری دادێت . کەبینێ چـاوی یەکێکی ڕەش بوو بەڵان شین هەڵکەڕا باری وی تێك دەچێ . کەهەردوو چاوەکانی سپی بێ و دووبارە ڕەش بێتەوە نەخۆش دەبێ و یالەگەڵ یەکێکی دوژمنایەتی پەیـدا دەکات .

چـەتر . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ لەسـەر سەری وی ـ ی هەڵدەدەن ; دەبێتە پادشا ، کەلە وانەش نەبێ گەورە دەبێ . کەبینێ ـ ی پادشای بەدەستەوەیە لەپادشای نزیك دەبێتەوە .

چەخماخ ( ئی ئاگری ) و بەردەکەی : هێـزو توانایە .
له ـ ئاگر دەربێ کەچرا و مـۆمی پێ هەڵکات : داد و مرۆیەتی و زانست و بەهرەو پیاوەتی‌یە .

چەرخ ( سەقر ) . کرمانی دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا دیتن . پیاوێکی گەورەیە کەبەسام و هێـزە . ابن سیرین دەڵێ ؛ پادشایە . کە ـ ی کێوی ببینێ منداڵێکە بکاتە پلـەی خۆ ناسین ( بلوغ ) کە ـ ی بگرێ و ڕاوی پێ بکات ؛ پادشا بێ دادی لەگەڵ دەکات . کەپادشا ـ ی بداتێو ڕاوی پێ بکا : ڕێز و قەدری لەپادشا دەست دەکەوێ و بێ دادی لەگەڵ خەڵکی دەکات . کە ـ ڕاوی بکاتو ئەویش بیگرێ : منداڵێکی کەڵە ڕەقی دەبێ ؛ کە لەگۆشتی ـ بخووات : لەمنداڵانی ڕەنج و خراپەی دەبینێ . کەببینێ ـ لەماڵی وی دا یەك جارو دوو جار دەیخووێند : زیانی پێ دەگات . کەسێ جار بخوێنی : زیانی تێـدا نیـە .

چەشنی تفەنـگ ( سووتاندن وەیا تەقاندنی ) : کەیف و خۆشیت لەدەست دەچێ وەیا دۆستێکت مەرگـ بەرەنگاری دەبێ .

چەقەڵ . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەگەڵ ـ شـەڕ بکرێ ؛ لـەگەڵ خـزمان دوژمنایـەتی دەکات . کەببینێ ـ گەمەی دەکات سەودا سـەری ژنێکی دەبێ کە گۆشتی ـ بخورێ : ماڵ و سامان و لەنـەخۆشی چاك بوونەوەیە .

چـەقەنە ( مرازی بەزمێ ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەون دا ـ دیتن : درۆ و ووشەی پووچە . کەبینێ ـ ی لێ دەدا : ووتـەی پووچ و درۆ دەکا وەیا خەم و خەفەتی بێ دەگات . کەبینێ پادشا ـ ی بداتێ : لەپادشاوە خـەم و خەفەتی بێ دەگات . کە ـ ی فـرێ داو شکاندی : لەدرۆ و دەلەسە رزگاری دێت . کەبینێ ـ ی لەسەری خـۆی دەداو لێـدانی ـ ی نازانی کە زانا بێ : خەڵکی لـەوی فێرە زانست و زانایـی دەبن .

چەك : جێگاو پایەو شـان و پلەی بەرزە . کەلەگەل چەك تـیر و کەوان هەبێ باچتێکی تر دەیێتە خاوەنەی جێگاو دەوڵەت ..
چەك بەکار بردن : مەرگی یەکێکە لەخزمان .
کەبینێ ئەو مرازانەی کەشەری بێ دەکرێ لیێی وون بێ یا لـەناو بچێ : لەگەورەیی دەکەوێ .
بەچەك بریندار بوون مـزگێنی کەسێکت بۆ دێ کەوات دەزانی مردوو یاوون بوو بوو .
چەك هەڵگرتن : بەشانازی و پایەی بەرز دەگەیت .

چەك ( قۆچان ، ،ەرات ، حەواڵە ) کە ـ ی مۆر کراوی دەسـت کەوێ یا بیدەنێ : سـوودی دەست دەکەوێ کەبینێ ـ ی مـۆر کات یا هەیبێ سوود و قازانجە . کە ـ ی لێ وون بێ یا بـووتێ دەمرێ . مغربی دەڵێ ؛ کە ـ ی مۆر کات یا هەیبوو امزایەکەی لێ هەڵگرێ کەم و کووری دەکەوێتە ناو ماڵی وی یەوە .

چەکوچ ( چەکوچی گەورەو قورس ) . کەبینی ـی زۆر هەیە یا کەسێك داویە بەوی : دەبێتە برادەری گەورەی هۆزێکی و سـوودی لێ دەست دەکەوێ . کەکەسێك ئاسنگەری نەزانی کە ـ ی لەسندانی بدات : نیشانەی ئەوەیە کەلەنێوانی دوو گەوراندا دوو زمانی دەکا و تۆوی دوژمنایەتی دەچێنێ کە ـە کەی لێ وون بێ : لەبرادەرایەتی گەورەکەی دوور دەکەوێتـەوە

چەنەگە ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەوندا گەورەی ماڵی‌یە و خاوەندی کاری زۆرە . کەبینی ـ ی وی ئەستوور و گەورە بووە : خلو و خێزان نزم و پەرێشان دەبن . کەبینی لەچـەنەکەی وی خووبن رِەوان بـوو هێنـدەی وی لەگەورەی ماڵێ زیانی پێ دەگات ، هێندێکیش دەلـێن : لەکار و کردار و سەودای‌دا کەم و کوورِی پـەیدا دەبێ .

چـەنگ ( چەنگاڵ ) . کەکەسێك وەکوو باڵندان خـۆی بەچەنگاڵ‌ـ دار بینی : هێزە بۆ کار و بارو بەسەر دوژمنانیش‌دا زاڵ دەبێ . کەچەنگاڵی باڵندانی بەدەستەوە بێ سوود و کەلکی دەسـت دەکەوێ .

چەوەندەر ابن سـیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا خـەم و خـەفەتە . خواردنیشی خەم و خەفەتە . کەچەوەندەری لەماڵێ فرِێ داتـە دەرەوە لە خەم رِزگاری دەبێ ابن سیرین دەڵێ : کەچەوەندەری بیبنێ سوودێکە لە لایەن ژنانەوە ، چـەوەندەری نەکوڵاویش لەژنانی سوود دەست دەکەوێ .

چەوگان محمد ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیبنێ - ی لەدەست دایە و لەگۆی دەدا ، هەر چیەکی بیەوێ دەستی دەکەوێ و رێز و پلەی بەرز دەبێ بەڵان لەئایین دا سست دەبێ . کرمانی دەڵێ ؛ ئەگەر - ی لەدەستی پادشایەکی دا ببینێ بەسەر دوژمنانی دا زاڵ دەبێ .

چرێش . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی - لەخەون دا خەم و خەفەتەو خواردنی وی کەم و کووڕی ماڵە .

چەکچەکیلە بقەیەکی گەورەیە ، وەڵامی مەرگە ، هاودەمێتی مرۆی گومڕایـە .

چرا کە - لەماڵی وی دا هەڵکرابێ و خاوێن بێ : کابانی ماڵێ ژنێکی چاك و پاك ڕەوشتە کەبیبنێ - بەتاریکی دەسووتا ( شەوقی زۆر کەم بوو ) : ڕەنجی کابان یاژن یانۆکەرو کارەکەری ماڵێیە . کە - بکوژێتەوە کابانی ماڵێ دەمرێ کەبیبنێ چرای لەهەرەدووك دەستی داهەیە : ئاواتی لەهەموو لایەکەوە پێك دێ کەبیبنێ لەدەستێکی دا یەك چرای دوو فتیلەی هەڵکراو هەبوو : دۆو منداڵی باشی دەبێ بەزگ ماکی .

چرادان : نۆکەر و کارەکەری ماڵێیە . کەبیبنێ - ی هەیە یا یەکێك داویە بەو : کارەکەرێکی خۆشخو و میهرەبانە کە - ەکە ژنەکی گرتبێ : کارەکەری بەهەواو فیزو کەم ئایینە . کە - لەدەستی بکەوێ و بشکێ ژنەکەی یا کارەکەر وەیا نۆکەرەکەی دەمرێ .

چلچرا هەڵکردنی - : خۆش و سوودە کوژاندنەوەی پەشیمانییە .

چڵك : ابن سیرین دەڵێ ؛ بەرگی چڵکن ئەو کەسە خۆی بەدکارە ، خراپ کردەوەیە کەبیبنێ بەرگی وی چڵکاوی بوو نیشانەی خراپییە . کرمانی دەڵێ ؛ لەسەر سەر و لەشی خەم و خەفەتە .

چڵم  کەبینێ چڵمی لەکەپۆی دێتە دەرێ  قەرزی دەدرێتەوەوە لەخەمو خەفەت رِزگاری دەبێ  ابن‌سـیرین دەڵێ  ـ لەخەوندا منداڵە. کە ببینێ ـ ی بەسەربەرگی داکەوت: کورێکی دەبێ کەچڵمی بکەوێتەسەر عـەردی: کچێکی دەبێ کەچڵمی فرێ داتە سەر زەوی  ژنەکەی ئاوس دەبێو بەرداوێ  کەببینێ ژنەکەی ، چڵمی پێدادا  کاری ناپەسند لەگەڵ ژنی هاوسێی دەکات.
کەببینێ ـ فرێ داتە سەر دۆشەکی پیاوێکی  یەکێك کاری خراپە لەگەڵ ژنەکەی دەکات  کەببینێ چڵمی دەخـوارد  ماڵی ژنی دەخوات.

چنار: لەخەون دا دیتنی ـ: پیاوێکی پیرۆزە کە سوود و کەلك لەوەوە بەدۆست و خزمان دەگات.

چنین. کەببینێ خۆی دەچنێ: تووشی دوژمنایەتی دێت و باری باش دەبێ و بەڵان لۆمەی دێتە سەر. ـ ی کراس: سـەفەرە. ـ ی بەرگ و کراس: سەفەر کەرە. هێندێکیش دەڵـێن؛ ـ ی بەرگ و کراس: دوژمنایەتی‌یە.

چووار پێ  ابن سیرین دەڵێ؛ کەچوار پێ هەبێ و گووێ لەمستی بێ: لەپیاوێکی بیابانی سوود و کەلکی پێ دەگات. کەببینێ رِەمەیەك کە ـ یانی دەشتی لەلای وی ئامادەو فەرمانبـەری وی بن  چەند کەسێکی چۆل نشین دەبنە ئالقە بەگووێی وی. کەببینێ ـ یانی دەشتی‌ی دەپەرست  خزمـەتی پیاوانی زانا دەکات. کەلەخەونی دا بوویتە ـ  هۆش و ژیـری لەلا نامێنێ  کەببینێ ـ یەك یا زۆر لەگەلی وی دەئاخاوتن  بەپایەی گەورەیی دەگات.

چۆلە کە . ـ لەخەون دا دیتن : پیاوی بەقەدرو ڕێزو پایە بەرزە . خەون دیتوو کەداوێن پاك بێ ، بەڵام کەداوێن پیس بێ : بەوا و یا بەفێڵ گرتیێتی . لەگەڵ پیاوی بێ ڕێزو فێڵ و مەکرێکی دەکات و زیانێکی پێ دەگەیەنی . کە ـ مێ بێ : ژنێکی بەڕێز بەسەر وی دا زاڵ دەبێ .

کەلەکۆشەی وی بخوات ، لەماڵی پیاوە کە زۆر بەژنە کە دەبڕێت .

ـ لەهێلانە هێنانە دەر ، ڕەنج و ئازارە بەو دەگات .

کرمانی و ابن سیرین دەڵێن ؛ کەبیبنێ ئەرخە چۆلەکان ڕاو دەکات و سەریان هەڵدەکەنی و لەهەمبانەی داوێ ، دەبێتە ماەۆستای مندالان ، بەداری هەموو ئەندامی وان دەهەنجنێ .

کە ـ ی سوور ڕاو بکات ، ژنێکی جوان دێنێ و یا کەنیزەکێکی جوان دەکڕێ .

کە ـ ی زەردیدەستکەوێ : ژنێکی ڕەنگ زەردو نەخۆش دێنێ . هێندێکیش دەڵێن ؛ چۆلەکە . مندالە یا نۆکەرە .

چۆم . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ ی گەورە لەخەون دا : پیاوی گەورەیە . کەبیبنێ چووە ناو چۆمێکی گەورەو ڕوونەوە لەگەڵ پیاوێکی باشی ئایندار بەندیواری پەیدا دەکات و لەوی خێر و سـوودی دەست دەکەوێ .

کەبیبنێ لەڕووباری هاتە دەرێ : لەڕووشە و خەم ڕزگاری دەبێت

کەبیبنێ چووەتە ناو ڕووبارێکی گەورە و شلوێ : لەگەڵ پیاوێکی زۆردار بەندیواری پەیدا دەکات و زیانی لێ دەبینێ . کەبیبنێ لە ڕووباری دا ڕوو چـوو ( نقورم بوو ) ، تا دەمرێ لە خەم و خەفەت ڕزگاری نابێت . دانیال دەڵێ ؛ ـ ی گەورە ، وەزیرە .

کەبینی - ی گەورە ووشك بوو ؛ وەزیر لێ دە کەوێ ٠

چوو ( سیرەت ) . دانیال دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا منداڵێکی پیرۆزو ناودارە کەبینی دوو ـ ی هەیە یا پتر منـداڵی دەبێ و لە ناو خەڵکیش دا گەورەیی دەست دە کەوێ . کە بینی - ی وی بڕاوە منداڵی دەمرێ کە بینی خۆی سیرەتی خۆی دەبڕێ : منداڵی نابێ . کەبینی - ی سست بووە ؛ منداڵی نەخۆش دەبێ ٠

ابن سیرین دەڵێ ؛ - ی گەورە : نیشانەی زۆری منداڵەو ناوداری یە . ـ گچکەیی : بەپێچەوانەیە . کەبینی زۆر سیرەتی وەکوو لکی داران لێ ڕوواوە : نیشانەی زۆری منداڵانە . کەماسی لە سیرەتی وی بێتە دەرێ : کـچێکی دەبێ لە ژنێکی وا کە لە دانیشتوانی دەریای ڕۆژ هەلاتی دەچێ ٠

کەبینی لە ـی دووپشك و مێروولە هاتنە دەرێ منداڵێکی بێ خێرو لاوازی دەبێ : کەنان بێتە دەرێ : منداڵ و ماڵی وی برسی دەبن و دەست تەنگ دەبن . کە کونجی بێتە دەرێ : یەکێك بەدزی حـەز لەخێزانی دە کات . جابر دەڵێ ؛ کەبینی ـ ی لەوی جووێ دەیێتەوە : منداڵی دەمرێ یا ماڵی لەناو دەچێ ٠
کە ـ ی خۆی بەبڕاوی بینی وەیا یەکێك پی بڕی : منداڵی نابێ ٠

چوون . ابن‌سیرین دەڵێ ؛ کەبینی لەشوێنێکەوە تەکانی دەدا خۆی : باری دە گۆڕێ . کە ـە کەی دوور بێ : سەفەرێکی دوورە . کەبەهۆی دار یانیزەیەکەوە کەبەدەستی‌یەوە بوو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێك دەچوو پشتی بەیەکێك بەستووە کەیاریدەی دات

چوونە سەر : بڕوانە ( سەر کەوتن ) .
چێشت : ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ - ی بۆ نەخۆش لێ دەنێ : ئاییندارییە

## خ

حەب بڕوانە ( دانـە ) .
حەسار : بڕوانە ( حەوش ) .
حەسیر . ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەوندا ببینێ کە - ی هەیەیا کەسێك داییەتێ :
سوودو قازانجە لەژنی پێی دەگات . کەببینێ - ی دەنێ . سەودا
سەری ژنێکی دەبێ . کەببینێ ئەو حەسیرەی دەی چنێ کەم نرخە :
ژنەکەی بێ نرخ و سووکە کەببینێ - ە کە پاك‌و نرخدارە ژنەکە
خاوەند شکۆ و خانەوادەیە . مغربی دەڵێ ؛ کەببینێ - ی دەچنێ و
دەیفرۆشی : خەم و خەفەتی پێ دەگات .
حەمام ؛ بڕوانە ( گەرماو ) .
حەمباڵی : بڕوانە ( کۆڵ هەڵگر ) .

حەوز . ابن سیرین دەڵێ - لەخەوندا : زانست‌و زانیارییە کەببینێ خۆی
بەئاوی - ی دەشوشت ؛ پیرۆزییەو لەتاوان دوور کەوتنەوەیە . کەببینێ
ئاوی - ە کەی هەمووی خواردەوەو پێشی خۆش بوو ؛ نیشانەی ئەوەیە
تەمەنی خۆی بەخۆشی ڕادەبوێری و ماڵێکی زۆر پێکەوە دەنێ که
ببینێ لەش و بەرگی خۆی بەئاوی - ی دەشوشت خاوو خێزانی وی
لەکاری خرابە بەشیمان دەبنەوە و ڕوو لەچاکەو باشی دەکەن .
کەئاوی - ە کەی ئێلێ و تاڵ بێ ؛ خەم و خەفەتە .

حەوش ( حەسار ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیینێ چۆتە ناو ـ یێکی : لەشەڕی دوژمنان دڵنیا دەبێ . کەلەحەوشێ بچێتە دەر یا دەر کرێ : دوژمـن بەسەری دا زاڵ دەبێ .

حەیوان : بڕوانە ( وولس ) .

حساٰب : بڕوانە ( لێکدانەوە ) .

حکمە : بڕوانە ( ڕێنۆنی ) .

حقنە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا ـ کردن : کەوتنە ناو ڕك و کینەو لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر چوونە کەلە ـ ئازاری پێ بگات و بێهۆش بێ . هێندێکیش دەڵێن ـ لەخـەون دا کارێکە ئێخەی خـەون بینی دەگرێتەوە . جعفری صادق دەڵێ ـ کردن و ئازار لێ دیتن : نیشانەی بەدی باری وی‌یە کەبەپێچەوانە بێ بەپێچەوانەیە .

حلاجی : بڕوانە ( پەرە کردن ) .

حۆقە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا . ژنە یاکەنیزە کەبیینێ ـ یەکی تازەی دەست کەوت یا کڕی یا کەسێك دای بەوی : ژنێکی دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکڕێ . کە ـ ی بشکێ یا لەناو چێ ژنەکەی لێ‌ی جووێ دەبێتەوە . جابر دەڵێ ؛ کەبیینێ حۆقەیەکی گەورەی ڕەنگین هەیە : ژنێکی دەوڵەمەند دێنێ و سوودی لێ دەبینێ .

حیلە . حیلەی ئەسپێ : مزگێنی خۆشە .

خاج : ابن سیرین دەڵێ : کەسێکی لە خەونی‌دا - ی بکرێ پایەکێك‌پیدا-
تێ زیان بە ئایینی دەکا . لە - ی لە ملی دابێ : پیرو باوەری لە ئایینی
دا دروست دەبێ - پەرستن : خراپە
خارشت : بڕوانە خورشت .
خاك : بڕوانە خۆڵ .
خانوو : هێمنی‌و ئاسودەیی یە سەر کەوتن‌و نزیك کەوتنەوەی بەر زی یە .-
دروستکردن : هەنگاوانی بێ سوود و هاوێژتنە . تێکدانی - زیانی
ماڵی بە سووتاندنی - . تیشکان و بنە هاتنی ژیانە خلوەندی چەندین -
ان بوون بەد بەختی‌و ئازاری سەختە
خانووبەرەی ( بەتاڵ) :رووی لە دۆستان هی‌ئاوەدان : سەر کەوتن وشادما-
نی‌یە کە - بەرزو بڕشکۆیی خۆبەسەندی و بە خۆهەڵکوتنە و لاوە .
کە - ساردەو سووك بی قابلی‌و خۆش‌و دڵنیایی‌یە .
خاوێن کردنەوە بڕوانە پاك کردنەوە .
خەردەل : ابن‌سیرین‌دەڵێ‌دیتنی - خەم و خەفەت خووارنی - بەئەندازەی
وی‌خەم‌وخەفەتی بێ دەگات کەیە کێك پیدانێ : لەوەوە خەم وخەفەتی
پێدەگات
خەرمان : ابن سیرین دەڵێ : - ی دەخل لەخەوێ پیاوێکە کە بەڕەنج و
ئازارماڵ کۆکاتەوە وەبەخۆڕایش لەناوی بچووێنێ لەگەڵ ژنەکەی .
کە - بکرێ پایەکێک پیداتێ ژنێ دێنێ . هێندێکیش دەڵێن‌دەبێت
دۆستی پیاوێکی لەوەوە بەرەبج ماڵی دەست کەوێ - بەوتێ ڕووشەو
کارەسانە - ی و پێچە سوودو کەلکە
خەز ابن‌سیرین‌دەڵێ هەر پارچەیەک لەبەر گی مرۆڤان لە کەوڵی درو
ستکرابێ‌زۆرباشەهەر ڕەنگێکیان‌هەبێ سوودوزیانی نیە کەیکرەنگ
بێ‌بەلاّن یەکرەنگ نەبێ : خەفەتە.

خه‌ساندن : ابن سیرین ده‌ڵێ که خۆی بخه‌سێنێ : کاروباری پێکدێ و ده‌وڵه‌مه‌ندی‌یه هێندێکیش ده‌ڵێن : منداڵی ده‌مری وه‌هی تری نایێته‌وه که‌یه‌کێکی خه‌ساو ببینێ : پیاوێکی باشه‌وخێرخووازو مزگێنی‌خۆش ده‌ره . کرمانی ده‌ڵێ که‌ببینێ گونی‌بڕا یا که‌وت : به سه‌ر دوژمناندازاڵ ده‌بێ وه‌هێندێکیش ده‌ڵێن : کچی نابێ چونکوو گون به کچ دانراوه . که گونی‌خۆی ده‌رێنێ بیدا به یه کێکی تر کچی خۆی ده‌دا ویامنداڵه‌ـ کانی وه‌پاڵ کمسێکی ترده‌ده‌ا جابر ده‌ڵێ . که‌ببینێ به بێ هۆ خه‌ساوه : که‌نه‌فتی‌و زیانی پێده‌گات که‌چووشی‌له‌له‌شی ببڕێت : هه‌ر ئه‌و واتاـ یه‌ی هه‌یه‌و ناوی بزر ده‌بێ

خه‌فه کردن : ابن سیرین‌ده‌ڵێ که ببینێ یه کێك ئه‌وی خه‌فه کردووه خه‌مبار و بێچاره ده‌بێ هێندێکیش ده‌ڵێن ـ : خوشگوزه‌رانی‌یه .

خه‌ڵات : ابن‌سیرین ده‌ڵێ : که له خه‌ونی‌دا ـ ی باش‌وخاوێن‌ببینێ :به‌ڵگه‌ی ڕێزو قه‌درو ده‌ستکه‌وتنه و گه‌وره‌یی‌یه به‌ژن و که‌نیزه کیشیان داناوه. کرمانی ده‌ڵێ که‌ببینێ پادشا خه‌ڵاتی به‌وی داوه : له وه‌وه : خه‌ڵاتی پێده‌گا . که‌زانایه‌ك ـ ی بداتێ : له وه‌وه زانست فێر ده‌بێ . جعفری صادق ده‌ڵێ : ـ سه‌وز یا سپی . پایه‌و قه‌دره له ئایین دا

خه‌ڵات ( کفن ) ابن سیرین ده‌ڵێ : که‌ببینێ ـ ی بۆ مردوو درستکرد که ئه‌و که‌سه ناسراوبێ له‌وه‌وه کێشه و ڕه‌نجی تووش دێ . که کفنی له مردوو بکاته‌وه : تووشی ماڵی ناڕه‌وا دێت .

خه‌ڵفی مێش هه‌نگوین : ابن سیرین ده‌ڵێ که‌ببینێ ـ هه‌یه له‌ژنانه‌وه ئاواتی پێکدێ وماڵی ره‌وای دسته که‌وێ . که‌مێش هه‌نگوینی سپی بچێته ناوی : ده‌وڵه‌مه‌ندی و ئاشتی و سازگاری‌یه

کەمیش هەنگوینی لێ بچێتە دەرەوە .تێشکان و کارەسات و لێ قەوەانە کەپولە مێش هەنگوینێك ـ ە بکوژن : پێکشاد بوون بە ختیاریە خێر و سوودە

خەنە کەسەر و ریشی لە ـ بکری و رەنگ نەگرێ : کارو باری تەنها لە روو کاری دەرەوە داباش دەبێ ابن سیرین دەڵێ کە ـ لەچتی بکرێ خەڵك دژی وی دەبن و خۆی بەچتی هیچ و پووچ خەریک دەکا . کە دەست و پێی لە ـ بکرێ ماڵێکی لە کیس چووی دەستدە کەوێتەوە . کەهەردوو ک دەستی بەخەنە رەنگ کات منداڵە کانی خۆی دەرـ ازێنیتەوە . کرمانی دەڵێ کە بەری دەستی خۆی لە ـ بکرێ لەرێکای کوزەراندا نە خۆش دەبێ کە هەر دووك دەستی خۆی لە ـ بکرێ لە کاروباری خۆیدا دەبێتە فێلباز وساختە کار کەرەنگی ـ ی وی تێکچوو بێ : خۆشەویستێکی دەمرێ یا خۆی. کەبینێ دەست و پێی خۆی وەکوو ژنان لە ـ گرتبێ توشی ترس و هەراس دی کە ئەو خەونە ژن بینێ : بۆوی شادی و خۆشی یە .

خەم : ابن سیرین دەڵێ : ـ دیتن لە خەوندا شادی یە بەلان کەبینێ لە ـ رزگار بووە : خەم و خەفەتە . کەبینێ خەمگین بووە : شادمانی یە

خەنجەر : ابن سیرین دەڵێ : ئەگەر کەسێك بینێ کە ـ ی لە دەستی دایە شەر و دوژمنایەتی لە گەڵ یەکێکی تر لێ دەقەومێ کەبینێ ـ ە کەی شکاوە یا گوم بووە : نیشانەی وەیە کە شەر و دوژمنایەتی لە نێوانیدا نامێنێ . و ئاشت دەبنەوە . کە ـ ە کە ی بە دەستەوە بێ بە بێ چەك : لەیە کێکی یەوە هێزی دەست دەکەوی . کە بە چە کەوە بێ بە سەر دوژمناندا زاڵ دەبێ

خەندەك (چالّ) : تێشكان‌و خراپی بە لەورز گار بوون‌لەبڤەدوور كەوتنەوەیە
له ـ كەوتن : داوێكە كەخۆتی‌تێداوی‌ی ، وەلامی مەرگ‌بەتۆدە گات
خەیار كە ـ لەكاتی خۆیدابیبنرێت نیشانەی وەیە كەووتەی‌خۆشی گووێ
لی دەبێ یاژنێك ڕووی تێدەكات . كەله ـ ه كەی بخوات : لەژنه كەی
بەئاواتی خۆی دەگات كرمانی‌دەلێ كەـی بخوا كارێكی وا دەكات
پەشیمانی له دووه . ـ خواردن له كاتی خۆشی دا بێ : خەم و خەفەته
خرِخالّ پیاوێك ببینێ كەـ ی له پێدایه : ڕەنجه بەلاّن كه لەزێو بێ :
ڕەنجی كەمتره كه ئافرت ببینێ ـ ی له پێدایه : مێردی دەكات . كه له
زێڕی بێ ملكەو سامانه كە ـ ی له پێ دا كەند یائی‌ی گوم بوو : لەو
ڕەنج و خەفەتانەی ڕزگار دەبێ :
خزم‌و دایك‌و باوك : وەلاّمی خۆشه ( بە مردوویی) تەمەنیان درێژ دەبێ
خشت : ابن سیرین دەلێ : ـ له خەوندا مالّ و سامان و پارەیه . خشتێك به
هەزار درەم دانراوه . كەببینێ ـ ی زۆر هەیه : مالّی زۆر دەبێ . كه
خشتی دا بڕێژی و زوو وشك بێتەوه :هێندەی وی مالّی‌دەستده كەوێ
كه ببینێ خشتی به دەستەوەیه یایه كێك داویه بەوی . هەزار درەمی
دەست دە كەوێ كرمانی دەلێ كه ببینێ ـ ی له دیوار دەتراشی : سامانی‌خاوەند دیوار روو له كەمی دەكات . كه ببینێ‌ـی‌پارچه پارچه دەكا :
مالّی خۆی پەرت دەكا . جابر دەلێ : ـ ی سوور كراوەوه : خراپه
خشلّ ابن سیرین دەلێ ـ له خەوندا : مالّ‌و تالّ‌و والاّی ژنانه كرمانی دەلێ
: كه ـی‌بەبەردانی‌نرخداروڕازەوەبی‌پۆشی : مالّی ڕەوای‌زۆردەستده
كەوێ . كه ـ ی وی گوم بێ . توشی خەم‌و خەفەت دەبێ پیاوێكی ـ
ی ئافرتان به خۆی داكات : تووشی خەم وخەفەت دەبێ

ەطەدان بڕوان ( ووناردان )

ەنکاندن : ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ یەکێکی تر ئەوی خەفە کردووە خەمگین وپەرێشان دەبێ هێندێکیش دەڵێن : چاکی ژیان وزیندەگانی یە

ەنکاو : دەنگو باسی بەدوشوومە . ـ لە ئاوێ دەر هێنان : لە تەلەزگەو بڤە دوور کەوتنەوەیەو بەماڵ وپایەدەگات

خوواردەمەنی : ساز کردنی : قاتیو قڕییە بە کەسێکیدان : سەر کەوتنو بەئاوات گەیشتنە ابن سیرین دەڵێ ( هەرخوواردەمەنیەکی ) لە خەوندا بۆنی خۆشبێ و بخورێ : شادی وخێر و باهرەیە هی بۆن ناخۆش : شەڕوخراپەیە . خوواردنی سیرو پیوازو کەوەرو کوراوەو چتیوا خەم و خەفەتە. کەبیینێ ـیەکی ناخۆش وتاڵە . بێچارەیی وهەژاری بەردەمەوەیە کرمانی دەڵێ : ـ شیرین : شادمانی یە . هی ترش و تاڵیش : خەفەتە

خووانچە ( سەلەبێ یاسینی ) ابن سیرین دەڵێ کە ـ ی بیینێ نانی لە سەرەو لێشی دەخوارد : ماڵی خۆڕایی دەستدە کەوێ کرمانی دەڵێ لە پیش نانخواردنێ دا ـ هەڵگیرێ : نەخوش دەکەوێ و بێکار دەبێ .جابردەڵێ ئامادە کردنی ـ لە خەوندا باشەو هێزە . لە سەر ـ نان زۆر خواردن : نیشانەی تەمەندرێژی یە کەلەسەر ـ زۆر جۆرە چێشت هەبێ ڕۆزی وشادمانی یە

خۆر : خەوێکی خۆشە نیشانەی ئاوەدانی و زۆر وزەوەندی و بەهرەو سامانو پایەیە کەبیینی لە شوێنی مانگ یاخۆرجێ نیش بووە : دەبێتە پادشا وەبەهۆی وی یەوە هێمنیو ئارامی پەیدا دەبێ ئاوابوونی خۆر: پیری بەختەوەرە . کەتیشکی ڕۆژ بستێنی سامانی لە پادشایەکی

ردستێنێ . کەمەند یا رستەیەکی لەکۆی خۆر یامانگ بکاو دەستی لەکەمەندەکە بدا : لەپادشاوە یاریو هێزی پێ دەگا . کەمەندکە بپسێ و ئەویش بکەوێ : لەپایە و شکۆ دەکەوێ . کەببینێ ـ و مانگ و ئەستێران لەشووێنێکی دا کۆ بوونەوەو هەمووی گرتن و ڕووناکی لێ ئەستاندن : دەبێتە پادشایەکی وا هەموو پادشایەك سەری بۆ شۆڕ دەکات . کە ـ و مانگ و ئەستێران بگرێ لەکاتێکدا تاریك بوون : نیشانەی مەرگی‌یەتی . کە ـ ی بپەرستێ : لەپادشا یا لەگەورەیەکی‌یەوە نزیك دەکەوێتەوە . کە ـ قسەی لەگەل بکا : لەلایەن پادشاوە جێگاو پایەو سامانی‌دەست دەکەوێ . گرتنی ـ یا کردنە ماڵی خۆ: بەگەورەیی گەیشتنە . کەخۆی بوویێتە ـ : دەبێتە میر و خونکار یا ڕێز و پایەو بەهرەی دەست دەکەوێ . دیتنی ـ و مانگ نیشانەی پادشایی و گەورەیی‌یە کە ـ لەماڵی وی دا بەخاوێنی و پاکی هەڵبێ : لەخزمان ژنی دێنێ . کە هەور یاچتێکی تر ڕووی ڕۆژێ بگرێ : باری میری یاخەڵکی خراپ دەبێ کە ـ لەژێر پەردەی تاریك دەربێ : پادشا نەخۆش دەکەوێ بەڵان زوو چادەبێتەوە کە لەگەل ـ ی شەڕی بکا : لەگەل پادشا ویاگەورەیێکی تووشی شەڕێ دێت . تاریکی ـ خەوم‌خەفەتە . کە ـ بێتە سەر زەوی : پادشای ئەو وولاتی لی‌دەکەوێ . کە ڕۆژ بەناو کونێکی دا بڕوا و گومبێ : نیشانەی کەوتن یامردنی پیاوێکی گەورەیە

خوران : بڕوانە ( خورشت ) .

خورجێن : بڕوانە ( توورەکەو خورجێن ) .

خوودە : بڕوانە ( کڵاو زرێ ) .

خورشت . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ ی لەش یاد کردنی خزمانە و بۆ وان بـە پەرۆش دەبێ . کرمانی دەڵێ ـ ی لەش : خەمخۆری خزمانە و لەڕێـگای واندا ڕەنج کێشانە .

خورما . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ خواردن‌و دەنك فڕێ دان : ماڵ و داخوازیە کەبینێ ـ ی دەخووارد ئەگەر لەدەستەی زانستی‌یان بێ : زانینی پتر دەبێ . کەبازرگان بێ ماڵی پتر دەبێ . ـ ی نەگەیشتوو خوواردن : میراتی منـداڵانی دەست دەکەوێ . کەبینێ لەماڵی و ناوا خورمایەك بەری زۆر دەداو دارەکەشی وشك بووە : لەگەڵ گەورەیێکی خزمایەتی دەکات‌و سوودی لێ دەبینێ کەدارە خورمایەکی ووشك لەماڵی واندا شین بێتەوە . ئەگەر نەخۆش بێ چاك دەبێتەوە . کەخورمایەکی لە بنەوە ببڕێ : یەکێك لەماڵی واندا نەخۆش دەکەوێ . کەبینێ ـ ی تازەی هەیە : ماڵی بەسەختی دەستدەکەوێ . جابریش دەڵێ ؛ کەبینێ ـ ی هەیە : ژنێـکی دەوڵەمەند دێنێ .

خوری . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی بەرگی خوری : سوودە . دیتنی ـ بەهەموو جۆرێـکی : ڕۆزی ڕەوایە ، کەبا نەدرابێ کەسێك ـ بەوی بدات یـا کڕیبێ : هێندەی وی ماڵی دەست دەکەوێ . کرمانی دەڵێ : ـ لەخۆ دوور خستنەوە ماڵی خۆ لەناو بردنە . ـ بسووتێنێ : ماڵی خۆی بڵاو دەکات . کەبەرگی ـ پۆشیبێ : لەلایەن ژنانەوە ماڵی بێ دەگات . کەپۆشاکێـکی خوری بپۆشێ : لەژنانەوە ماڵ بێ دەگات .

خۆشاو . خواردنی ـ مالّی زەوار نایینی باکە . کەبیینیّ یەك ـ ی داوەتیّ وخواردیەوە : مالّی دەست دەکەویّ . کەنەیخوواو بیرِیّژی : بەپیّچەوانەیە خۆش رِابوواردن ; دەستکەوتیّکی زۆری سەرسامی هینەرە ، خـەرمانی بەهرەبە

خۆلّ ( خاك ) ابن سیرین دەلّیّ ؛ ـ کەم و زۆر بارەیە کەبیینیّ ـ لەمالّی ویدا هەیە هێندەی وی پوول دەست دەکەویّ بەبێ رِەنج . کەبیینیّ ـ ی دەمالّی یادەیخووا یاکۆی دەکردەوە یا ـ ی هەلّدەگرت ; هەموی برێتی یەلەمالّ و سامان . کرمانی دەلّیّ ؛ کەبیینیّ ـ ی لەمالّی خـۆی دەبردە دەرەوەو بلاّوی دەکردەوە : مالّی خۆی بەبێ جیّ بلاّو دەکاتەوە بەدەستی ـ بلاّو کردنەوە ; مالّ لەناو بردنە .

خۆلەمێش ابن سیرین دەلّیّ ـ لەخەوندا : مالێکی پووچ و ناپایەدار .

خونچە لەکانی خۆی دا ـ دیتن : باشە . ـ بەبورکی جووان دانراوە .

خوویّ . ـ لەخەوندا پارەی سپی یە . کەبیینیّ ـ ی هەیە پارەی دەست دەکەویّ . کە ـ ی بخووات ; دەبێتە پاریزگار لەلای هێندێکانیش دیتنی ـ : دوژمنایەتی یە .

خوویّن . کەبیینیّ ـ لەلەشی وی دەرِوا ; هەواو هەوەس و خۆشگوزەرانیە دیتنی ـ دەولەمەندی و مالداری و گەورەیی یە . ـ خواردن تۆلە و سزای سەختە . ابن سیرین دەلّیّ ؛ کە ـ بەبێ هەواو کێم لەلەشی وی بێ زیانی بێ دەگا . کەبەشیری لەلەشی بدریّ و خوویّن رِەوان بیّ : زیانێکی زۆرو درێژە بەلاّن لەو زیانەی دا بۆ وی خێری تێدایە . کرمانی دەلّیّ کەلەخەوتی دا بیینیّ ـ ی دەخوارد ; مالّی نارِەوا دەخوات ، یا خوویّنی نارِەوا دەرِێژیّ کەبیینیّ لەلەشی و ی دا کونێکی تیّ بوو خوویّنو کێمی لیّ دەهاتە دەریّ و بەرگەکەشی تێوە چوو ; هێندەی وی مالّی نارِەوای دەستدەکەویّ کەبیینیّ لەهەرامەیەوە ـ دەرِوات : کچێکی دەبیّ .

کەلەباشەوەی خووێن بڕوات مالی نارەوای دەست دەکەوێ. کە ـ
لەبن ددانی وی بێ : لەلایەن خزمانەوە تووشی خەم و خەفەت دێت .
کە ـ لە کووچەو کۆلانانی شاری بڕوات : لەوێدا خووێن دەڕێژرێ
و کوژتار دەبێ . ـ لە کەپۆ هاتن : مالی نارەوا دەست کەوتنە و بێ
ئابڕوویی یە ، بەلان کەبەرگی خوێناوی نەبێ : نیشانەی هەژاری یە .
خووێن بەردان . کەبیبنێ شووشە کەی بشکێ : ژنە کەی دەمرێ یا بەرەلای
دەکا جابر دەلێ ؛ دیتنی خووێن بەردەری پیر : بەختی خەوبینی یە .
خووێن بەردەری جحێل : دوژمنی وی یە . کەخەون بین زانابێ : دەچێتە
مالێ کۆ کەرەوە یا میرزای پادشای کەنەخوێندەوار بێ لەناو قەرزاندا
دەخنکێ . کەبینێ خـووێن لەدەماری بەردەدەن لەدوژمنێکەوە
ووتەیێکی ناخۆشی گووێ لێ دەبێ یامالی لەناو دەچێ کە دەماری
بکەنەوەو خووێنی لێ بێ لەلایەن پادشاوە ئازاری پێ دەگات . کە
خووێنەکە کەم بێ : ئازارە کەشی کەم دەبێ کە زانایەك لە دەماری
خوێنی وی بەرداو خوێنیش زۆر بێ و بچێتە ناو تـەشت یا ئامانێکی :
نەخۆش دەبێ و نانی خۆی لەنەخۆشیە کەی دا دەچووێنێ . ( اسماعیل
اشعث ) دەلێ ؛ کەخووێنی لەڕەگی دەستی ڕاستی بەر درێ : مالێکی
کەدەیەوێ دەستی دەکەوێ . کەهی دەستی چەپی بێ : مالی دۆستانی
پتر دەبێ کەبە کێکی ناودار خووێنی لەدەماری وی بەردا : ژنە کەی
کەزگی نەبێ ؛ ئاووس دەبێ کەئاووسیش بێ کچی دەبێ . ـ لە کەپۆ
بەربوون : بێ ئابڕوویی و ڕیسوایی یە . ابن سیرین دەلێ ؛ کەخووێن
بەردەرێکی بێگانە خووێنی وی لەشووێنێکی بێگانە بەردات ئەمانە ـ
تێکی دەخاتە ئەستۆی خۆی کەخووێن بەردەر دۆستی بێ : ئەمانەتێکی
پێ دەسپێرـ ـرێ . کە ـ دوژمن بێ : لە شەڕی وی دلنیا دەبێ و لەخەم
ڕزگار دەبێ ئەو کەسە کەجحێل بێ : هەر ئەو واتایەی هەیە .

کەپیر بێ : ڕێزو گەورەیی دەست دەکەوێ .

خووێندنی باڵندان : سپڵەیی ژنانە .

خووێن ڕێژ : مەرگە بەهۆی کارەساتێکی ،ڕۆ خۆی بێێتە - ڕوو لەکارو باری نزم دەکات .

خێر . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەزانایەك -ی بکات ، لەوەوە سوود بەخەڵك دەگات . کەپادشا -ی بەخەڵکی بکات دادی بەهەموو کەس دەگات ابراهیم دەڵێ ؛ دیتنی - ، نیشانەی دڵنیایی و هێمنی یە . کە دەردمەندێك بی بینێ : لەدەردی ڕزگاری دێ . کە گیراو بی بینێ ؛ بەر دەدرێ . قەرزدار بی بێنی ؛ قەرزی بۆدەدرێتەوە . - وەر گرتن ، کەیفخۆشیەکی چاوەڕێ نەکراوە .

خێیز . ابن سیرین دەڵێ ؛ - لەخەوندا نیشانەی قازانج و ماڵە . کەبەناو - دا بڕوات بۆ گوزەران ، خەریکی کارێکی دەبێ . کە -ی بـدا بەکەسێکی : هێندەی وی سوود بەو دەگەیەنێ .

خییـکە . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی - لەخەون دا کەشیر یا ماستی تێ دا بێ ، پیـاوێکە کە بەدەستی وی ماڵی ڕەوا پەخش و بڵاو دەکات بـۆ کارانی خێر وەکوو پـرد و مزگەوت و ڕێگایان .

-ی هـەنگووینی پیـاوێکی زانـاو ڕێ نیشان دەر و هـۆش دەرە . کەبینێ - یەکی هـەیە یا کڕی نیشـانەی وەیە لە گەڵ پیاوێکی وا دۆستایـەتی بەیـدا دەکات و خێری لێ دەبینێ .

کە - کەی لێ بدزن لەچنی وا دوور دەکەوێتەوە .

خێوەت : ابن سیرین دەڵێ کەسێکی ببینێ کەلەناو خێوەتێکیدا دانیشتوە:
لە سامانی دونیایە دا چتێکی دەست دەکەوێ یاژنێکی بە تایبەتی هی
خۆیەتی . کەببینێ ـ ە کەی ڕەنگ دەکرد : لە ڕێگای گوزەرانی دا
نەخۆشدە بێ . کەخاوەند ـ ی نەناسی و ـ کەی سەوزو سپی ببینێ :
نیشانەی خێرو چاکەیە . کەببینی لە ناو ـ ێکی سەوز دا دانیشتوە لە
ڕێی خوادا دەکوژرێ . کەببینێ ـ ە کە هی خۆیەتی ؛ ژنە کەی ئاینداز
و پارێزکارە . کەببینێ ـ ە کەی سپی یە مالّ و سامانە . کەسور بێ :
خەریکی کەیف و بەزمی دونیایە دەبێ . کە ـ شین بێ خەم و خەفەتە
کەرەشبێ : سوودیکی کەمە . کە ـ ە کە هی خۆی نەبێ : واتایە کەی
باچاکەو خرابەوە دەگەرێتەوە سەر خەون دیبووی کەببینێ ـ ی بۆ
خۆی هەڵداوە و یا کەسێك بۆی هەڵداوە ولە ناوی دا دانیشت کەرە ـ
شبێ : هێندەی گەورەیی وی مالّی دەست دەکەوێ کە بازرگان بێ :
دەچێتە کۆچ (سفر) ولە وێ دا مالێکی زۆری پێدەگا کە گەزرەیەك
ئەو خەونەی ببینێ خەم خەفەتە کە ـ ە کە کۆن بێ زیانی پترە
کرمانی دەڵێ کەببینێ لە خیوەتی دەچێتە دەرێ : ئابڕوو و گەورەیی
دەستدەکەوێ کەببینێ پادشا لە بەر دەرگای خێوەتی دانیشتوە کاروبا
ـ ری باش دەبێ و بەسەر دوژمنانیدا زالّ دەبێ . کە پادشا ئەوی بانگ
کاتە ناو خێوەتێ خۆی و تێ یدا دانیشێ : لە لایەن پادشاوە قەدرو
گەورەیی دەست دەکەوێ و کارو باریشی پێکدێت

دادپرس : بروانە قاضی

دار : کەبیبنێ دار لە گەڵ وی دا خووێ وبۆوی لە بار بوو : کارێکی وا دەکات کە خەڵکی سەر پان تێ یدا سوور دەمێنێ . کە ـ ی لە شوێنی خۆی هەڵکەنێ : نەخۆش دەبێ یا لەو شوێنی دایکێك نەخوش دەبێ یادەمرێ . جابری مغربی دەڵێ کە لە ژێر سێبەری ـ ێکی دانیشتبێ یا نوستبێ : لە پەنای پیاوێکیدا دەبێ کە بەندبواری بەدارە کەوە هەبێ. ابن سیرین دەڵێ کە مرۆ لە خەونیدا ـ ی تەڕ یا وشك بیێنێ نیشانەی شەڕ وهەرایە . کە لە دەشتێ داری کۆبکاتەوە : دەبێتە فێلباز وبەدکار بە دار هەڵچون : پایەوپلەو سەر کەوتنە لە ـ کەوتنەخووار . گۆشە گیریە ـ لە ڕیشە هەڵکەندن : پیاوێکی لە پایەو بەهرە کردنە داری (بڕاو) کە بۆسووتاندنو دارتاشان بێت : دوو ڕوویی یە . کەبێگانەیێك بیداتێ لە گەل وی نیکەرانی و ناکۆکی پەیدا دەبێ . داری خوارو ڕاست لەخەوندا وەکوو یەکن . ـ ی ئابەنوس : پیاوێکی لە کارو باری داماوە . هێندێکیش دەڵێن ژنە یا کەنیزە کە . ـ ی بڕاو کە ئەکەلەیە کە بە ئەنجام ناگات ـ ی بلندو بەرز : بەرزی کارو بارە دەرگای کار کراـ نەوەیە ـ ی تێکچڕژاو بڕ : ماڵ و منداڵی زۆرە ـ ی جەنگەڵ و لیرە.

واران : خۆپەسندی وبەد ئەنجامی یە دانیال دەڵێ : دیتنی ئەو دارانەی کەلەلای خەڵکی خۆشەویستن : دیتنی پیاوی گەورەیە . دیتنی ـ ی بێ نرخ : دیتنی پیاوی نزمە . ـ ی بەردار : پیاوی دەولەمەندە . هی بێ بەر : مرۆڤی هەژارە . دار لە باغدا : ماڵە بۆ خاوەندباغ . ـ هەڵکەندن : پیاو لە نازو نعمت کردنە لە ڕیشە هەڵکەندن : پیاوێکی لە پایەو بەهرە کردنە

داری بادامی ژنێکی جووانەهێندێکیش دەڵێن ژنێکی بەد کرداره داردەستی
بنەنگلی : کۆمەڵو پارێز گاری بە هێزەبە کار بردنی -باری بڕ مەترسی یە
داری ترنجی : پیاوی نا کۆكو کەللە رەقە هێندێکیش دەڵێن : پیاو ـ
ێکی خاوەند جێگاو بەهرەیە ـ ی چناری ؛ پیاوێکی پیرۆزە کە لەوە ـ
وەسود بەخەلکی دەکات دارچینی : ابن سیرین دەڵێ : ـ ی خەمو خە ـ
فەتی پتر دەکا. کرمانی دەڵێ : کە ـ ی بۆ نەخۆش بخواتو سوودی
لێ ببینێ : سودەو کەلکە. ـ ی خورما : دووا رۆژی روونالکو پیاوی
خانە دانە . کە ـ لە مالی بێ : دەبێتە ئاشنای گەورەیەکی . گەلای ـ
شانازیەو شانو شکۆو پیرۆزیو سەر کەوتنە
داری زەرد : نەخۆشی و رەنجە ـ ی زەیتوونی : ئاشتی و تەبایی یە لە ناو
خانەوادە داشانازی یە بۆ وولات پیاوێکی خانەدان و دەستکورتە ـ ی
سەروو: پیاوێکی توندوتیژە ـ ی سنەوبەر :پیاوێکی دەروێشی بێ ئاینە
: ـ ی سنجو پیاوێکی لەش سووك و بێ شکۆ وناسك ومیهرەبانە . ـ ی
سێوی پیاوێکی توندوتیژە ـ ی شەفتالوو مێوەی لەایی هولوو گچکە
ترە وهەروەکوویش وایە :
پیاوێکی دەولەمەندو نەرمو لەسەرە خۆیە ـ قەرەلوو پیاوێکی پزیشکەو
بەهرەی بە هەموو کە سێکی دەگات ـ ی قەیسی پیاوێکی، نەخۆشە
ـ گولدار : سوودەو کەلکێکی زۆری هەیە ـ گوێز : پیاوێکی نابەلەد
ناشی یە بەلان لەگەلێ خانەوا دەی خۆی دلفراوانە کە خۆی لە سەر دارە
گوێزی ببینێ . لەگەلێ پیاوێکی وا نزیکی پەیدا دەکات ـ هەرمێ :
پیاوێکی خۆش خوو و سازگار ودەولەمەندە ـ ی هەناری : پیاوێکی
دەولەمەندێکی سوود دارە . هێندێکیش دەلێن ژنێکی دەولەمەندو
شایانە ـ هەنجیری : پیاوێکی دەولەمەند و خاوەند بەهرە یە

دار  هە ـ یێکی کە مێوەدار بێ  نیشانەی خێرو بەهرەیە بە پێی بەرژەو
ـەندی میوەی دارە کەی ئەگەر کەسێك ببینێ کە لە داری مێوەدار
میوەی دە خوارد هێندەی وی سوودی لە کەسێکی دەست دە کەوێ
هێندێکیش دەڵێ‌دیتنی دار لە خەوندا ؛ ژنە کە داری لە ماڵی پادشادا
ببینێ : نۆ کەری پادشایە ـ ی درواوی‌پیاوێکی بەد خووی ناساز گارە
کرماڵی دەڵێ : رەگ و ریشەی داران لە خەوندا نیشانەی قایلی
خوودایە لە ئایندا . لکی داران : بریتی‌یە لەبرایان‌وخزمان و منداڵا ـ
نی وی  کە ببینێ لکی داران زۆرن : خزم و خانەوا دەی وی زۆر
دەبن. گەڵای دار  خۆشخو و‌یەو برایەتی یە . کەببینێ ـ کەی دەبرێ
یافرێ‌ی‌دا  دەمرێ یا باری تێکدەچێ یا نەخۆش دەبێ و یا خزمێکی
دەمرێ کەببێنێ لە ماڵی خۆی یا لە ماڵێکی تر دا چەند جۆرە دارێك
هەیە : هەر وەکوو لە سەرەوە وخووارە وە ودەرەوە و ژوورەوە دا
دەیدیتن ؛ کارەسات لەو ماڵی دا روو دەدا . کەببینێ‌بەداری هەڵدەچێت
: سەر دە کەوێ ودڵنیا دەبێ. کەمیوەی ـ ان‌بخوات  منداڵی زۆر دەبێ

دار تاشی  ابن سیرین دەڵێ : ـ لە خەوندا چاك خوازی خەڵکە بەڵان دۆ ـ
ستایەتی لەگەڵ خەڵکی دوو روو یابەد ئایینەوە کاو لە سەر هەوەسی‌وان
دەجوڵێتەوە . چونکوو خاوەند دار  لە خەوندا دیتن : دوو روویی یە
: جعفری صادق دەڵێ : دار تاشی لە خەوندا مامۆستای منداڵانە نەزان
فێرە خوێندەواری دە کات

دار دەست : ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لە خەو ندا ؛ پیاوێکی گەورەیـە
کە ببینێ ـ ی لە دەستی دایە ؛ پایەو گەورەیی دەستدە کەوێ شکاندنی ـ
: تێکچوونی زەماوەندی زاواو بوو کە. پاڵ بە ـ ، وەنان(خۆخستنەسەر
ـ ) نەخۆشی و نلسازی سەختە . بە ـ لە کەسێکی دان : دۆستایەتیکی
پایە داروراوەستاوە
داس ابن سیرین دەڵێ کە کەسێک ببینێ ـ ی لە دەستی دایە ؛ مرازێکی
دروست دە کات ولەوەوە سوودی دستدە کەوێت . کە بە ـ ی دروێنەی
بکات : ماڵو بەھرەی دەستەوە کەوێ کە ـ ە کەی لێ بزربێ یالەناو
چێ : ئەم کوری ماڵە مغربی دەڵێ کەببینێ داسی زێرین یا زێوینی
ھەیە: کە ماڵی نارەوا چێتێکی دەستە کەوێ . کە بە داسی زێرین دروێنەی
بکات : ماڵو بەھرەی دەستدە کەوێ .
داسوولکە : واتایە کەی ھەر وەکوو ھی مشاری وایە
داغ : ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ماڵ و گەنجە . کەببینێ ـ دە کری:ھێند-
ەی وی ماڵ لە ڕێگای خودایدا دەبەشێتەوە و لە دووا ڕۆژدا لە کارە-
ساتان ڕزگار دەبێ . کرمانی دەڵێ کە لە شوێنی ـ کێم و خوێن بێ ; لە
پادشای نزیك دەبێتەوە . کە ببینێ یە کێکی داغ دە کات : ووتەی ڕەقە وەیا
بوختانی پێ دە کەن کە بۆ نەخۆشێکی پشتی داغ کرێ : چاکەو
خۆشی یە
دالان (پێلایی) : کرمانی دەڵێ ـ لە ماڵیدا نۆ کەرە کەببینێ ـ ئاوەدانە و
باشە : نیشانەی لەش ساخێتی یەو ڕیكو پێکی نۆ کەری ماڵی یە کەببینێ
ـ خراپە بە پێچەوانەیە مغربی دەڵێ : کەببینێ ـ ی ماڵی دیوارە کەی

خشتی کالێو گلە ، نۆکەرەکەی یاخزمتکارەکەی کاربین و ئاشتی کارە .
کەدیوارەکانی لە گێچ و خشتی پوخت یا لە بەردی بێ : نۆکەرەکەی
دووزمان و بێ ئاینە،

دان : ابن سیرین دەڵێ : کەببینێ ماڵی خۆی لە کاری خێریدا دەبەشێتەوە
: ژن بۆ کوڕی دێنێ ویا بۆ یەکێك لە خزمانی خۆی ژن دێنێ وەیا لە
وان یەکێکی بەمێرد دەدات وماڵی خۆی بە سەر یاندا دەبەشێتەوە . کە
ماڵی خۆی لە ڕێگای خراپەدا بدات : ڕوو لە کاری خراپ و دزی
دەکات . کە ماڵی خۆی بەسەر بێگاناندا بیەشێتەوە : باری ژیان و مانی
تێکدەچێ

دان ، بڕ وانە ( دەغل )

دانە ( حب ) ابن سیرین دەڵێ کە - خواردن بۆ نە خۆش کە سوودی
لێ دیتبێ : لە کارو باری دا سوود دەبینێ . کە سوودی لێ نەبینی :
بە پێچەوانە یە

دانیشتن . ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ لە سەر زەوی دانیشتووە : لە کۆچ
(سفر ) ی کۆچ دەبینێ . لە سەر زەویش نوستبێ هەروایە صادق دەڵێ
کەببینێ لە سەر ئەسپ یا ئێستر یا کەرێ دانشتووە بەختو فەرمانڕەو-
ایی و دەوڵەت و کامرانی یە . لە گەڵ چەند پیاوچاکێکی دانیشتبێ :
نیشانەی باکی ئاینیە

داو : ابن‌سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا : فرت و فێلە . کە ببینێ پێی خۆی بە
ـ ە وە بێ : بە پێچەوانە یە . مغربی دەڵێ : کە جانەوەرێکی بەداوی
گرتبێ . ئەو کەسەی کە بەو جانەوەرەوە بە ندیواری هەیە بە فێل
دەیهێنێتە ژێر دەستی خۆی

دایەن : فرمێسکی پەرۆش و ناهومێدی‌یە .
کەبینێ ـ شیری بداتێ : توو کی خراپ و ناپەسـندە .

دەباغی . لەخەوندا : بەجێ هێنانی کار و فەرمانە . کەلەخەونی‌دا ببینێ ـ دە کرد : دەبێتە دەباغ : لەلای کرمانی فەرمانداری‌و میراتە .

دەرپێ . لەخەون دا : ژنی گێل و خراپە . ـ لەپێ کردن : نیشانەی ئەوەیە ، کەژنێ دێنێ یا کەنیزە کێکی ڕادە گرێ . ـ دڕاندن : کەم و کووڕی ژنە . کە ـ ی لێ گوم بێ : ژنە کەی لێ جووێ دەبێتەوە . کە ـ ی لێ بسووتێ : کارەساتێك بەسەر ژنە کەی دێت . کە ـ یە کەی لۆکە یا خوری بێ : ژنە کەی توورەو سەر کێش دەبێ : کە ـ یە کەی کۆن و چلکن بێ : ژنە کەی هێدی و ئارام و مەند دەبێ . کە ـ یە کەی ئاوریشم بێ : ژنە کەی هاودەم و دۆست‌وبەفیز دەبێ . کەتازە بێ : کەنیزە کێکی گێل دە کرێ . کەبینێ مار یادووپشك لەنێو دەرپێ‌یە کەی وی دایە دوژمنی خۆی لە گەڵ خێزانە کەی وی داوێن پیسێتی دە کات .

دەردە داری : ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیبێ یە کێك لەشی وی ئازار داوە و خووێنی لێ بێ : ئازار دەر ووتەیە کی ڕاست بـەوی دەڵێ . کەبینێ خوێن‌و ،کێمی لێ برینە کەی دێ ئازار دەر ووتەیە کی درۆ بەوی دەڵێ و ئانووتی لێ دەدا کەسێکی لەلەشی خۆی دا ئازارو دەردێکی زۆر ببینێ : سوو دی دەست دە کەوێ

دەردی لەش . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ هەموو لەشی وی دێشی : ماڵێکی کەهەیەتی لەدەستی دەردەچێ . کەسەری بێشێ : گوناهان زۆر دە کا، لێ‌یان پەشیمان دەبێتەوەو خێریش دە کا نێو چاوانی بێشی : نیشانەی بێ ئاینی و خەم‌و پەرێشانی‌یە . کەچاوی بێشێ‌و دەرمانی بکا ڕێگای ڕاستی نیشان دەدرێت . کە گووێی بێشێ : ئاخەفتنی ناخۆشی گووێ لێ دەبێ کەبۆی بێشێ : بۆنی چتی ناخۆش دە کا . زمـانی بێشێ : لە ئاخەفتنێکی دا زیانی پێ دە گات . کەزمانی خۆی بەبڕاوی ببینێ باشی و پارێزگاری‌یە . کە مەلاشووی بێشێ یا هەلامـێ :

مانی کەسێکی دەخاتە پشت گووێ . زاری پێشێ : خەفەتی زۆر دەبێ گەردنی پێشێ : سپاردە (أمانەت) پێك لە گەردنی وی دایەو نایداتەوە . بەخاوەندی . کەدڵی پێشێ : نیشانەی دڵرەقی‌و بێ بەزەیی‌تیە . کەزگی پێشێ : مالی نارەوا دەخووا . کەپشتی پێشێ : بەهۆی خزمانەوە تووشی ئازار دێت ئێشانی جەرگ : بەزەیی و دڵسۆزیتی‌یە لەبارەی مندالەـ کانی خۆی‌دا . کەدەستی پێشێ : لە گەڵ هاورێ یالەگەڵ برای خراپەی دەکا . کەلاقی یالوولاقی پێشێ : خزمان ئازار دەدات . کەقامکەکانی پێشێ : خێزانی دەرەنجێنێ . کەمرازی شەرمی پێشێ : تووشی کاری نارەوا دێت . کەپێی پێشێ : بەسەر ژێر دەستان دا بەزەیی نایەت .

دەرزی . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا ببینێ ـ هەیەو لەدەستی ڕاستی‌دا چێکی پێ دروو : کارو بارە بلاوەکانی وی کۆ دەبنەوەو ئاتاجی وی پێك دێ کرمانی دەڵێ ؛ کەببینێ بەرگی دەدرووێت : باری وی باش دەبێ . کەـ یە کەی لێ وون بێ : کاروباری لێ تێك دەچێو ئاواتێکی کەهەیەتی پێك نایەت . جابر دەڵێ کەببینێ یە کێك ـ داوە بەوی : ئەو کەسە لەکاروباری وی‌دا میهرەبانی دەنوێنێ . کەـ زۆر هەیێ : سوودو کەلکە . کەـ یە کەی لێ بەزن : کاروباری تێك دەچێ . کەـیە کەی لەجێگایەکی ڕاکا ئەنجامی کاروباری خۆش دەبێو بەئاوات دەگات

دەرك . لەلای دانیالی ژنە . کەببینێ دەرگەکانی ناسراو لەبەرامبەری‌دا کرانەوە : دەرگایانی سامانو بەهرەی گێتی لەسەر دەکرێتەوە کەببینێ ئەو دەرگایانە کە کرانەوە ڕوویان لەرێگایە دابێ : مالێکی کەهەیەتی بەزوویی لەرێگای چاك و خراپ‌دا بلاوی دەکات . کەـی سەرایێ لەبەرامبەری وی بکرێتەوە . مالێکی لەپادشای دەستدە کەوێ بۆمنالان دەچووێنی کەببینێ دەرگای سەرای وی شکا تووشی ئازار دێت .

ا ن سیرین دەڵێ ؛ کەبیینێ دەر گای سەرای ویان هەڵکەندو بردیان و نەزانرا بۆ کوێ یان ؛ د ئازار و ئاەۆی خاوەند ماڵە. کەبیینێ دەر گای وی لەهەموو دەرکان گەورەو گوشاد ترە ؛ چەند کەسێك بەبێ دەستوور دەچنە ناو ماڵەکەی بەدوژمنایەتیو ڕووشەوە. کرمانی دەڵێ ؛ کەبیینێ دەر گایەکی تازەو قایمی تێ گرتو دایخستو قفڵیدا ژنەکەی بەرەڵا دەکا یادەمرێ. جانەوەران خۆ بکوتنە ناو ماڵیوە ؛ گەنجان پەلاماری ژنەکەی دەدەن. کرانەوەی دەر گای ئاسمان ؛ دەر گای خێرو بەهرەیە.

دەر کەوانی. ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونیدا دەر کەوانی بکات ؛ تاجی یەکی هەیە زوو پێکدێ و لەلایەن پیاوێکی گەورەوە پایەو ڕێزی دەستدەکەوێ.

دەرمان. ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیینێ دەرمانی بۆ نەخۆشی دەخوواو بۆوی سازگارە ؛ خێرو خۆشی یە. کەسێ بۆ خەڵکی دروست بکا ؛ لەگەڵ خەڵکی چاکەی دەکا. کەسێ ڕوشك بێنەوە ؛ لەخەم ڕزگار دەبێت. کەسێ بخووات و زۆر ڕەوان بێ ؛ زیانی پێ دەگا کەبەپێچەوانەبێ سوودە. کەسێ بخوواو بێ هۆش بێ ؛ لەخەم و خەفەت ڕزگار دەبێ کەسێ لە سەر زمانی ڕۆکاو قووتی دا ؛ خەم و خەفەتە. ابن سیرین دەڵێ کەسێ لەسەر زمانی ڕۆکاو بەناوێ قووتی دا ؛ ئەگەر سوودی بێ ؛ بەسوودە.

دەرمانی گەرماوێ ؛ بڕوانە قسلێ.

دەروازە ؛ ابن سیرین دەڵێ ؛ هەر کەسێکی لەخەونیدا دەروازەی شاری ببینێ ؛ دەبێتە پەردەدارو دەر کەوانی پادشای.

دەرۆزە (سوواڵ). ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی دا بیینێ کەسێ دەکردو چتیان دەدایە ؛ نیانەی خێرو بیت و پیرۆزییە. کەبیینێ بە دەر کانەوە دەگەڕاو هیچیان نەدەدایە ؛ کاروباری دەبەسترێ.

دەروێش . ابن سیرین دەڵێ ؛ دەروێشی لە دەوڵەمەندی باشترە لەخەون دا
کەبینی بۆتە دەروێش ؛ چـاك و ساخ دەبێ . بـەڵاَن دەوڵەمەندی ؛
بەپێچەوانەیە . کرمانی دەڵێ ؛ کەخێر بە ـ بکرێ ؛ لەخەم و خـەفەت
رِزگار بوونە . کەبینی بۆتە دەروێش و لەدەرکان نانی کۆ دەکاتەوە :
خـێر و سوودی پێ دەگات .

دەستە . ـ یەك لەدز و بەدکاران ؛ دەبێ ئاگادار بێ لەژیان دا لەژیان دا .
ـ یەك لەپێشەرگان ؛ ئاسوودەیی و دڵنیایی‌یە .

دەریا . کەلکەڵەو خەیاڵاتی پان و بۆرِ و ئازاری زیندەگانی‌یە . دەریای
ئارام ؛ کۆچی دوور و درێژە . ـ ی شەپۆڵاوی ؛ بێە ( خطر ) رِوو
لەزۆری دەکا ، کەندو کۆسپەو بەرهەڵستی سەختە . ابن سیرین دەڵێ
ـ لەخەون دا ؛ پادشا یا زانایەکی گەورەیە . کەئاوی ـ یێ پاكەو رِوون
و خۆش بێ ؛ پادشا پیاوێکی دادگەر دەبێ . کەئاوی دەریایێ ناپاك و
ناخۆش بێ دوژمنێکی سامناکی بۆ پەیدا دەبێ . کەبینی ئـاوێ
دەخوواتەوە ؛ پایەو جێگای لەلایەن پادشـاوە دەست دەکەوێ و یا لە
لایەن زانایەکەوە بەهرەوەر دەبێ . کەبینی ئاوی ـ ی لەکۆزەیێکی
دەکرد ؛ لەپادشاوە سوودی دەستدەکەوێ . کەبچێتە ناو ـ وە بەجۆرێکی
واکەلەشی قورِاوی بێ ؛ لەپادشاوە خەم و خەفەتی پێ دەگا . کەلەشی
قورِاوی خۆی بشوواو خاوێنی کاتەوە ؛ خەم و خەفەتی نامێنێ . کەلە ـ
یەدا مەلەی بکات ؛ تووشی زیندانی دەبێ کەبینی لە دەریایە بەمەلە
هاتە دەرێ لەزینـدان و ئازاری رِزگاری دێ . کەبینی لە ـ یەدا
خنکاوە لەکار و باری ئایینی دا دەخنکێ کەبینی لەدوورەوە
دەریایە دەبینی و نەچووە نزیکی ؛ بەهەموو ئاواتێکی دەگا .

کەبەسەر ـ یەدا بڕواو بێی تەڕ نەبێ : لەئاگری جەهەننەمێ دڵنیـا دەبێو کاروباری گیتیشی ئاسان دەبێ . کرمانیش دەڵێ ؛ کەبینێ لەـ یەدایە : لەلای پادشای گووێ لەمستو هونەرمەند دەبێ . کەبینێ چۆتە ناو دەریایـەوە : کاروباری وی لەبقە دایە . کەلە ـ یەدا بێتە دەرێ : بێ خەم دەبێ . کەلەئاوی ـ یە بخرواتەوە و سارد بێ : خەون بین کە زانا بێ : بەهرەیەکی تەواوی دەستدە کەوێ . کەوانەبێ بەپێچەوانەیە . کەئاوی ـ یە گەرم بێ : تووشی ئاوانێکی دێت . کەئاوە کە بۆگەنی و ناخۆش بێ : دوژمنێکی بەسامی بۆدەرەخسێ . جابر دەڵێ کەبچێتە ناو ئاوی ـ یەوە : سەر کەوتن و پیرۆزی یە . کەئاوی ـ یە پتر بێ : لەشکر زۆر دەبێ . کەئاوی ـ ووشك بێ : پادشاو لەشکرەکەی لەناو دەچن . کەشەپۆلێك لە ـ بەرز بێتەوە یا نێچیر بکرێ : هێندەی وی ڕۆزی دەست دەکەوێو گوزەران و ژیانی خۆی و منداڵەکانی خۆش دەبێ . کەئاوی ـ بخرواتەوەو سوویر بێ : تووشی چتی نارەوا دێت . کەلە ـ یە دور و مەرجانی دەربێنی : زانست و ئایینی دەستدەکەوێ کوژتنی نەهەنگی دەریایە : دوژمـن لەناو بردنە .

دەست . ـ ی جووان : دۆستایەتی و ڕێز و سەر کەوتنە . ـ ی سپی : دادو مرۆڤایەتی یە . ـ ی پیس : خۆ لەکاری ناپەسندەوە دانە ـ ی گەورە : دەستبلاوی یە ( اسراف ) . ـ ی گچکە : پیسیو لەچەری و قرچۆکی یە ـ لەسەر ـ دانان پایەداری و بەئاوات گەیشتنە کەفەرمانرەوایەك ـ ی ببرێ برای یاخوشکی دەمرێ . کەهەردووك ـ ی خۆی بەبراوی ببینێ : لەکار و کاسبی و ئاواتێ خۆی دووا دەکەوێ کەبینێ ـ ی خۆی بە کەبدی بریوە : دڵی بەهەوای کەسێکیەوە خەریك دەبێ . کەلەپی دەستەکانی لەسەر یەك دابنێ : لەگەڵ یەکێکی نزیکدە کەوێتەوە یا ئافرەتێکی مارە دەکا . کە بەچووار پەلان وەکوو چووار پێ یـان بڕوات و ڕووی بەرەو ئاسمانێ بەرز کاتەوە ئاواتێکی زۆر دوور دەخوازێ کەبەرەنج بۆی پێکدێ . کەهەردووك ـ ی بلەرزێ لەکاروباری دوا دەکەوێ کەببینێ هەر کەلەدایك بونەوە ـ ی وشکە : لەخێرو پیاوەتی

دادەمێنی . کەبینی دەستی بڕاوەو نەزانی هی ڕاستی‌یەتی یاهی چەپ : تووشی کارەساتێکی دێ . هێندێکیش دەڵێن دەست بڕاو : تەمەنی درێژ دەبێ . کە ـ ی ڕاستی بڕابێ : سووێندی بەدرۆ دەخووا . کە ـ ێکی لەوی تری درێژ تر بێ : نیشانەی ئەوەیە پایەو جێگاو ئاواتی دەست دە کەوێ . کەبینی لەسەر دوو ـ ان دەڕۆیشت : ڕەوای بەکاری خۆی نامێنێ ، هێندێکیش دەڵێن : سوودە لەخزمانەوە . کەدەست و پێی لە گەڵ وی بەووێن : گوزەرانی باش دەبێ . کەبینی ـ ی ڕاستی وی بۆتە زێڕ : سامانی لە کیس دەچێ . کەدەستی خۆی بەئەسپۆن یا سابوونی شوشت : ناهومێد دەبێ .

دەستە چیلە : هێز و دڵ قایمی‌یە . مـرۆی تووشی ئابڕوو و کارانی گەورە دە کا . کەپادشا بە ـ چرای هەڵکا : ژێر دەستان لەوی دادو مرۆڤایەتی دەبینن . کەزانا بیکا : خەڵکی زانستی لێ وەردە گرن . کەبازرگان بیکا : خێرو چاکەی بەخەڵکی دە گات .

دەستەوانە : لەخەون دا ـ بۆ پیاوان لەژنان باش ترە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەپیاوێك ببینێ ـ ی لەدەستی دایە لەئاسن یالەپۆلا بێ : هێزو توانایە .

دەستکەوتن . ابن سیرین دەڵێ کە کەسێك لەخەونی‌دا ببینێ چتێکی دەست کەوتووە : پیرۆزی‌یە ، هەرچەندێکی پتر بێ : باشترەو سوودی زۆر ترە . کەلەچیای کانی زێڕی دەستکەوێ : دەبێتە فەرمان ڕەوا . کەزێو بێ : ژنێکی جووان دەخووازێ .

دەستنوێژ بەئاوی پاك شوشتن. بەئاوات گەیشتن‌و لەخەم‌وخەفەت ڕزگاربونە دەشت : ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ : نیشانەی شادمانی‌یە لەلایەن پادشاوە . کەخۆی لەناو ـ ێکی گەورەو سەوزدا ببینی : دەبێتە هاودەمی پادشا کەبڕ درك‌و داڵ بێ : لە گەڵ پادشایە کی زۆردار دەبێتە هاودەم . ـ ی بڕ پیت‌و پێز : دەوڵەمەندی‌و بەختیاری‌یە . ـ ی کاول و چۆڵ : وێران کاری و بەدبەختی‌یە . غاردان لە ـ دا : ماڵ و سامانێکی زۆرە . چێشت خواردن لەدەشتی‌دا : پێك شاد بوونێکی بەختیارانەو بەردارە .

دەغل : ابن سیرین دەڵێ : ـ ی کاڵۆ کوڵیو : خەمو خەفەتە . کرمانی دەڵێ کەببینرێت ـ ڕژاوەتە سەر زەوی : نرخی هەرزان دەبێ . هەر جۆرە ـ یێکی بیباتەماڵی خۆی یالەجەواڵی کات : نرخی گران دەبێ . کەبیینێ مردو ـ ی بەخەڵکی دەدەن : ئەو ـ ە هەرزان دەبێ .

دەفـە ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لێ دان : چاکە و بەهرەیە . کەبیینێ ـ ی لێ دەدا لە کرداری باش لادەدا . کرمانی دەڵێ کەبیینێ ـ ی لێدەدا وشارەزای ئیدانی بوو : ژنێکی خـراپ دێنی . جعفری صادق دەڵێ ؛ دەنگی ـ لەخەوندا : شادمانی‌یە . کە کەنیزە کێك لێی بدا : چێکی بەناوبانگ بەوی دەکات . ـ لێ دەر ئازاد بی : کارێکی ئاشکرایە . کەدەفە لێدەر گەنج بێ : لەگەڵ دوژمنی خۆی چاکەی دەکا . کەپیر بێ . واز لەچاکەی دێنێ . کرمانی دەڵێ کەبیینێ ـ لێدەر وەستاو باشە : ژنێکی جووانو بەدکردار دێنێ . جعفری صادق دەڵێ دەنگی ـ لە کەنیزەك بیستن شادی‌یە . لەپیاوی پیر : بەختە .

دەلاڵی کردن : ابن سیرین دەڵێ ـ : ئامۆژگاری‌و ڕابەری چاکەو خێری‌یە دەڵەك : پیاوێکی دەوڵەمەند و ئاوارەیە . گۆشت و پیست‌و ئێسکی وی لە خەوندا ماڵ و خوواستەمەنی‌یە . کە لەگەڵ ـ ی شەڕی بکات : لەگەڵ پیاوێکی ئاوارە دوژمنایـەتی دەکا . کەبیینێ ـ ی کوژت و کەولی کرد : ماڵی ئاوارەیەکی دەخووات .

دەسکە گوڵ : ڕازی و قایل بوونێکی سـەردەمی یە . ـ ی سپی : بە ئاوات گەیشتنە . ی سوور : سەودای سەختە . دەسکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ خۆشێکی فریو دەرە ـ ی دەستکرد : فێڵ و فەرەجـە . ـ پێشکەش کردن : دەنگ و باسی درۆ و هەڵبەستە .

دەمار ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا کۆکەرەوەی کار و باری وی‌یە . کەبیینێ ـ ی لەشی ووشك بووە یاپسـاوە : وادە گەیەی : کەسێکی پشتیوانو کۆکەرەوەی کازو باری ویە لەوی گومدەبێ یادەمرێ

دەمار سرِیتی‌یە لەخزمو ئەندامانی‌ناوخانەوادە ئەگەر ببینێ کەدەمارەکانی وی ئەستوورو بەهێزن : باری خزمو خانەوادەی‌وی بەدوبێ‌تین دەبێ دەلاکی گەرماوێ: بەدگۆیی‌و پاشلەو جەورو جەفایە

دەموچاو : ابن سیرین دەلێ کەببینێ دەستو ـ ی بەئاوی پاك دەشوشت : لەخەمو خەفەت رزگاری دێت کەنە خۆشبێ : چاك دەبێتەوە کەقەرز داربێ : قەرزەکانی بۆ دەدرێتەوە کە ببینێ یە کێک ـ ی وی دشووشت وئەویش تێ بِرادەما ئاواتی پێکدێ . کەدەم و چاوی وی بە ئاوی پیس بشۆرێ: بەپێچەوانەیە. کرمانی‌دەلێ‌ببینێ‌بەهەر دوو کـەدەستەکانی دەمو چاوی خۆی دەشوشت ؛ لەدۆست و هاودەمان داوای یارمەتی‌وکار دەکات

دەنـک : ـ ی پیاو کەبلێندبێ : لە ناوخەلکێ دا گەورەیی دەستەو کەوێ کەیە کێك ببینێ ـ ی بلندبووە : ناوو ناوبانگی بەرز دەبێ . کەدەنـگی نزم بێ : بەپێچەوانەیە . بەرزی ـ بۆپیاوان : مایەی ناموس‌و بەرزی یە بەلاّن بۆژنان باش‌نیە .

ـ ی جانە وەران لە خەوندا : خەم و خەفەت‌و کارەساتە کە لەشوێنێکی دوورە وە بانـگی بـکەن وەلاّمی بداتەوە : زوو دەمرێ کەوەلاّمی نەداتەوە ؛ نەخۆشەە کەوێ بیستنی ـ ی گریان ؛ شادمانیە ـ نالە : چتێ ناخۆشە کە گووێ‌ی لە ـ ی گریان و زاری بێ : مرازی پێکدێ و بە سەر دوژمناندا زالّ دەبێ . کە ـ ی جنێوی گووێ لێ بێ :

چتێکی ناخۆشی بەسەردێ بەلاّن لادەچێ . ـ ی ئەسپی : مزگێنی یە .

ـ ووشتری گووێ‌لێ‌بێ : دەچێتە. دیمەنی‌مالّی‌خووای‌یابازرگانێکی‌بِرسوود

ـ مەڕی : سوودێکی گەورەیە . ـ ی بالەی کیسکەو کاریلەی گووێ لێ‌بێ شادی وبەهرەیە . ـ ی ئاسکی گووێ‌لێ‌بێ : کەنیزە کێکی دستدە کەوێ

ـ نەررەی شێری : ترس‌و هەراسە لە میری . ـ پلنگی : شەر و دۆستایەتی یە

ـ گور کی : پیرۆزی و سەر کەوتنە بە سەر دوژمناندا ـ چەقەلّی : خەم و بەرۆشە بەهۆی ژنانەوە ـ ی رێوی : فێلی لێ دە کرێ .

دەنگ ی پشیلە : ترسی دزی لە گۆڕێ یە - ی ووشتر مرغی : لەنۆ کەری ئازاد دەبێ - ی سیسارکە کەچەڵەت گووێ لێ بێ : بە دەنگ و باسی پیاوێکی گەورە خەمبار دەبێ

- کۆتری : وەڵامی سەر هەنگانی پادشای دەبینێ - ی کەلە بابی : دەنگی پیاوێکی جووامێری گووێ لێ دەبێ - ی قشقەڵە دەنگ و باسی یە کێکی نەدیوە

- ی قالوچە : وەڵامێکی پڕخەمو خەفەتە دەنگی کوندیش هەر خراپە

- ی کۆترە کیویلە : دەنگ و باسی درۆیە : - ی تاووس دەنگ و باسی پادشایە

- ی قولنگ : دەنگی دەروێشی یە - ی لەگلەگی : دەنگی جوتێری یە

- ی کۆتری : - ژنێکی ئابرومەندە - ی قەلەڕەشەی : - مرۆیەکی چتی نارەوا خۆرە

- ی چۆلەکە : دەنگێکی خۆشە - ی بولبول : دەنگی چاوەش باشین وهاوارە

- ی مراوی : دەنگێکی خراپە - ی بیچوە باڵندان : کارەسات ورورشەیە

- ی هەڵو : دەنگو باسی پادشایە - ی کەڵەباب : دەنگی پیاوێکی مەردە

- ی کەو : دەنگی ژنێکی جوانە دەنگی کەوان: دەنگی ژنێکی ئابڕوومەندە

- قازی : دەنگ باسو کارەساتی یەکێکە لەنزیکانی وی - ی مار ترس وهەراسە - ی ژەنگە سورره وزەرگەتەو کوللە ترس ولەرزە - ی بۆقی : ولە شووێنێکی دێتە خوارو دا دەمەزرێ

- ی باڵندان : سپڵەیی ژن و مێردانە

- ی ژن : فرمێسکی پەرۆشاوی یە - ی پیاو : یەکێتی و تەبابی تەواوە لە خانەوادە دا - ی گا : مەرگی ڕاستەو خۆیە - پیاو کە بزر بێ گەورەبی و ئابڕوو سەر بلندی یە ناوبانگی بەرز دەبێ کە - ی نزم و بێ تین بێ : دەنگ و باسی نزم دەبێ بلندی دەنگی ئافرەتان: بە پێچەوانەوە - لە هەوا یا زەوی یا لە ئاسمانەوە بە سام و ترس بێ نیشانەی وخەفەتی پادشاو میریە

دەهۆڵ : ابن سیرین دەڵێ : - لێدان لە خەوندا ووتەی پووچ و بێ وا تایە و دەنگ و باسی درۆ و ناخۆشەو کارو باری بەیدا وئاشکرایە

دەھۆڵ لێدەر لەخەوندا خراپە . کە بینی لە گەڵ - ی زۆرناش لێدەدرا و پێ یان بەزەوی دادەدا . خەم و خەفەتە

دجال بڕوانە جچاڵ

ددان : - ئاژنینەوە باش نیە وزیان بەماڵ و منداڵ گەیشتنە دانیال دەڵێ:-لە خەوندا منداڵی ماڵی خاوەند خەونە ددانەکانی سەرەوەبەنێرینەو ئەوانی خووارەوە بەمێ ینەدانراوون - ەکانی پێشەوە بۆ برایانو خوشکان و منداڵانەو بۆدایك‌و بابش دەبێ - ەکانی تەنیشتیوی : مامو ئامۆزان ئەوانی تەنیشتی وانیش کە بڕۆك (تنایا/ ی پێ دەڵێن گەورەی ماڵێ یە‌ ددانەکانی تر خاڵ و منداڵەکانی یەتی . ددانەکانی پشتەوەش خزمانی دوورن هێندێکیش دەڵێن. ەکانیپێشەوە ئەوەی کە لەلای ڕاستەوەیە : نیشانەی باب‌و خزمەکانی بابیەتی‌و ئەو ددانانەی کە لەلای چەپەوەن : نیشانەی دایك و خزمەکانیەتی کەبینی ددانەکانیپێشەوەی دەڵەتی: یەکێك لەوانەی کەباسمان کردنە خۆش دەبێ .

ابن‌سیرین‌دەڵێ کەدیتی کەددانی پێشەوەی کە‌ ‌تەناولەپێدەستی‌یا کەوتە کەناری ویاکەوتە سەر زەوی و خۆڵاوی نە بوە : منداڵێك یابرایەك خۆشکێکی دەبێ کەدیتی کەوتە نێوخاك‌و لە ناو چوو . یەکێك لەوان دەمرێ یاجووێ دەبێتەوە کەنەختێك لە ددانی وی بشکێ یا لە ناو چێ : ڕووشەو کارەساتێك بە سەر یەکێك لەوان دێت . کەبینی - ی پێشەوەی وی کوتراوە : لەگەڵ ئەو جوورە کەسانە دوژمنایەتی بۆ پەیدا دەبێ . کە بینی ددانێکی پێشەوەی هەڵکەندرا ووتەی ناشیرین بە یەکێك لە وان دەڵێ وایشی جووێ دەبێتەوە . کە - ە کانی پێشەوەی پتربن یا باش‌و خاوێن بن : یەکێك لەوان تووشی خێرو شادی و پایەو و ڕێز دێت کە بینی لە تەنیشت ددانەکانی پێشەوە ددانێك بڕوێ کە ددانی سەرەوە بێ : کوڕێکی دەبێ یابرایەك .

بەڵان کە ددانی خووارەوەی بێ : کچێکی دەبێ .
کەبینێ ددانی پێشەوەی خۆی هەڵکەند : تۆڵەی خۆی لەوانی باسکراو دەستێنێ . کەهەموو ددانەکانی بکەون : خانەوادەی لە ناو دەچێ . کە ددانەکانی خۆی بە سواڵەت یا زێو یا شوشە بینێ : دەمرێ و ئاکامی نزیکە هێندێك دەڵـێن ـ کەوتن : داو دانانەوەیە ، لە لای هێندکانیش نیشانەی شەڕودوژمنایەتی یە. کرمانی دەڵێ ددانی سەرەوە کەبەرامبەری چاوە : نێرینەیە وەی خوارەوەش مێینەیە . کەبینێ ـ ە کانی کەوتن وخستنیە ناو لەپی دەستی بەوە : خزمەکانی کۆدەکاتەوە وە نایەڵێ لێك جووایەزبنەوە کە بۆنی خۆشی لەددانی بێ خزمەکانی پێی هەڵدەڵێن کە باشەلەی دەدوێن . کەبینی ـ ی دێشێ و دەری هێنا : ماڵی دەستد. ەکەوێ ـ ێشان : خەنەتە . کە بینێ ـ ی ڕەش بووە : نووشی خەمان دێ . کەـ ی زەردبێ : ئەو کە سەیلەو ددانی نزیکە نەخۆش دە کەوێ کەددانەکانی بکەون لە ناو پەڕۆیەکی کۆنیان ببەستێ : تەمەنی درێژ دەبێ بەڵان هەموو خزمەکانی خۆی لەناو گۆڕ دەنێ . مغربی دەڵێ : کەددانەکانی پێشێ بە دەستی خۆی دەریان هێنێو لە دەستیان گرێ : ماڵێکی، زۆری دەست دە کەوێ . کەبینێ هێندێك لە ـ ە کانی وی پەنهان بوون : هێندەی وان خزمەکانی دەچنە هەندەران و بە ساخی دە گەرێنەوە ددان کەسپی و ڕێک بێ : وەڵام و مزگینی خۆشە . کەزەرد و درشت بێ : بەختەوەریە لەدڵدارێتی دا کە ـ درێژ بێ : ناخۆشی و قاتیوقڕی یەوە . کە ـ ی بکەوێ مەرگی یەکێکە لەخزمو خووێشە نزیکەکانی . کەخۆی بێ ـ بینێ : لە گەل پیرێکی دەبێتە هاوسەر بالە گەل یەکێکی پیرو کارزان بازرگانی دە کا
ددان ئاژنینەوە : زیان بەماڵو منداڵ گەیشتنە

درك و دالّ . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا دیتن : ماڵ و بەهرەی دەست
دەکەوێ . کە ـ ی وی با بیبا یا بسووتێ : زۆر دارێك ماڵەکەی
هـەموو لێ دەستێنێ . کە ـ ی لەژێر مـەنجەڵ یا لەتەندووری دا
بسووتێ ماڵی خـۆی لەنـاو دەبا . کە ـ ی بهێنێتەوە ناو ماڵێ :
ماڵی دەست دەکەوێ . کە با ـ ی وی بباتە کووچەی سوودی بۆ
دەرەوەیە .

درِندە : بڕوانە ( جانەوەرِی درِندە ) .

درۆ . ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەون دا ـ کردن : بۆ ئاینی زیانی هـەیە .
کە گەورەیەك ـ بکا ، خەڵکی باسی چاکە و خـراپەی دەکەن و
قەدر و ئابرِووی دەچێ .

درِوو . ـ لەخەون دا : بەدبەختی و گرفتاری‌یەکی سەخت و هەرِەشەیە ،
کەببینرێ ـ ێك لەلەشی راچووە یا یەکێك تێی را کردووە ، خاوەند
قەرزێك ووتەی ناخۆشو رِەقی پێ دەڵێ . کەئەو ـ ی لەیەکێکی تر
رِاکا ، ئەویش قسەی رِەق بەقەرزدارێکی خـۆی دەڵێ . کەببینێ ـ ی
زۆر هەیەو لەشی زیانی پێنەگەیشتێ : زۆر قەرزدارە زوبۆی دەدرێتەوە

دروست کردن . ـ ی خانوو : کارێکی لە ژووررووی هێزی خۆی ئانجام
دەدا ـ ی کلیسا شێن و شەبۆرِە بۆ مردووان ، ـ ی بەندیخانە
دوا کەوتنی داوا کارانـە .

دروون ( دروومان ، دروار ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخـەونی دا ببینێ
بەرگی خۆی دەدروێ : کارو باری بەئاواتی خۆی دەبێ . کەبەرگی
خێزانی خۆی بدروێ هەر ئەو وانایەی هەیە . کەبەرگی ژنێکی
بێگـانە بدروێ . خەم و خەفەتی پێ دەگات . کەبەرگی پیاوێکی
بدروێ : خێرو چاکەی دەبینێ . کەببینێ دەرزی بەدەستەوەیە و

بەر گەکەی بەتەواوی درود : هەر کارێکی ڕووی تێ بکا ، تەواوی دە کا . کەبینێ بەر گی درواوی زۆر لەماڵێیە : گوزەرانی وی ڕوو لەخۆشی دەکات و شرە ( میرات ) ێکی زۆری پێ دە گا . مغربی دەڵێ کە کراسێکی بۆ خۆی بدرووێ و تەواوی بکا : لە گەڵ خێزانی خۆی تەبا دەبێ . کەدەرپێیەکی بدرووێو پڕووی تەواو نەکا : ژنێکی دێنێ و لەئەنجام دا لێی جووێ دەبێتەوە . کە کەوایەکی بدرووێ : خەریکی خزمەتێکی دەبێ .

درونێه . ـ ی خەرمان : هەرچەندێکی داهات زۆر بێ بۆ تۆ پڕ سوود ترە دز . دیتنی ـ : ترسان و شێوان و شپرزەیی یە . پەلامار بـردنە سەر ـ : منداڵ یا ماڵ لەدەست چوونـە . کوژتنی ـ : بێ جێیەو چتێکت لێ دەدزرێت .

دڵ . دڵ پادشای لەشەو گەنجینەی هۆش و ژیری‌یە بەپەنهانی و ئاشکرایی ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەون دا ـ دیتن : کۆ کردنەوەی مـاڵێکی‌یـە کەبەوی دە گات . کەبینێ ـ لەدەرەوەی لەشە : چاکەو بەرژەوەندە کەبینێ ـ ی تەنگ بووە : کاروباری لێ وەتەنگ دێو دژوار دەبێ کەبینێ ـ ی خۆشە : دەر گای کارو باری لەپێش دە کرێتەوە . کەـی دا کەوتبێ : لە گوناهی خۆی پەشیمان دەبێتەوە : کە ـ ی لەسەر بەری دەستی ڕاستی خۆی بینێ : نەخۆش دە کەوێ . کەبینێ ـ ی بەهەرـ دووك وەستان گرتووە : کاروباری ڕێك دە کەوێ . کرمانی دەڵێ ؛ کەبینێ ـ ی دێشێ : سامان و ماڵی زۆر دەبێ . کەبینێ چاوە کانی دڵی کراوەتەوە چاوی لە کارو باری گیتی و پەسلان ( قیامەت ) ێ دەبێ . کەبینێ خووێنی لە ـ ی دێ : لە کارو باری وێ نەچوو واز دێنێ . کەبینێ لەدڵی دا زەرداو ( صفراء ) هاتـە دەرێ : نەخـۆش دە کەوێ .

کەووشکی بکاتە دڵی وی : بۆ غەم دەبێ . کەبیبنێ گەوهەر لە ـ ی
وی بەوە بەزاری داهاتەدەرێ : لەسەر ئاینی خۆی نامێنێ مغربی دەڵێ
کەبیبنێ ـ ی وی پارچە پارچە بووە : دڵی بەشووێن هەواو هەوەسانی
دوورە دەست ( محال ) را خەریك دەبێ . کە ـ ی ڕووناك بێ : ئاشتی
خۆشی یە . کەتاریك بێ : بەپێچەوانەیە .

دڵەکوتێ و دڵ تێکچوون : دوایی ئازارو سەرەتای سەرهەڵدانو پشکەوتنە

دڵدار کەخۆی ـ بێ : دیمەنی چروو کی و چلو پێ هەڵنەهاتنە لەماڵێ دا
کە ـ یکی ببینێ : مزگێنی و موژدەی خۆش و پیرۆزی یە .

دڵدارێتی . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیبنێ دەوای ـ کەسێکی کەوتۆتەتەسەر :
نیشانەی ئاماجیو قرم (طمع)ە . کەلە ـ خۆی بەئلوات بکات : سوودە

دندووك . ابن‌سیرین دەڵێ کەبیبنێ وەکوو باڵندان ـ ی هەیە : هێندەی وی
ماڵی دەستدە کەوێ . کەبیبنێ کەرگەز یاهەڵۆ بەدندوو کی لەویان داو
پێشێ زیان و کەم و کووری ماڵە . کەبیبنێ ـ ی باڵندەیە کی هەیە :
ماڵی دەست دە کەوێ .

دۆ . ابن سیرین دەڵێ ؛ کرینی ـ لەخەوندا : خەفـەتە و خواردنەوەشی :
نەخۆشی‌یە . هێندێکیش دەڵێن : خوواردنەوەی ـ ماڵی نارەوایە . دۆ
بەهەر کەسێکی بدرێ : خەمناك دەبێ .

دووپشك . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەون دا : دوژمنێکی پێ تینە . کە
ـ بیگەزێ دوژمن قسەی ڕەقی پێ دەڵێ و پێی خەمگین دەبێ . کە
ـ ی بکوژێ . بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . ابراهیم دەڵێ . کەبیبنێ
ـ ی هەیەو خەڵکی دە گەزێ : خراپەی خەڵکی دەکا . کە ـی بخوات
دوژمن خرلیە(هەتك)ی منداڵی وی دەکات . ـ ئەندامی شەرمی مرۆڤانە.

دووخ : ئەو مرازە کەدەزووەی پێ دەرێسن یامرازێکی دارین و یا کانینە
لەداشێنی دەزوو ڕێسی‌دا کە دەزوو لەسەر وی. هەڵدە کرێ .

ابن سیرین دەڵێ دووخ لەخەوندا کچە . کەیە کێک ـ ی هەبێ و هەر دووك سەلکەکانی پێوە بێ : کچی بەمێرد دەدا . کە ـ ە کەی بشکێ کچی یاخوشکی دەمرێ . کرمانی دەڵێ ـ لەخەوندا پیاوێکی رارەر . کەژنێك ببینێ ـ ی هەیە یـا یـە کێك داویەتێ : مـێردی دەکات . کەببینێ ـ لکی لەدووخەکەی دەکەوێ : مارەیی دەبڕێ . مغربی دەڵێ کەببینێ ـ ی دەرِست ، خەمناك دەبێ . ئەو خەون ژن ببینێ : بێ خەم دەبێ لەخیەن . ژنەکە ـ ی لەپشت ببەستێ : ژنی دێنێ . کە ـ ی وون بێ یالەبار بچێ ، لەژنەکەی جووێ دەبێتەوە . کە ـ ە کەی بسووتێ : نەخۆشی و ئازار بەژنەکەی دەگات . کەدۆخینی خوری یالەلۆکەی بێ : ژنەکەی شەرفرۆشە . کەـە کەی کۆن بێ : بەپێچەوانەیـە . کەئاوریشم بێ ژنەکەی بەفیزو هـەوا دەبێ .

دوور بێن : بەدخووازی و سەرکۆنەی سەخت و کۆسپەو هەرەشە لێ کران.

دۆژە (جهنم) : خەوتێکی خراپەو بەدبەختی و تێك چوونە لە ـ کەوتن دەرد و ئازارێکی زۆرە . لە ـ کەوتن : ئازارو ئێش و ئۆفێکە کەـ سەرەخۆ سارێژ دەبێ . ابن‌سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ چۆتە ناو ـ مو هـ دەرێ : سەرپێچی دەکات و بەد کردار دەبێ . کە ـ زیانی پێ بگەیەنێ تووشی رەنج و ئازار دەبێ و لەئەنجام دا رزگاری دێ . کەخوواردەمەنی ـ ی بخوواتو لەئاگریش‌دا بسووتێ ، لەگێتی‌دا کرداری خراپ دەکا لەدووا رۆژیدا شەرمەزار دەبێ . کەببینێ لەنزیك ـ ی ئاگری هەل کرد یائاگر دایسا ، تووشی کاووباری سەخت دەبێ کەببینێ هاوار لەـموە دەبیست : سام و ترسی زۆرداران بەوی دەگات . کەببینێ لـ نزیك ـ جێ‌گیر بووە ، گیتی لەسەر وی تەنگ دەبێ .

دوژمن . بەسەر دوژمن دا زاڵ بوون کەیەخۆشیەکی گەورەو سەرکەو کوژتنی ـ لەهەموو لایەنێکەوە سود دەست دەکەوێ و ماف دەستێنێ کەوتنە ژێر دەستی ـ نیشانەی بەدبەختی و شوومی دووا رۆژە .

لەگەڵ دوژمن سازان و رێك کەوتن : شەڕو کێشەیەکی گەورەیە . کەبینی دوژمن ئەوی دەخووارد ; دەکەوێتە ناو کێشە و ڕووشەوە . صادق دەڵێ ؛ دوژمن (٣) سێ جۆرە : بەسترانی کار . زیان . خەفەت .

دوژمنایەتی . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەدیتی ـ لەگەڵ یەکێکی کردو بەسەری‌دا زاڵ بوو : لەسەر ئەنجام دا بەسەری دا زاڵ دەبێ . کەبینی دوژمن بەسەر وی‌دا چیرە بووە بەپێچەوانەی سەرەوەیە . جابر دەڵێ ؛ کەلەگەڵ خەڵکی بەبێ هۆ ـ بکات ; خەڵك لەوی دڵگیر دەبن . کە ـ لەگەڵ گەورەی شار بکات : سوودی لێ دەبینێ .

دۆست . لەخەون دا دیتنی ـ ( پیاو بێ یاژن ) : ناکۆکی و ناتەبایی‌یە لە نێوانی ژن و مێرد دا . ـ لەدەست دان : ناکۆکی‌و جوداییو دڵپیسی‌یە ـ پەیدا کردن یا دۆزینەوە ئاشتی و تەبایی‌یە .

دۆشاو . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا ; ماڵ و بەهرەیە بەڵان زۆر نا . کە ـ ی بخووا ماڵی دەست دەکەوێ . کەبینی ـ ی درووست دەکرد کارێکی پڕ سوود دەکات . کە ـ ی لەزاری بکات ; ووتەی خۆشی گووێ لێ دەبێ . مغربی دەڵێ ؛ کەبینی ـ ی سپی‌و ئاوێن دەخووات مندالێکی جووانی دەبێ

دۆشەک . ـ لەخەون دا ژنە جاچاك بێ یاخراپ بەندیواری بەژنەوە هەیە کەلەخەونی دا ـ ەکەی بگۆڕێ یا ئەو دۆشەکە و دۆشەکێ بکات : ژنەکەی خۆی بەرەڵا دەکاتو یەکێکی تر دێنێ . کەباری ـ ەکەی تێك بچێ باری ژنەکەی دەگۆڕ ـ ڕێ کە ـ ەکەکەی بفرۆشێ : ژنەکەی بەرەڵا دەکات یاخۆی لێ د شارێتەوە . کرمانی دەڵێ ، کەخۆی لەسەر ـ ێکی نەناس ببینێ : زیانی پێ دەگات . کە ـ ی وی لەسەر تەختێکی نەناسراو ڕاخرابێ و لەسەربشی دانیشتبێ دەبێتە خاوەند پایەو ڕێز بەسەر دوژمنانیش دا زاڵ دەبێ .

کەدۆشەگەکەی لەماڵێ فڕێ داتە دەرەوەو دووبارە بیهێنێتەوە : دەست لەژنەکەی هەڵدەگرێ و دووبارە دەیهێنێتەوە . کەدۆشەگی خۆی لەماڵێ یالەچاڵێکیدا ببینێو نەتووانی بیهێنێتە دەرێ : ژنەکەی نەخۆش دەکەوێ و چاك نابێتەوە . کەلەسەر دۆشەگێکی نەرم نوستبێ : ئەو ساڵە لەسەر وی بەپیتو پیرۆز رادەبرێ . کەدۆشەگەکەی پڕ لەخوری بێ : ژنێکی دەوڵەمەندی دەوێ . کەدۆشەگەکەی دڕابێ یاسووتا بێ : ئاکامی وی نزیکەو خێزانیشی بێ ئایینو بێ ئابڕووە کە-ی ئاوریشم بێ و بەڵی کری دەزووی بکۆڕێتەوە : ژنی واز لێ دێنێ و یەکێکی ئابڕوومەند دێنێ . کە -ە کەی مشك کونی کردبێ : داوێن پیسێتی خێزانیبەتی لەگەڵ بێگانان . کە-ە کەی لەهەوادا ببینێ : پایەبەرزی وسامانە . کەلەهەوادا بکەوێتە سەرزەوی : ژنەکەی نەخۆش دەبێ و چاك نابێتەوە . -ی سوور : ژنی بەدو ناساز کارە . -ی سەوز : ژنی ئایندارە . کەدۆشەگەکەی کۆن بێ و تازە بێتەوە : ژنەکەی ڕوو لەچاکە دەکا . کەببینێ لەسەر -ە کەی نوستووە : ئاسوودە دەبێ .

دوعا : بڕوانە ( نزا ) .

دو کان : ابن‌سیرین دەڵێ : کەسێکی -ی دروست کات :ژنێ دێنێ. -تێکدان : بەرەڵا کردنیژنە . کەوتنی- :مردنی ژنە . کەبەبێقایل‌بوونی خاوەند -لەسەر -ی دانیشێ : بۆخێزانی خاوەند دووکانێ دەستدرێژی دەکات

دوو کەڵ . ابن سیرین دەڵێ ؛ - لەخەوندا : پادشایەکی زۆردارو بێ دادە . کەلەلای ڕۆژ هەڵاتێ یا ڕۆژاوایە -یکی زۆر هەبێ : خەڵکی ئەو شوێنی لەدەستی زۆردارێکی جەوري دەبینن . کە- بەرز بێتەوە ئاگر زمانە بکێشێ : کێشەو کارەسات لەگیتی دەکەوێ . مغربی دەڵێ ؛ کەببینێ لەشارێکی یالەووڵاتێکیدا بێ ئاگر- هەڵبێ : دانیشتووانی ئەو شوێنی ترسێکی ئاسمانی‌یان لەسەرە . کەببینێ لەماڵی وی‌و یالە دووکانی ویدا هاتە دەرێ : زۆردارێك دەست بەسەر ماڵیدا دەگرێ

دروو گ ، کەبینی ـی خاو دەخووات : ماڵی ناڕەوا دەخووات . کە ـ ی
لێ نراو بخووات : دوژمنی لەماڵی وی دەخووات . کرمانی دەڵێ :
کەبینی وەکوو مەڕ ـی هەیە : منداڵێکی بەختەوەر و دەوڵەمەندی
دەبێ . صادق دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەون دا : هەمبانەیەك پارەیە .
دۆڵ . کەبینی چۆتە ناو دۆڵێکی یەوە : تووشی خەم و خەفەتێکی دێت .
ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینی لەناو ـ ێکی هاتە دەرێ : لەخەم و خەفەت
ڕزگاری دێ . مغربی دەڵێ ؛ دۆڵ : هەڵبەست دانانە .
دۆلابی ئاوێ ( چەرخی ئاو لەچاڵاو هەڵێنجانێ ) . ابن‌سیرین‌دەڵێ ؛ ـ دیتن
لەخەون دا : گەنجینەیەو ماڵی ئاوەدان و ڕۆزی و بەهرەیە . کەبینی
ـی دروست دەکردولەدەستی هات : خۆی یایەکێکی تر لەماڵی وی‌دا
گەنجینەی دروست دەکات . کەگەورەیەك ـ ی بداتێ : ماڵی خۆیان
بەوی دەسپێرێ . کەلە ـ دا ئاوی بخوواتـەوە یا ئاوی کۆ بکاتەوە :
لە گەنجینەداری بەهرەی بێ دەگات .
دومەڵ : بڕوانە ( قوونێر ) .

دێ . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا لەـیەکی بێو ناوی ـیەکەی نەزانێ
نیشانەی خێرو چاکەیە . کەناویشی بزانێ : گەنە . کەلەدێیەکی بێتە
دەرێ : بلتە . کەبینی چۆتە ناو ـ یەکی : خراپە . مغربی دەڵێ :
کەبینی لەشارێکی یەوە چووە دێیەکی ئاوەدان و پڕ پیت و بەهرە :
خێرو پیت و پیرۆزی و بەختە ، کەوا نەبێ : شەڕ و نزمی یە . کەبینی
لەدێ‌دا وون بوو : نیشانەی خێرە . مغربی دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا بینی
دێیەکی کڕی یایەکێك دێیەکی نەناسراوی دایە یا خـانو و بەرەی
دروست کرد : سـوود و قازانجە . کەبەرەوازی بێ : بەپێچەوانەیە .
کەلە گوندێکەوە بچێتە شارێکی : لەڕووشەو ئازار دڵنیا دەبێ کەلە
شارەوە بچێتە گوندی بەپێچەوانەیە . دیتنی دێی کاول : خراپـە .

دڵپر : خەم و خەفەتە . چوونە ناو ـ : ناهومێدی و گۆشە نشینی‌یە . لە ـ
چوونە دەرەوە : ئارامی و دامرکانی ئێش و ئازارە .
دیزە . کەبیبنیٚ ـ لەسەر ئاگری‌یە کارو باری ڕوو لەخۆشی دەکات .
ـ ی پڕ : خواردنی بەتام و خۆشە . دیزەی بەتاڵ : شەڕ و کێشەی
ناوەوەیە خۆت بپارێزە . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیزەی تازە : ژنـە .
هێندێکیش دەڵێن ؛ دەم ڕاستی ماڵی‌یە . کەبیبنێ ـ یەکی دەست کەوت
یادایانیٚ و لەسەر ئاگری داناو چێشتی تێدا لیٚ نا : بەهۆی کارێکی‌یەوە
سوودی لە گەورەیێکی‌یەوە دەست دە کەویٚ . کە ـە کەبشکیٚ : خاوەند
ماڵ یا کابانی ماڵی دەمریٚ . کەبیبنیٚ ـ ی مسی هەیە : ڕێز و نرخ و
سوو دە . کە ـ گڵی بیٚ : کارێکی بەسـوود دەکات . کرمانی دەڵیٚ ؛
کەلەدیزەدا گۆشتو خوواردەمەنی هەبیٚ : ڕۆژێکی بـەبیٚ ڕەنجی
پیٚ دەکات .
دینار ( دراوی پێشوو ) : مەبەس لەپارەی گەورەو نرخدارە . دانیال دەڵیٚ
کەبیبنیٚ چەند ـ یێکی لەدەستی دایەو لەچوواران پتر بیٚ : تووشی نا-
خۆشی دی یاقسەی ڕەقی گوویٚ لیٚ دەبیٚ . ابن سیرین دەڵیٚ ؛ کەپێنج
دانە درەم یادینار بیٚ : کارێکی باشی لیٚ ڕوودەدا . کەلە (١) تا (١٠٠٠)
دیناری پیٚ بیٚ : زانستێکی دە گرێتە پێش کەبەهۆی وبەوە سامانێکی
دەست دە کەویٚ بەڵان دەبیٚ ژمارەکانی جووت بیٚ . کە ـ ی بـدات
بە کەسێکی یالیٚی لەناو بچیٚ : لەلایەن منداڵانەوە تووشی کارەساتێکی
دێت . کەبیبنیٚ ـ ی زۆر هەیە : ڕەنجێکی بیٚ دە کات . مغربی دەڵیٚ ؛
کە ـ یێکی لەبەری دەستی خۆی دا ببینیٚ قۆچانێکی لەسەر دەنووسن
بۆ ئەو ئەسپاردە ( أمانەت ) یەی داویانەتیٚ زۆر جاریش ڕووی داوە
کەلەخەونردا ـ ی دەست کەوتبیٚ . لەبێدارێتیش‌دا ـ ی هاتۆتە مستی .
حافظ دەڵیٚ ؛ دینار لەخەوندا : ژن و کەنیزەکو منداڵە . ـ ی زۆر :
سامانێکە کەبەڕەنج و دوژمنایەتی دەست دە کەویٚ .

دێو . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەوندا ; فێڵ باز و فریو دەرە . کەبینێ ـ لەخشتەی دەبا ; لەکاری خراپ لادەدا و دوژمن بەسەری دا زاڵ نابێ . کەشەڕی لەگەڵ ـ ی بکاتو بەسەری‌دا زاڵ بێ ; باشە . کە ـ بەشادی ببینرێ : تووشی خراپەو بەدکاری و داوێن پیسی دێ . کە ـی بەخەم باری ببینێ و باشە . کەدێو بەرگی لێ بستێنێ : ئەگەر کارگەرە بێ کار دەبێ ، کەجووتێ بێ ئازاری پێ دەگات . کەدێوان بەدیلی ببەن ئابڕووی دەچێ . کەگەمەی لەگەڵ ـ ی بکات . تاوانێکی گەورەی لێ دەبینرێت . کەلەگەڵ ـ ی قسەی بکات ; لەگەڵ دوژمنی بـاش ڕێك دەکەوێ . کەچتی لەگەڵ بخووا : تووشی خراپەی دێ . کەـی ببینێ یا ـ بچێتە ناو زگی‌یەوە : تووشی داوێن پیسێتی دێ .

دیو ( ژوور ) . دیتنی ـ ی چۆل ; دوور کەوتنەوەو جودایی‌یە . کە ـ ی بڕ لەناو ماڵ ببینێ : دەبێ لەساختەچی و دەست بڕان خۆی بپارێزێ . دیتنی ـ ی میوانان : ڕێگایە کە کەبەناچاری دەیبڕێ . دیتنی ژووری نوستنێ : کورتە دڵدارێتییێکە . چوونە ناو ـ : سـوود و کەلکێکی پایەدارە . دیتنی ژوور ی نەخۆشخانە خـەم و بـەرۆش و داخی گیـانی‌یە .

دیوار . ابن سیرین‌دەڵێ ؛ دیتنی ـ ; باری خەون دیتووە . کەبینێ ـ ە کە باش و مەحکەمە : نیشانەی چاکی باری وی‌یە لەگیتی‌دا . کەـە کەی کۆن بێ و تێکی بدات ; ماڵی دەست دە کەوێ کەدیوارە کە تازە بێ وتێکی بـدات : خـەم و خـەفەتە . کەبینێ ـ ە کـەی سـت و تەنگە باری وی لەگیتی‌دا بێ تینە . کەبینێ ـە کەی بەپێوەیە ; باری دروست و ڕێكو باش دەبێ . کەبینێ ـە کەی هەڵاوەسراوە : باری بەڕا گەندە و گوزەرانیشی تێك دەچێ .

کەدیوار بکەوێ : لەگوزەران و پیشـە دەبێ .

کرمانی دەڵێ ؛ کەببینێ دیواری شـاری یامزگەوتێ بکەوێ : سەرۆکی شـاری دەکەوێ یا دەمرێ . کەبەدەستی دیواری لە قوڕی و خشتی دروست بکات : نیشانەی ئایین پاکی یە . کەلەگیچ وخشت بێ : نیشانەی بـار خرابی وی یە لەئایین دا کە دیوار لەقـڵ و بەرد بێ : بەگیتی هەڵدەخەڵەتێ .

لەگەر ببینێ لەسەر دیوارێـکی دانیشتووە و دیوارەکە قایم و بەهێز : باری وی لە گیتی دا قایم و باش دەبێ

دێوانەیی : ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لە خەونەدا :ماڵی ناڕەوایە بۆ خەون بین .

کرمانی دەڵێ ؛ کەببینێ ـ بوو : تووشی کارو بـاری ناڕەوا دەبێ و بەرتیلی دەخووات .

جابر دەڵێ ؛ کەببینێ لەگەڵ ـ یێـکی بۆتە برادەر : لەگەڵ یەکێکی بەرتیل خۆر و دووزمان دەبێتە برادەر و بـەو هۆیەوە لەو ڕووەوە تووشی سەرزەنش و بەد ناوی دێت .

لەشکر : بڕوانە ( سیرەت ) ـ چوو .



ڕابەڕین . ابن سیرین دەڵێ ؛ لە شووێنێکەوە بۆ جێگایەکی تر ـ : باری وی دەگۆڕێ . کەبۆ شووێنێکی دوور ڕابەڕێ : دەچێتە ڕاڕەوێی ( سفر ) ێکی دوور . کەلەکانی ـ دا گۆچان یا داری پێ بێ : پشتی بەپیاوێکی بەهێز ئەستوورە . کەبۆ هەر شووێنێکی بخووازێ ڕابەڕێ نیشانەی هێز و تووانایی‌یە . کەلەشووێنێکی خـاوێن دا ڕابەڕێ : لەبارێکی خرابەوە دەچێتە بارێکی باشتر .

ڕاڕەوی ( سفر ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ ـ کرد زانی ئـەو شووێنـە باشترە لەوی پێشوو : کاروباری‌باش دەبێ، دەنا بەپێچەوانەیە . کەبچێتە ـ و نەزانێ دەچێتە کووێ : لـەژنی یاڵەو ماڵەی کەلێیەتی دوور دەکەوێتەوە . کەئەو چەند کەسێکی بەڕێ بکا یاچەند کەسێك ئەوی وەڕێ بخەن : باری دەگۆڕێ و دووبارە ڕوو لەچاکی دەکاتـەوە . کەبینێ بەئەدارە کێکی تەواوەوە چۆتە ـ : حـاڵی باش دەبێ .

ڕاژاندنەوە : ناوماڵ ڕێکخستنە . کە ـ سادەوساکار بێ : ئابۆڕیو سەرکەوتنە لەهەوڵ و کاردا . کەبەشانو شکۆ بێ : کەمەوخشەی ناتۆرەیی وخراپە

ڕازیانە . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا لەکات و بێ کاتدا : خەم و خەفەتە خوواردنیشی زیان دەرە . کەبینێ لەزەوی‌یەکی‌دا کەهی خۆی نەبێ ـ ی زۆر بێ : دووچاری خەم و خەفەت دەبێ .

ڕان . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا هێزو تووانای وی و خزمەکانیەتی کەلەخەونی‌دا بینێ ـ ی شکاوە یا کەوتووە . خۆی لەخزمان جووێ دەبێتەوە ، وەلەشیشی بێ تین دەبێ ، لەهەندەران دا لەبەر دەربەدەرێتی دەمرێ . کە ـ ی یەکێکی تر بەو شێوەیە بینێ : هەروەکوو وی وایە کرمانی‌دەڵێ؛ـ ی‌ڕاست،خزمانی‌باوکی‌وهی‌چەپیش‌خزمانی‌دایکە . کەبینێ

باریك بووە : کارو باری خزمەکانی بێ تێن دەبێ . کە ـ ی بشکێ
لەگەورەیی‌دا کەنەفتی و پەرێشانی بەو دەگات . کە گۆشتی ـ ی وی
بکەوێ : ماڵی خزمەکانی لەناو دەچێ . کە ـ ەکانی بەسترابێ : لەخز-
مان دوور ناکەوێتەوە ، وەبەمارە کردن لی‌یان نزیك دەبێتەوە . کە
گۆشتی ـ خۆی بخووات : هێندەی وی ماڵی خزمان دەخووات .

ڕاو . ابن سیرین دەڵێ ؛ کە ـ ی مەڕ و گاکێوی بکاو گۆشتی بخووات :
نیشانەی چاکەیە . کەلە ـ یێدا نێچیری بکرێ : ماڵێکی مفتی‌ی دەست
دەکەوێ . چوونە ـ : مـەرگی برادەرانە . گەڕانەوە لە ـ : کێزە و
کێشەی دادگایە . لەڕاوی‌دا برینداربوون : زیانە .

ڕاوەنـد . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ ـ ی زۆر هەیە تووشی خەفەتان
دێ . کەبۆدەردێکی ـ ی بخووات و چاك بێتەوە : نیشانەی ساخی و
خێرو بەرژەوەندی‌یە کەبەوی دەگات .

ڕایەخ . دیتنی ـ کەهی خۆی بێ و بۆ وی ڕاخرابێ : بەتەمەنێکی درێـژ
خۆشڕادەبوێری . کەلەشوێنێکی کەس‌نەزان‌ڕاخرابێ : باری‌دەگۆڕێ
ولەئاوارەیەتی‌دا دەمرێ . کە‌ی بفرۆشێ یابیدا بەکەسێکی : نیشانەی
تەلەزگە ( خطر )ی وی‌یە . دانیال دەڵێ ؛ کەبینێ ـ ی بۆ ڕاخراوە :
تەمەن درێژی‌یە ؛ هەرچەندێکی گەورەتری ببینێ چاك ترە . کەبـە
کـۆن و دڕاوی ببینێ : ژیانی دژوار دەبێ . ـ ی سوور . خـۆش
ڕابوواردنە . ـ ی ڕەش و شـین : خەفەتە . ـ ی زەرد : نەخۆشی‌یە .
هی سپی : ڕۆزی ڕەوایــە .

ڕەز ( باخی ترێ ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا : ژنێکی چاك و کار
چاكەو دڵ فراوانە . کەبینێ ـ ێکی هەیەو دارانی سەوزو پاکی تێدایە
ولەکاتی خۆشی‌دا بێ : ژنێکی کارچاك دێنێو خێرو سوودی لێدەبینێ
کەبینێ میوەکان هیچ گەڵایان پێوە نی‌یە : بەپێچەوانەیە . کە گەڵاکانیان
زەرد بووبێ : نەخۆش دەبێ . کەباخەکە هی خۆی نەبێ : واتایەکەی
تێخەی خاوەند باخی دەگرێتەوە .

ڕمزی ، ڕمژوو ، خەلووز . ـی هەلگراو : پێشنیازی باشە .
ـی کوژاوەوە : بەدبەختیی و ڕووشەیە .
ـ خوواردن : ڕەنج و ئازار و مەینەتە .

ڕەشەبا : بڕوانە ( با ) .

ڕەشکە . لەخەون دا ـ دیتن : نیشانەی خەم و خەفەتە و خوواردنیشی : زیان و کەم و کووڕی یە .

ڕەگ . ابن سیرین دەلێ ؛ ڕەگی لەش . بەخەلو و خێزان و کەس و کار دانراوون چونکوو هەموو ڕەگەکان لەنلو لەشدان . کە ـێکی لەشی ئازاری پێ بگات : خزمەکانی وی تووشی خەم و خەفەتێ دێن . دەماری سەر نێو چلوانی : نیشانەی گەورەکانی خزم و کەسیەتی . ڕەگەکانی دەستو باسك : بران یامندالن . ـەکانی پشتی : خزمانی لای باوکین ـەکانی لاقیش : سوودو کەلکە . کەخووێنی ـی بەر بدرێ و لەو کاتیدا دەمارەکەی بەتەواوی بڕا یاووشك بوو : خزمی دەمرێ یا تووشی خەفەتێکی دێو یادەر بەدەر دەبێ . کەیەکێك خووێن لە ـی بەربدات بەدرێژی : ووتەی ناخۆشی لەلایەن خزمانەوە گووێ لێ دەبێ .

ڕەنگ . ابن سیربن دەلێ ؛ ـی سپی بەبەرگ و کەل و پەلەوە دیتن : نیشانەی چاکەو پاکی ئاینە . ـی سوور بۆ پیاوان : ڕەنجو پێزاریەیە بەلان بۆ ژنان : زۆر باشە . ـی سەوز : بۆ هەردوو کیان باشە . هی زەردیش : بۆ ژن و پیاوان نەخۆشی و ئازارە . ـی ڕەش بۆ ژنان و پیاوان : خەم و کارەساتە ، بەلان بۆ ئەوانەی کەهەمیشە ڕەش پۆشن : بێ زیانە . هی شینیش بۆ پیاو و ژنان : خەمو خەفەتە . صادقیش دەلێ؛ ـی سپی و سەوز لەخەون دا : خێر و پیت و پیرۆزیە . ـی ڕەش

بۆپادشاو وەزیرو گەوران گەورەیی‌و سامانە . ــی سوور ؛ دوژمنای و ناخۆشی‌یە . دانیال دەڵێ ؛ ــ کردنی رِیش : داپۆشین و شاردنەوە کارانە . کەسەرو رِیشی ــ بکاو رِەنگ نەگرێت : رِوو کاری دەرمو کارو باری خۆی نیشانی خەڵکی دەدات ، بەڵام کەــ بگرێت : کارو باری باش دەبێ‌و کارو بارەکانی بەداپۆشراوی دەمێنێتەوە .

رِبە : برِوانە ( پەیمانە ) .

رِشانەوە . دانیال دەڵێ ؛ کە کەسێك ببینێ رِشاوەو بەئاسانی هــاتە دەرێ لەتلوان پەشیمان دەبێتەوە . کەبۆی نەیەتە دەرێ : تــووشی زیانێکی دێت . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ دەرِشێتەوەو خووێن هات ؛ زیانبە کەرِشاوەو دووبارە خوواردی‌یەوە . چتێکی بە کەسێکی دەبەخشێ و لێی دەستێنێتەوە .

رِق هەستان ؛ هەواو فیزە . کەببینێ دایکو باوکیان رقیان لێی هەستاوە لەشووێنێکی بلندەوە دەکەوێتە خووارەوە .

رِ کێف . ابن سیرین دەڵێ ؛ ــ لەزینی جووێ بێتەوە ؛ منــداڵێ یانۆکەرە کەزین لەگەڵ رِکێف بێ : منداڵێکە لەکاران دا بایەخ دار و هێمن ( امین ) و باك دەبێ . کەــە کە زێوین بێ ؛ منداڵەکە بەماڵی دونیا بەهەوا دەبێ .

رِوو ( رِوخــسار ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ ــ لەخەون دا ؛ رِووناکی‌یە . کەببینێ ــی وی سوور و خاوێنە . لەناو خەڵکی دا بەناوبانــگ و گەورە و رِووناس دەبێ . ــ ی زەرد یا رِەش ؛ بەپێچەوانەیە . کرمانی دەڵــێ ــ ی خەڵکی لەخەون دا ؛ رِازاندنەوەی پیاوو کوێخایەتی وی‌یە . کەلە ــ دا کەم و کووری ببینرێت ، لەرِازانەوەی وی و کووێخایەتی‌دا

کەم و کووڕی ڕوو دەدات . کەلە ـ و ڕوخساری خۆی تووکەو مووی بینێ : تووشی قەرزداری دەبێ . کەبینێ ـ ی سوورو خاوێنە ; شادو بەکەیف دەبێ . کە ـ ی زەرد بێ ; ناساخ دەکەوێ . کەڕووی خۆی بەڕەشی و ابلی بینێت : لەلایەن خێزانی یەوە خەم و خەفەتی پێ دەگا . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەڕووی خۆی جووانتر لەخۆی ببینێ : ئابڕوو و پایەی بەرزتر دەبێ . ئەگەر ڕووی خۆی ناشیرین ببینێ : پایەی کەم تر دەبێ . کەڕەنگی ـ ی ڕەش بێ ; لەنێو خەڵکیدا ڕیسوا دەبێ . کەببینێ سەرڕای ڕوو ڕەشی کراسی سپی پۆشیوە : کچێکی دەبێ . کەڕووی خووێناوی بێ و زەرتکاوی لێ بێ بەو مەرجەی کەبرین لەڕوویدا نەبێ : زیانی ماڵییە . کەبینێ ـ ی خوار بووە : باری وی تێك دەچێ کەبینێ لە ـ ی ویدا خاڵێ هەیە : قەرزدار دەبێ . جابری مغربی دەڵێ کەڕووی خۆی باش بینێ لەئاوێ یالەئاوێنەیدا یایەکێکی تر پێی بلێ ڕووی تۆ باشـە ( جووانە ) : کارو باری باش دەبێ . کەناشیرینی بینێ وانیە . کەڕووی وی سوور بێ : پیلـەی لەگەڵ یەکێکی تر لێ پەیدا دەبێو ڕقی خۆی دەخوواتەوە . ـ برینداری ; خەمە . دیتنی ڕووی ڕنراو : زیانی کارو بار و کووێخایەتی یە . کەڕووی کەوتێتە پشت ملی : خەڵکی پشتی تێ دەکەن و ئازاری دەدەن .

ڕووەك ( نباتات ) . ابن سـیرین دەڵێ ؛ دیتنی هـەر جوورە شینـایێکی لەکاتی خۆیدا کەلەش و لکی نەبێ : سـوودە . ئەوانەی کەلەش و لکی یان هەن : نیشانەی زۆری سامان و ماڵە . کەببینێ لەناو چاوی یازاری یاگوویێ وی ـ ڕوواوە : زۆر زۆر باشـە .

ڕوب ( مرەبا ) . ابن سیربن دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا کەشـیرین و خۆش بێ دیتنی وەیا خوواردنی : خـێر و پیت و پـیرۆزی یە . کەوا نەبێ : بەپێچەوانەیە .

کەڕوب بڕژێ و هیچی لێ نەخورێ ؛ لەخەم و خەفەت ڕزگار بوونە.
ائینان و پەروەردە کردنی کەشیرین بێ : وەکوو سەرەوەیە.ترشوانیە
ڕووبار بڕوانە ( چۆم ) .
ڕووبەند : بڕوانە ( پێچە ) .
ڕووتی . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەخۆی بەڕووتی ببینێو شەرم لەخەڵکی بکا ؛
دەچێتە حەجێ و تاوانی دەبەخشرێ ، دەشڵێن وەدووی ماڵ و سامان
کەوتنەو خەمو خەفەتە . لەلای هێندێکی تریش : خەمو ئازارو ڕیسوایی‌یە
ـ لەخەون دا ؛ بۆ پیاوی باش خێرو چاکەیەو بۆهی خراپیش خراپەیە
ڕوخسار بڕوانە ( ڕوو ) .
ڕۆژ : بڕوانە ( خۆر ) .
ڕۆژ ( نهار ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـ ی هەینی باشەیە ؛ دەست
بەکارێکی وادەکات کەپێی وایە سوودی تێدایە کەچی شەڕی تێدایە
کەوەبزانێ ڕۆژی یەك شەمە هەینی‌یە : دەبێتە دۆستی بەدکاران .
کەلەخەونی دا ببینێ شەوەلەکاتێکا شەو نەبێو ڕۆژبێ : بۆ وی خراپە
ڕۆژاوا ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی : ـ هێندە باش نیە ، چونکوو ڕۆژی
تێدا وون دەبێ .
ڕۆژ باشی ( سلام ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەیەکێك ببینێ دۆستێکی ڕۆژ
باشی لێ کرد : ئەو دۆستە لەوی دوور دەکەوێتەوە بەڵاّن کەدوژمنێك
ـ لێ بکات : دەبێتە دۆستی وی . کەببینێ یەکێکی نەناس ـ لێ کرد
ئاوارەیێك دۆستایەتی وی دەکا . کەپیرێك ـ لێ بکا بەو مەرجە کە
نەیدیتبێ : لە ئازاری خودا دڵنیا دەبێ . کەپیرێکی ئاشنا ـ لێ بکات :
ژنێکی جوان دێنێ . جابر دەڵێ ؛ کەدۆستێکی ـ ی لێ بکاو وەڵامی
نەداتەوە : لێك دوور دەکەونەوە . کە ژنێکی جحێڵ ـ ی لێ بکات :
بەختی گێتی ڕووی تێ دەکات .

ڕۆژوو . ڕۆدی و چاو پێ هەڵنەهاتنە ، ناکۆکی و کێشە لەنێـوانی ژن و مێردانددا . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیینێ بە ـ موە لەپاش ملەی خەڵکی دەدوێ یاجێیوان بدات ؛ مرۆیەکی ناڕاستە . کەبیینێ لەمانگی ڕۆژوو. واندا بەڕۆژووە ؛ گرانی دەبێ .

ڕۆژ هەڵات . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەون دا ؛ نیشانەی پادشایانی جیهانە . ڕۆژ هەڵاتنیش ؛ ئاوات پێك هـاتنە . کە ـ ی لەشـوو‌ێنێکی خراپ بیینێ ؛ خراپـە .

ڕووگە ( قبلە ) . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەکەسێك بیینێ بەرەو ڕۆژ هەڵاتێ نوو‌یژی دەکا ؛ نیشانەی وەیە کەئـارەزووی ئایینی پێغەمبـەری نیە . کەپشت بە ـ نوو‌یژی بکات ؛ لەحالت ئاین دا راسـتە .

ڕۆن . دانیال دەڵێ ـ لەخەوندا ؛ ماڵ و بەهرەیە ، هێندێکیش دەڵێن میرانە کە ـ ی مانگای هەبێ و لێی بخووات ؛ بەهرەی دەست دەکەوێ و بەرێزو خۆشەویست دەبێ . ڕۆنی مەڕیش هەر وایە . ڕۆنی دووگی و بادای و کونجیش . هەر بەهرە و ماڵن . ـ ی وەنەوشـە و زەیتوون ؛ قلزانجێکە لەلایەن جووتبەندالەوە . ـ ی زەیتوولی ؛ سوودێکە لە ... ان دەست دەکەوێ . ـ ی نێرگس ؛ سوودێکە لەلایەن دێهاتیانەوە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبیینێ هەموو لەشی ڕۆناوی بووە ؛ نەخۆش دە. کەوێ . ڕۆن لەسەر خۆ هەڵسوون ؛ خۆ ڕازاندنەوەیە . کە ـ بۆنی وەکوو یاسەمەنە و وەنەوشەی خۆش بێ ؛ نیشانەی خۆ ڕازاندنەوەیە کەناخۆش و بۆگەن بێ ؛ بەپێچەوانەیە کرمانی دەڵێ ؛ ڕۆنی زەیتی ماڵو بەهرەیە . کەبیینێ پیاوێك ـ ی لەسەرێ پیاوێکی تر هەڵسووێ فێڵ و فەرەجی لێ دەکا . مغربی دەڵێ ؛ خۆ بەڕۆنێ چـەور کردن ؛ خۆ ڕازاندنەوەیە بەڵان خەم و خەفەتی بەدووردا دێ .

ڕۆن کەپەرە بستێنێ : ناوبانگی بووچو بێ ڕەونەقە . کەیکرێ : سوودە ڕووناکی . ـ ئاگر : ڕووناکی و هەرزانی‌یە . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا زۆر باشە . کەبیبنێ ـ یی گرت یا یەکێك بەوی دا ; یەکێك ڕێگای ڕاستی نیشان دەدا . تاریکی لەخەون دا خراپە . کە ـ دەورەی وی بگرێ : خێر و ساخی‌یە .

ڕۆنی زەیتوون . کرمانی دەڵێ ؛ ـ ی لەخەون دا : خێرو پیتە . کە ـ ی پیاڵێوێ و بیخوا ; هێندەی وی خێر و سوودی بێ دەکات .

ڕۆنیاس . ابن سیرین‌دەڵێ ؛ دیتنی ـ : بەدەورەی‌خۆهەڵاتنە . خواردنیشی ڕەنج و ئازارە . کەکراسی خۆی بە ـ ی سوور بکا : هەوەس پەرستیە

ڕۆیشتن . ـ بەناو ئاووقوڕێدا ; نیگەرانی‌و کۆسپەیە لەکاروباری ماڵی‌دا . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەشاری خۆی چووە دەرێ و نەیزانی بۆ کوێ دەچێ : سەر گەردان و بێچارە دەبێ . کە ژن ومنداڵی لەگەڵ بێ بەوا نەوە سەرگەردان و بێچارە دەبێ کە وەکو ووشتری بڕوات ; بەختیار دەبێ . کە وەکوو جانەوەرێکی بڕوات یا وەکوو دووپشکی خراپە . کە وەکوو باڵندەی راوێ بڕوات خێرو چاکەیە . کە لە تاریکی‌یەوە بەرەو ڕووناکی دەڕۆیشت ; رزگاریە . کە لەکاولێکەوە بۆ ئاوەدانی بڕوات لە تەنگانە رزگار دەبێ . بۆ شوێنانی باش چوون خێرو چاکەیە

ڕێ (ڕێگا) : ابن سیرین دەڵێ : ـ لە خەوندا ئایین و پایە داری و ڕاستی و خوازی‌یە کەبە شەقام دا ڕۆیشتبێ : ڕێگای ئایینداری دەگرێ . کە کەلێکی بۆ ڕێگای راست ڕابەری بکا : نیشانەی وەیە کە هۆزێکی بەرەو ئاشتی و خۆشی دەبا .

کرمانی دەڵێ ؛ کەبیبنێ بەڕێگایەکی دا دەڕۆیشت و ماندوو نەدەبوو مافی خۆی بەئازارورەنج لەیەکێکی تر دەستێنێتەوە . کەبیبنێ کەسێك لەڕێگای ڕاستەوە بۆ ڕێگای خوارو کەچی دەبات توشی گوناه دێ ولەڕێگای چاکە لادەدا . کەبیبنێ بەشەوی تاریك دەڕۆیشت و ڕێگا بۆ وی سەخت و دژووار بوو ، وای گومان دەکرد کەڕێگای ڕاستە ، دەگاتە ڕێگای ڕاست . ئەگەر چەند ڕێگایەکی ببینێ و نەزانێ بـە کامیاندا بڕوا ، لەئایین دوور دەکەوێتەوە . کەبەقەستی بە ـی خراپدا بڕواو ژنێکی هاتە پێش و بەهۆی ویەوە لایدا بە گێتی تەفرە دەخوا بەپیادەیی و سوواری بەڕێگایەدا ڕۆیشتن ، هەروە کوو یەکن . جابر دەڵێ ؛ کەبیبنێ یەکێکی لەڕێگا دەبرد ، تووشی خراپەی دێ . کەلە ڕێی وی دا سەوزە گیـا هەبێ ، نیشانەی پاکی ئایینە .

ڕێتۆنی (حکمت) . کەلەخەونی دا بیبنێ وانەی ـ و زانیاری دەخوێند یا پەڕتووکی ـ بکڕێ ، لەهونەری هۆش و ـ بەهرەوەر دەبێ .
کەپەڕتووکی ـ بسووتێنێ یا لێی وون بێ بەهرەی ـ و هۆشی لـە کیس دەچێ . کەپەڕەکانی پەڕتووکی ـ ی بخووات ، زۆر لەهونەری ڕێتۆنی بەهرەوەر دەبێ .

ڕیحانە . کەبیبنێ ـ سەوزو بۆن خۆشە ، نیشانەی منداڵە . ڕیحانە لەزەوی هەڵکەندن گریان و خەفەتە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کە ـ ی لەشووێنی خۆی ببینێ ، نیشانەی ئەوەیە کەکارانی باش دەکا . جابر دەڵێ ڕیحانە فرۆشی ، بێ ئەندازە باشە . کەڕیحـانە گەچراوو ژاکاو بێ ، نیشانەی نەخۆشییە . ڕیحانەو گوڵ چاندن ، منداڵی باش و هێمن بوونە . کەـ لەباخ یالەباخچەی وی ڕوابێ یاهەڵچووبێ ، منداڵی ئازاو تێکەیشتووی دەبێ . بۆنی ڕیحانە ، منداڵە

ڕیخ ( تەرسەقول ، پشکەڵ ، تەرس ، شیاکە ، پیسایی ) . ابن سیرین دەڵێ ؛
ـی ئەسپ و گا ، ماڵو بەهرەیە بەتایبەتی کەببینێ ـی زۆر هەیە ، ماڵو
بەهرەیەکی زۆری دەست دەکەوێ . کەببینێ کاتێکی پیسایی کرد بە-
خۆڵێ دایپۆشی : ماڵی خۆی لەژێر خاکی دا دەشـارێتەوە . کەببینێ
پیسایی مرۆڤی دەخـوارد ، ماڵی نارەوا دەخـوات . کە ـی فڕێ داتە
شووێنانی نادیار ماڵیخۆی لەشووێنێکی وا دا دەچووێنێ کەخێرو
سوودی ێ دا نەبێ . دانیال دەڵێ پیسایی مرۆڤان ماڵی نارەوایە(حرام)
ـی چووار پێیان حەڵاڵە . ـ دان بە کەسێکی ، ماڵێکی بێ دادیە .
ڕیخۆڵە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـی گرت و خوواردی ، لەخزمانەوە
خێرو سوودی دەبینێ . کەـکانی وی لەژوورەوە ئاشکراو پەیدا بن :
بەکێك لەمندالآنی خزمـەکانی وی گەورە دەبێ . کە ـی کەسێکی
بخووات : هێندەی وی ماڵی کەسێکی کەشاردبوویەوە پێی دەبڕێ .
کرمانی دەڵێ ئاشکرا بوونی ـ لەخەون دا ماڵی شار ـ راوەیە ئاشکرا
دەبێ . جابر دەڵێ کەببینێ ـی لەزاری هاتەدەرێ : منداڵێکی دەمرێ
کەـی یەکێکی بێنێتە دەرێ ، ماڵی شار ـ راوەی وی دەست دەکەوێ .
ڕیش ( ڕدێن ) : کە ـ بڕبێ ، سوودی زۆرە کەکەم و تەنك بێ : کێشەو
پلەیەکی درێژە ـ ی ڕەش . تازییەیە ، بێ ژن یا بێ مێرد بوونە ـ ی
سپی : بەختەوەریو هاتەو هێمن و هیدی دەبێ ـ تاشین ، لە قومـار دا
دۆڕاندنە خەلـکی تر ـ ی وی بتراشێ : نۆکەرایەتیو دیلی بە کە ـ ی
هەڵبوەرێ تێشکان و ژێر کەوتنە کە ژن ڕیشی هەبێ بە دڵخرواز
گەیشتنە ژنی جحێل کەڕیشی هەبێ ، زۆر زوو بە یاد شار بوونە کە
ڕیشی لە ناو کی نێ پەڕێ : خەم و خەفەتە کەببینێ ـ ی خۆی لە خەنە
دەکرێ یا ڕەنگی دەکات وڕەنـگ ناکرێ : بـارو هـەوای خـۆی لە
خەلـکی ناشارێتەوە

کەبیینێ ڕیشی خۆی بەزەوی‌دا دەکێشا : ئاکامی نزیکە . کەڕیشی سور و ڕەش بێ : لەگەڵ پیاوێکی گەورە کێشەی لێ پەیدا دەبێ . کەبیینێ ـ ی خۆی بەددانی دەبڕێ : زیان بەخانەوادەی دەگات . کەبیینێ ـ ی وی لەبەر نەخۆشی هەڵمەوەرێ : ترسی مەرگی کوتو بڕی هەیە و ئابڕوو ماڵیشی دەڕوات . کەـ ی‌شانەو گوڵاویشی پێداکات : کارێکی وادەکات سوپاسی بکرێت . کەدەستی بەڕیشی دابێنیو چەند توو کێکی بەدەستەوە بێ :ماڵی لەناو دەچێ ڕیشی کورت و کچکەبێ ئەرزی بۆ دەدرێتەوە ولەخەمیش ڕزگاری دێ . ـ ی‌بکەوێتە سەر زەوی :دەمرێ کەژن ـ ی بێ : منداڵی نابێ . کەمنداڵێکی سادە خۆی‌بەڕیشەوەبیینێ : خەمو خەفەتە . کەیەکێك ـ ی‌وی بگرێو بیکێشێ :ماڵی وی بە میرات دەستێنی . کەـ ی‌خۆی بەبراوی بیینێ :زیانی‌ماڵ و ڕێزە .

ڕێگر ابن‌سیرین دەڵێ: ـ لەخەوندا پیاوێکی شەر کەرە کەبیینێ بەڕێگری ماڵێکی‌زۆری‌بردلە گەڵ‌پیاوێکی تێکەڵاودەبێ کەئەوی‌لەلاخۆشەویست و بەڕێز دەبێو سوودی لێ دەبینێ . کەـ ان لە سەروی کۆبینەوە و نەتوانن شتێکی‌لێ بستێنن : نەخۆش دەبێو ترسی مەرگیش هەیە و لە ئەنجامیش‌دارزگار دەبێ . کرمانی‌دەڵێ کەبیینێ‌ چتێکی‌لە وی ئەستاند : دروێیەکی‌لە وی دەبیێ کەبە ڕێگایەکی‌دا بڕوات وـان لەناوی بەرن : وەڵامی کارەساتی خۆشە ویستێکی‌پێ دەگات . جابر دەڵێ کەبیینێ بۆئەجەردە و چتەکی کەسێکی‌برد : ئەو کەسە لەوی دەبێتە دوژمن و زینلەگانی پێ تاڵ دەکات کەخۆی بیبێتە ـ وچتەکی کەس نەبات : نەخۆش دەبێ و لە ئەنجام دا چاك دەبێتەوە .

ڕیسوایی : ( بێ ڕێزیو ئابڕوو چون ) : بەکتر ناسین و مرایی دیئەنیە ـ بەسەر کەسێکی هێنان مووچە و مانگانەی پتر دەبێ .

ڕێواس : ابن‌سیرین دەڵێ ڕێواس لەخەوندا کەهەبێ یا بیخوا : خەفەتە . بەڵام کەبیفرۆشێ‌یایەکێك‌بیداتێ : لەخەمڕزگاری‌دەبێ . جابر دەڵێ : کەتامی -ی‌شیرین‌بێ‌و بیخوا‌لەلایەن دۆستان یا خزمانەوە : -سوودی پێ دەگات .بەڵام کەبیخوا و ترشبێ: لەو کارەی کەدەیکات‌پەشیماندەبێتەوە

ڕێوی . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی-: پیاوێکی‌تەفرە دەرەیاژن‌ویا کەنیزەکێکی درۆزنە لەخزمانی وی . کە -ی لەشەڕدا ببینێ : خۆی لەگەڵ پیاوێکی دوژمنایەتی لێ ڕوو دەدات . کە ـ لە هەڵبەزینەوەدا ببینێ : لە پەری‌یان دەترسێ . کەببینێ لە گەڵ‌ڕێویان گەمەی‌دە کا ; ژنێك حەزی لێ دە کاو دۆستایەتیە کەی بێ تین دەبێ . کرمانی دەڵێ کەببینێ شانەی - دە کرد ; فرت‌وفێڵی‌لەیە کێکی‌دە کاوتەفرەی‌دەدا . کە -یێك لەپێش وی‌چاپلووسی بکا : ئاوارەیەك‌فێڵی‌لێ‌دە کات. دیتنی کەوڵی- ماڵێکە کەبەفێڵ‌دەست دە کەوێ . شیری ـ خواردن : لەنەخۆشی ڕاست بوونەوەیەو لەخەفەت ڕزگاربوونە .هێندێکیش‌دەڵێن شیری- خواردن : نەخۆشی یاترسێکە بەوی‌دە گات . کە -بگرێ یا یەکێك بەوی بدات : ژنێکی تەفرەدەر و درۆزن‌دێنێ . کە ـ بەك‌بێتەماڵی وان‌وئارامی‌لێ هەڵگرێ : ژنێکی وا دێنێ کە ئەوی خۆشبوێ . کە ڕێوی لە لای وی هەڵبێ : قـەرزداری وی هەڵدێ

زاخ : ابن سیرین دەڵێ : ـی سەوز لەوانی ترباشترە . ـی سپی و زەرد نەخۆشی یەو زاخی ڕەش : کارەساتو ڕووشەیە . ـ خواردن: نیشانـەی مەرگە . بەرگ بەزاخ ڕەنگ کردن : خراپە . دیتنی ـ لەخەوندا هیچ واتایەکی نیە .

زار ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا کلیلی کارانەو ئەنجامی کاریەتی .
هەرچیەکی لەـ ی بێتەدەرێ : کەوهەروئاوارەی ووتەیە کەچاك بێ یاخراپ هەرچیەکی لەـ دابێ : ئاوارە ( جوهر ) ی ڕۆزی بە . کە خواردەمـەنی لەـ دابێ : چاکەی ئاینی وی یە . کەبینی چتێکی نا بەدڵی لەزاری دایە و خواردنیشی بۆوی زۆر ئاستەمە : سەختی و ڕەنجی گوزەرانە . کەچتێکی لەزاری دابێ و شیرین بێ و بەئاسانی بە گەرووی دا بچێتەخوارەوە: ئاسو- ودەیی و خۆشی گوزەرانە . ابن سیرین دەڵێ کەدەرگای ـ ی وی، سەخت بەسترابێ نەخۆش دەبێ یادەمرێ یامەرگی نزیکە . کەبینی زاری گوشادو فراوان بووە وجێگای زۆر خواردەمەنی تێدا دەبۆوە: هێنەی وی بەهرە و ڕۆزی دەستدە کەوێ . کەسێکی زاری خۆی باش ببینێ : ووتەی باش دەبێ . کە ـ ی بڕ بێ لەئاردیا گەنم :ئا کامی نزیکە . گۆشتی زاری بکەوێ زیانی پێ دە گات . کەخووێنو لەزاری بێ : قسەی دوژمنایەتی لە یە کێکی دەبێ . اسماعیل اشعت دەڵێ : کەبینی کرم یا جانەوەرێك لە زاری هاتە دەرێ یە کێك لە خێزانـە کانی وی جووێ دەبێتەوە بـەزیندووبی یابە مردوویی کەدیتی چتی پیس لەـ ی هاتەدەرێ : هەر پیاوەتێکی کە کردێتی

بەهۆی بەچاو دادانەوە لەناودەچێ . کەلەزاریەوی مرواری بێتە دەرێ بکەوێو خەڵکی هەڵیگرێتەوە : خەڵکی لەزانستیوی هونەرمەندەبن کەچتی ناپاك لە زاریخۆی فرێبدا و خەڵکی لێی بڕەونەوە : دەبێتە بوێژێکی شەڕفرۆش کەیە کێك زاری وی مۆر کاتو نەزانێ کێیە : ئابڕووی دەچێ حافظی خەون لێکدەرەوە دەڵێ : کەبینیچتێکی باش لەزاریهاتەدەر : ووتەیێکی باشو واتادار دەڵێ .

زاڵ : کەبینیبەسەردوژمناندا زاڵبووە: زاڵیوسەر کەوتنە . کەوانەیێوانیە

زان : ـی کوڕێك : ئەنجامو سەر کەوتنێکی گەورەیە

ـی کچێکی : ڕەنجو ئازارە . ـی منداڵێکیلاواز: ناهومێدیناچارییە لەـ داهاو کاریبارێکاری کردن : هەرزانیو نازو بەهرە زۆر بوونە .

زانا ابن سیرین دەڵێ : کەبینیبۆتە ـ لە بارێکی دا کە خۆی ئەزان بێ نیشانەیوەیە کەبەخرابیدە کەوێتە بەرزاروزمانانەوە . کەـ شێزانایەتی بتردەبێ کەئەزانێك وانەی زانیاریفێری خەڵکی کات نیشانەی وەیە کەبەفرتوفێڵ ئەو وولاتەی داگیر دە کات . بەلآن کە زانابێ پایە و گەورەیی دەست دە کەوێ

زەبوور ابن سیرین دەڵێ کەسێکی ببینێ کە ـیدەخوێنێ : ڕوولەخێرێ دە کاتو کاریباشدە کات . کە ـی بەئاشکرانەخوێنێ: وازلەئابینداری دێنێ کەـی بنووسێ : خەریکی کارێکیبڕسوود دەبێ .

زەرِە : ـ ی کەرێ لەخەوندابیستن : تووشیهاوارو ئا کارێکیناپەسند دیت لەلایەن دوژمن و نەزانێکیەوە .

زەردەچێوە ( زەردەچوو ) . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەون دا نەخۆشی و ڕەنجە . کەبینیێ ـی زۆر هەیە : زیانی زۆر پێ دەگات . کە کراسی خۆی پێ ڕەنگ کات : نەخۆش دەبێ .

زەردەی ڕۆژێ . دیتنی ـ لەکاتی ئلوا بوونی دا : کەڵکەڵەی بەئەنجام گەیشتوو و پیری بەختیارە .

زەردی . ابن سیرین دەڵێ ؛ هەموو چتێکی ڕەنگ زەرد : نەخۆشی و خەم و خەفەتە جابەرگ بێ یاخواردەمەنی و میوە بێ .

زەڕنیق . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەون دا ڕەنج و بیماری یە . کەبینیێ ـی دەخووارد : نەخۆش دەکەوێ . کەـی بفرۆشێ یادای بەکەسێکی وەیا لەلای وی لەناو چوو : لەنەخۆشی و خەم ڕزگار دەبێ . کەبینیێ کانی ـی دەستکەوت یا ـی بەخەروار بردە ماڵێ : ماڵێکی زۆری دێتە دەست و هەمووی لەنەخۆشی‌دا دەچوویێنی . کەبینیێ ـی لەشوو. ێنێکی‌دا کۆ دەکردەوە : لەکۆچ ( سفر ) ێکی‌دا نەخۆش دەبێ .

زەروو . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ دوژمنی چاو برسی یە . کەـ خوویێنی وی بمژێ : دوژمنی بەسەر وی‌دا زاڵ دەبێو کەم و کووڕی دەکەوێتە ناو ماڵی وی‌یەوە . کەبینیێ ـ چۆتە ناو گەرووی وی‌یەوە : دوژمنی لەناو ماڵی خۆی دایە . کەـی لەلەشی خۆی بکاتەوەو یەکووژێ بەسەر دوژمنی‌دا زاڵ دەبێ . کرمانی دەڵێ ؛ زەروو خێزانێکە ماڵی خەڵکی دەخووات . کەبینیێ زەروو زۆر کۆ بوونەوەو خوویێنی ویان مژت : ماڵی لەناو دەچێ و یالەدوژمنی زیان دەبینیێ .

زەماوەند : ـی بووك و زاوا : هاو كارێكی دەمەكیو تەفرە دەرە .

زەنبیل : ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەوندا ژنە یا كەنیزە كە كەبینێ زەنبیلی هەیە نۆ كەرێكی دەست دەكەوێ ، لەلای هێندێكانیش وایە ماڵ و بەهرەیە .

زەنجەفیل ابن سیرین دەڵێ : ـ لە خەوندا : خەم و خەفەتە و خواردنیشی دوژمنایەتی و گـفتو گۆی خراپە .

زەنگ :ـی كلیسایە : ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ نیشانەی پیاوێكی دووڕووە كەبینێ زەنگی لێدەدا : لە گەڵ پیاوێكی وا دەبێتە هاو دەم و درۆش دەكات . كەبینێ ـ شكاوە : لەدرۆیان رزگار دەبێ .

زەنگوڵە ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لەخەوندا : شەڕو دوژمنایەتی یە .
كەبینێ ئاشنایەك زەنگیبەوی داوە : لە گەڵ وی گفتو گۆیە دەكات
كەبینێ ـی زێڕینی هەیە یایە كێك داویە بەو : نیشانەی وەیە كەلە گەڵ كەسێكی دوژمنایەتی دەكات . زەنگوڵەی زیویش هەروایە . كە ـ ی مس بێ: لە گەڵ یە كێكی نەخوێندەوار دوژمنایەتی دەكات .

زەوی : دانیاڵ دەڵی ـ لەخەوندا ژنە ، دیتنی ـ ی پان و گوشاد : دیدارە ، كەخاكی زەوییە كە پاك بێ : ژنانی چاك و داوێن پـاكی دەبێ بەچەشنێكی وا كەلە نێوانی ژناندا جیاوازیو هونەرو پایەیان دەبێ .
كەبینێ ـ ە كە زۆر گەورەیە و سـەرو بنی دیار نیە : ژنێكی دێنێ . كەلە ومو ناز و بەهرە و ماڵێكی زۆری پێ دەكات .

کەلەزەوی دا خانوو بەرە دروست بکا ؛ زۆر پڕ سوودە . کەبینی لە چۆڵێکی یە وەکوو بیابان وایەو زەوی یە کەی نەناسی : کۆچ دە کا . کەزەوی هەڵکەنی و بیخووات بەقەد وی ماڵ دەست دە کەوێ .

کەبینی بەزەوی یێکی دا ڕۆچوو بەبێ ئەوەی کەچاڵێکی هـەبێ : دەمرێ . کەزەوی یێکی وەکوو بـیر یا ساردا و هەڵکەنێ : مـاڵ و سامانی بەفرت و فێڵ دەست دە کەوێ کەزەوی ئەوی بگرێ ، تووشی بەڵاو ڕووشە دێت و بەهۆی ژنەوە ماڵی لەدەست دەچێ . کەلەزەوی گوشادەوە بۆ زەوییێکی تەنگەبەر بچێ : تووشی کاری خراپ دێت . مغربی دەڵێ ؛ کەبینی زەوی لەگەڵ وی دەدوێ و مـزگینی خۆشی دایە ؛ لەگیتی دا چاکەی زۆر دەکات کەبینی زەوی یە کە گەورەو گوشاد بوو نیشانەی درێژی تەمـەن و ڕۆزی یە کەزەوی بپێوێ کۆچ دە کات . کەبینی زەوی ئاوەدان دەکاتەوە کارو باری باش دەبێ ولەژن سوودی دەست دە کەوێ . کەزەوی بەخرابی بینێ : خراپە و دوژمنایەتی یە . کەخـۆی لەناو زەوی دا بـەکوزراوی بینێ ؛ لەگەڵ یەکێکی هاوبەشی ( شراکة ) دەکا یاژنێکی مارە دەکات .

زەوی و زار ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینی لە ـ خۆی دا تۆوی دەچێنی یا داری دەچەقێنی : دەرگای ڕۆزی لەسەر دە کرێتەوە . کەبینی ـ ی وی پڕ لەدرك و داڵە باش نیـە کەبینی زەوی و زاری وی هـەمووی ڕوواوەو شین بووە : باشە . کەبینی زەوی و زاری خۆی فرۆشت : نیشـانەی ڕەنج و ئازارە . کەزەوی و زاری ئاوەدان کرد مـاڵی دەست دە کەوێ کەسیلاو زەوی و زاری وی وێران بکات لە گەورەیێکی یـەوە زیـانی پێ دە کـات ابـن سـیرین دەڵـێ ؛ کـەبینـی شـیینـاوەردی هـەیـە و جـێبـگـایـە کـەشـی

ناسراو بوو : هونەری ئایینی دەبێ . کەبینێ - دە کیلاَ بۆچاندن : تووشی کارێکی گەورە دەبێ ولەلایەن ژنانەوە سوودی پێ دەگات .

زەیتون : دیتنی - خەمو خەفەتە چونکو رەنگی رەشو تامیشی تاڵە .
کەبینێ -ی هەیەو دەیخوات : خەمو خەفەتێ دەخوات . جابری مغربی دەڵێ کە- تاڵ نیەو بەنانی یەوە دەیخوارد : سووری بە سەختی دەست دە کەوێ . لەلای کرمانیش - لەخەون دا : خێرو پیت وپێزە .

زراو کەبینێ -ی مرۆیانی دەخوارد : رقی خەڵکی دەخواتەوە . کەبینێ -ی چوار پێیانی دەخوارد : هێندەی وی ماڵی نارەوای دەستدە کەوێ کە-ی جانەوەران بخووا : بەدخوویی و رق ئەستووری و ناسازی یە . کەبینێ لەشی وی لەزراوی خەڵکی یەوە دەچوو : ئازاری خەڵکی دەوێ

زریێ . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینێ - ی فراوان و تازەو گەورەو سەوز یا سپی لەبەر کردبێ : پایەو هێز و ئابڕووی بەرز دەبێو لەخەم رزگاری دێتو لەشەڕی دوژمن دڵنیا دەبێ . کەیە کەی کۆن و تەنگ بێ : بەپێچەوانەیە کرمانی دەڵێ ؛ کە - ی سپی و خاوێنی هەبێ : ماڵ و گەورەیی و بەهرەی دەست دە کەوێ . کەیە کەی سوور بێ : خەریکی خۆشی گێتی دەبێ . رەنگی زەردی - : نیشانەی نەخۆشی یە .
رەنگی شین : ڕووشە و کێچەڵ و هی رەشیش : خەم و نیکەرانی یە . کە -ی لەلەشی دا کەنن : ژنە کەی بەرەڵا دە کات . ابن سیرین دەڵێ ؛ زریێ لەبەر کردن . لەشەڕی دوژمنان دڵنیایی یە . کەزریێی لێ وون بێ : دوژمن بەسەر وی دا زاڵ دەبێ . کەیە کێك - ی بدات بەو : رقەبەری وی دە کات و دوژمن یاریکاری وی یە . کەبینێ یە کێك زریێی دا بەوو بۆشی : ئەو کەسە دوژمنیش بێ دەبێتە دۆستی .

زریشك : دیتنی ـ خەمو خەفەتە . کەبینی ـی لەداری دە کردەوە ؛ لە گەلّ پیاوێکی رژدو چاو برسی دوژمنایەتی دە کات .

زستان : ابن سیرین دەلّی ـ پادشایە . کەبینی ـی سەختەو ئازاری خەلّکی دەدات : دانیشتووانی وێ لەپادشاوە زیانیان پێ دە گات . کە ـ هەوای سارد بێ و کەس ئازاری پێ نە گات . دانیشتوانی ئەو وولاّتی لەلایەن ؛ پادشاوە خێـرو بەهرەیان دەست دە کەوێ . دیتنی ـ لە کاتی خۆیدا ؛ نیشانەی سەر کەوتن و پیرۆزی یە .

زفت : ابن سیرین دەلّی :ـ لەخەوندا خەمو خەفەتە . کەـی هەبێ یا کەسێك پیداتێ : تووشی خەم و خەفەتێ دێت . کەـ ی بخووا : تووشی خەفەتی مندالّە کانی دێ . کەـ ی بفرۆشێ یا بیدا بەیە کێکی تر و یا لەمالّەوەی فرێ داتە دەرەوە : لەخەم و خەفەت رِز گاری دێ . جابر دەلّی کەـی لەبرینی بنێ و چاکی کاتەوە : سوودو ئاسوودەیی پێ دە گا . بەر گی وی بە ـ یەوە بێ : تووشی بەد کاری دێت .

زە کات : بروانە ( بەشی خودا ) .

ز ک دیتنی ـ ؛ مالّ وسامانە . ابن‌سیرین دەلّی : مندالّە ابراهیمیش دەلّی خزمە . کەـ ی گەورە ببینرێ : مالّ و سامانە . هی گچکە : کەم و کووری مالّو مندالّە . کەناو ز ک دەربهێنرێت و بشۆرێو لەشووێنی خۆی بخرێتەوە ؛ بەئاوات گەیشتنە کەبینی منـدالّ لەز ک هـاتە دەرێ : بەلّگەی ئەمەیە کەلەمندالّە کانی‌دا لیوا هەلّدە کەوێ کەشانو شکۆ بەخانەوادەی وی بدات . کەمووی لەسەر ز کی خۆی ببینێ ؛ قەرزدار دەبێ . کەمووە کەی بتراشێ قەرزان دەداتەوە . کە کونی لەز کی‌دا ببینێ ؛ مندالّە کانی مالی وی دەخۆن . کەز کی هەلاّمسابێ ؛

ماڵێکی زۆری دەست دە کەوێ .

رگ چوون . کەبینێ ز گی دەچێ : ماڵی خۆی بەبێ ئابۆری دەخووات .

رلووبیا . ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەوندا : تەقەلایێکە لەئەندازە بەدەر و دەستکەوتو ماڵێکی زۆرو شادمانی‌یە . کەبینێ ـی هەیە : هێندەی وی ماڵ دەست دە کەوێ . کەبینێ کەمێکی ـ لەزاری نا : ووشەی خۆشی گووێ لێ دەبێ .

زمان . زمان زمانی خاوەندی‌یەتی و بەڕێوەبەری ئەو کارانەیە کەلەلایەن چا کەو خراپەوە لەدڵی وی دایە . زمان دەبێتە قوربانی قسە گێڕانەوەو یاچیرۆ کێکی . ـ گەز : پێویستەزۆرڕاز ڕا گر بێ . بەزمانێکی یێکانە ئاخەفتن : شۆفاری‌و ساختەکاری‌یە لەکاردا . ابن سیرین دەڵێ : کەبینێ ـی بڕاوەو کەلێنی تێ کەوتووە : لەگەڵ کەسێکی دوژمنایەتی هەبێ بۆ وی باشە . کەلەکاتی ئاخەفتن‌دا زمانی بگیرێ : بەپێچەوانەیە .
کەبینێ ـی درێژ یا پان بووە : زمانی پاراو و ڕەوان وە بەسەر دوژمنانیش‌دا زاڵ‌دەبێ کە دوو ـی هەبێ : فێری زانست و هونەر و ڕۆزی پتردەبێ کەبە دەستی خۆی ـی خۆی ببڕێ : لە ووتەی خراپ خۆی دوور دەخاتەوە و لایەنی خامۆشی دە گرێ . کەیە کێك ـی خۆی لەزاری وی بنێ : لەلایەن یە کێکی‌یەوە هێز و پشتیوانی هەیەلە ووتن دا کەزمانی کەسێکی تربیژێ فێری زانست وهونەر لەو دەبێ . جابر دەڵێ کەبینێ ـی لاڵ بووە : خرابە . کە زمانی دەروێشێکی ببڕێ : چت دەدا بەدەروێشە کەوزمانی‌وی لەڕاست خۆی‌دا کوورت دە کاتەوە .
کە زمانی ژنان ببڕێ : پەردەی وی دەدڕێ و ڕازی وی‌ئاشکرادەبێ .

کەزمانی بەمەلاشوویەوە نابێ ; قەرزدار دەبێ . دانیال دەڵێ ! کە-ی ئەستوورو بەهێز بووبێ ; بەسەر دوژمنـان دا بەهێز دەبێ . کەزمانی بریندار بێ : بوختان وُ درۆ لەڕاسـت یەکێکی‌دا دەکات . کەمووی لەزمانی هاتبێ ; بەهۆی زمانی‌یەوە تووشی ڕووشە دێت .

کە-ی هەلامـێ : بەقسە ماڵێکی دەست دەکەوێ . کەبینێ زمـانی وی درێژ بووە ; قسەی ڕەق و بەدگۆیی گووێ لێ دەبێ . کەزمانی بوویتە دوو لك ; دەبێتە دوو ڕوو . کەبینێ -ی نیە ; لەهەموو کاراندا دادەمێنی . کەبینێ سەری -ی بڕاوە یانیەتی بەچەشنێکی‌وا کەنەتوانێ باخووێ ; کاروباری وی بەدەستی دمڕاست (و کیل) ی وی جێ‌بەجێ دەکرێت . کەزمانی ووشك بێ : خراپە .

زمڕووت . ابن سیرین دەڵێ ! ـ منداڵو برایە یاماڵی ڕەوایە ( حەلالە ) کەبینێ -ی‌هەیەیا کەسێك داویە بەوی: منداڵێکی دەبێ یابرادەرێکی سوودی لێ‌دەبینێ . کەبینێ ـ ە کەی بزر بووە : منداڵی دەمری‌یاماڵی لەناو دەچێ . جابر دەڵێ ـ لەخەوندا ووتەی باشە .

زنجیر ; ابن سیرین دەڵێ :ـلەخەوندا گوناهە وتاوانە کەبینێ ئەو -ی‌پساند و فڕێ‌ی‌دا ; خۆی‌لە کاروباری گەند دەپارێزێ . جابر دەڵێ کەبینێ -ی لەمل‌دایە ; وەباڵی خەڵکی لەگەردنی دایە . کە ـ ی لە پێ دابێ ; لەماڵی خەڵکی‌دا تاوانێ دەکات یا تووشی گرفتارێ دێت . کە بینێ -ی‌لەدەستی دایە ; دەستدرێژی بۆ ماڵی خەڵکی دەکات .

زۆرەوانی : ابن سیرین دەڵێ کەلە خـەونی دا بینێ کەلە گەڵ کەسێکی ـ دەگرت و ئەوی بەزەوی دادا ; کاروباری باش و بەسەر وی دا زاڵ

دەبێ . کەهەردوو کیان نەکەوتن و بەربەرەکانێتی یەکتریان کرد : هەردوو کیان زیان پێك دەگەیەنن و لەوانەیە ئاشتیش ببنەوە

زورنا لەبۆڕی دا بیدۆزەوە .

زۆرو زەوەند . -ی پارە : سەر کەوتنێکی دەمەکی ( مؤقت )ە .

-ی زێڕ : رِق و قینە . هی ئاژاڵ و ماڵاتان : داد پرسی ( محاکمە ) یێکی ئەنجام خراپە . -ی گوڵ : کەنکەڵەو بیرو ڕامانی بێ جێبە .

-ی میوە : شادمانیانی کۆمەڵایەتی‌یە .

زۆڵەچەرم . ابن سیرین دەڵێ ؛ چەرم لەخەون دا دیتن : سوودو قازانجە . کەبیبنێ - ی پارچە پارچە کردو لەناوی برد . زیانە جابر دەڵێ کە -ی زۆر هەیەو هی جانەوەرێکی وایە کە گۆشتی نەخورێ : ماڵی ڕەوایە

زێڕ . ابن سیرین دەڵێ ؛ پیاو کەزێڕ و زێوی لەخەونی‌دا ببینێ . خەم و خەفەتە بەلاٚن بۆ ژنان باشی و سوودی تێ دایە . کەببینێ زێڕی هەیە یادەستی کەوت و یایە کێك داویەتێ : هێندەی وی ماڵ لە ناو دەچێ . کرمانی دەڵێ ؛ کەببینێ زێڕ یازێوی دەتاوێنێتەوە دەکەوێتە بەر زمانی خەڵکی یەوە . کەببینێ زێڕی دەکڕی و دەفرۆشت : خەم و خەفەتی بێ دەگات . کەببینێ زێڕی بەخەروار دەبردە ماڵێ : ماڵێکی زۆری دەست دەکەوێ . کەببینێ زێڕی دەخووارد . هێندەی وی ماڵی لەمنداڵی‌دا دەچووێنێ . جابر دەڵێ ؛ چتەکی زێڕین بۆ پیاوان خراپە . ئەگەر کەسێکی زێڕو زێوی یەك جێ دەست کەوێ : ڕێزو پایەو بەهرەیە . ئەگەر کانی زێڕی ببینێ لەماڵە گەورەیێکی کچێکی دەخووازێ بەلاٚن خەمگین دەبێ . کەببینێ لەگەڵ زێڕین گەرێکی دانیشتووەو دەئاخووێ تووشی درۆزنێکی دێت

زێڕِ درووو : درۆ و فێڵ و فەرج و ساختەیە .

ـ ن : شانازی و بەرزی پایەو شانە .

زیرە : ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا کە ترشێکی ڕوو بەشیرین بێ :خێر و سوودە . کە زەعفەرانی بێ : نەخۆشی یە هێندێکیش دەڵێن: مایەی خەم و خەفەتە . ابن سیرین دەڵێ کە ـ لەخەوندا زۆر بێ : سوودە کە کەم بێ سوودی کـەمتـرە

زین : ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا لەسەر پشتی وولاخان نەبێ : ژنە . کەلە سەر پشتیوان بێچاکەو خراپیوی ئێخەی سواری دەگرێتەوە . کەزینی بکرێ یایە کێك بیداتێ : کارە کەرێکیدە کرێ یاژنێکی دێنێ و سامانداز دەبێ یامیراتی دەست دە کەوێ . کەبینێ ـی ویشکا یا لە ناو چوو : ژنە کەی دەمرێ یانەخۆش دەبێ . کەـە کەی بەزێڕ یابەزیو ڕازاێتەوە : ژنە کەی بەهەوا و فیزە . کەژن ـی بینێ دەلالیبە .

زیندان : ابن سیرین دەڵێ ئەگەر کەسێك بینێ کە لە زیندانێ دایـەو ئەو زیندانەی قەت نەدیتووە: دەمرێ چونکوو ـی بێسەروشووێن : گۆڕە ئەگەرزیندانێکی ناسراو بینێ: خەم و زیانە کەبینێ یە کێك بە کۆتەوە دەڕۆیشت : گرێی کاروباری دە کرێتەوە کەبینێ چووەناو ـ ەوە و زوو هـاتە دەرێ : بە تەواوی بە ئاواتی دە گات .

زیندووبوونەوە : ابراهیم دەڵێ کەبینێ مردوویەك زیندوو بۆتەوە: باری باش دەبێ بەتایبەتی کە مردووە کەی بەروو خۆشی بینێ . کەزیندووە یێکی بەمردوویی بینێ : بەپێچەوانەی ئەمەیە . کەباوکی مردووی خۆی بـەزیندوویی و بەبەر گی بـاشیو کەیفخۆشییەوە بینێ : کارو بـاری ڕێکدە کەوێو سامانیشی پتر دەبێ . کەژنی مردووی خۆی لە خەوندا بەزیندوویی بینێ : دەیێتە دەروێشو هەژار

کە کوڕی مردووی خۆی بەزیندوویی ببینێ : لەخەم ڕزگاری دەبێ کە ژنێك ببینێ کوڕە کەی زیندوو بۆتەوە : بە کێکی ئاوارەو دەربەدەری دەگەڕێتەوە .

زێو کەسێکی ـی لە کانگـای دەرێنی : لەشـارە کەی خـۆی دا ژنێ دەخووازێت و مالی دەست دە کەوێ . کەدرەمێکی زێـوی هەبێ : مندالێکی جووانی دەبێ . ابن سیرین دەلێ ؛ زۆر کەس لەخەونیان دا زێویان دیتووەو لەبێداریێتیدا ئەویان دەست کەوتووە ، هێندێکیش دەلێن ؛ بەهۆی سرشتی ڕەنگاو ڕەنگەوە تووشی و ڕەنجە .

ابراهیم دەلێ ؛ دیتنی زێو لەخەون دا : وەلام و دەنگ و باسی ڕاستە دیتنی زێوی شکاو : هی درۆیە . کەببینێ زێوی لە کیسەدایە : چتێکی بەئەسپاردە ( أمانەت ) لەلای وی دادەنێن . کەقاپ باتەشت و چتی وای زێوین ببینێ : مـالی کۆ کراوەیە . کەزێوی زۆر دەست کەوێ : گەنجی دەدۆزێتەوە .



ژاکاو ( گەچراو ) چنی- خواردن : خەم و خەفەتە . کە کەسێك چێکی - بدابەوی و لێی بخوات : لە بە کێکەوە تووشی خەم و دووژمنایەتی دێ . کەلێی نەخوات : هیچ جۆرە خەمێکی پێ ناگات .

ژاله : بڕوانە ( لوورِك )

ژەنگ : ابن سیرین دەڵێ : - لەخەوندا خەم و خەفەتە . خواردنیشی مایەی لە ناو چوونە .

ژەنگەسوورە : ابن سیرین دەڵێ :- لەخەوندامرۆڤی سووك وسپلەیە کەبینی - ئەوی گرتووە . لەمرۆڤی خراپوسپلەوە ئازاری پێدەگات کە - یێکی زۆرلە سەرروی کۆبینەوە: لەنێوان مرۆیانی سپلەدا گرفتاردەبێ بەتایبەتی کەیێکەزن . کرمانی دەڵێ کەبینی - گەزتی : تووشی ژنی خراپ وسپلە ودووزمان دەبێ . کە-ی بکوژێ : بەسەردوژمناندا زاڵدەبێ کەبینی لەحەوایەدا - یێکی زۆر کۆبونەوە لەشکرێك ڕوولە وێ دەکا

ژەهر ابن سیرین دەڵێ :-لەخەوندا : ماڵی نارِەوا ( حرام ) یەوشەرِ کردن و کوشتنی نارِەوایە . کەبینی -ی دەخوات : ماڵی نارِەوای دەست دەکەوێ یاخوێنی بێتاوانێکی دەرِێژێ . کەبینی لەشی لەبەر - خواردنی هەڵاەمساوە. تووشی ماڵی نارِەوا دێت . کرمانی دەڵێ : کەبینی لەشی ژەهراویە لـە گژ کارێکی سەخت ڕادەچێ . هێندێکیش دەڵێن قسەیەکی بۆ هەڵدەبەستێ و ئەوی بەوقسەیە دەبەزێنێ . کەبینی لەبەر -ی زیان بەلەشی گەیشتووە: ماڵی بە ڕەنج دەستدەکەوێ . هێندێکیش دەڵێن - خواردنی ڕق خواردنەوەیە

ژن : ابن سیرین دەڵێ ـی جحێڵ لەخەوندا : شادی و مرازە . ـی پیر : گێتی یە
ژنێکی بەرگی پیاوانی لەبەر کردبێ لەکەرنابڕوو مەند بێ : خێرو چاکەیە
دیتنی ـ لەخەوندا بەپێی جووانی و دزێوی و جحێڵی و پیری و قەڵەوی و لاوازیە
دیتنی ژنێکی قەڵەو و ناسراو : گوشادی و ڕۆزی یە ـی ناشیرین و لاواز :
تەنگانەو قاتی و قڕی یە . ژنانی جووان و ڕووخۆش و ڕازاوە : ئاواتی
گێتی یەو پیرەژنانی چڵکن : بەئاوات نەگەیشتنە . ـیکی بیینێ کەسیرەتی
هەیە : منداڵێکی وای دەبێ کەبەسەر خانەوادەدا گەورە دەبێ . ـێکی جحێڵ
کەبیینێ پیر بووە : چاکەو باشی یە . مغربی دەڵێ دۆستایەتی ـ بۆ ئەهلی دونیا
: ماڵ و سامانە . ژنی نەناسراو باشترە لە ـی ئاشنا . کەبیینێ یەکێك بۆ ـ
ـەکەی وی دەستدرێژی کرد : خزمەکانی ژنەکەی دەوڵەمەند دەبن .
کەبیینێ ـەکەی بۆ کارێکی خراپ چۆتەلای بێگانەیێکی : کوڕێکی
باشی دەبێ کە ـێك بیینێ کچی هەیە : خێرو چاکەی بۆ دەگاتێ لە خزم و
کەسانی خۆی شادمان و خەرۆدە بێ . کەـێك بیینێ منداڵێکی نێرینەی بووە
: خەمبار دەبێ . کەپیاوێك بیینێ ـە کەی کوڕی بووە بەڕەنج چتی دەست
دەکەوێ . کە کچی بێ : سوودی پترە . کرمانی دەڵێ کەژنی پادشا بیینێ
کچی بووە : پادشا گەنجی دەستدەکەوێ . کە کوڕی بێ خەم و نیگەرانیە
کەپیاوێك بیینێ کچی بووە : خەمە . کە کوڕی بێ لە کارێکی دانا وی باش
دەردەکا . کچێکیش بیینێ کەمنداڵی بووە : هەروەکوو ڕابردوو وایە .
صادق دەڵێ کەژنێك بیینێ کوڕێکی بووە و هەرئەو دەمەش لەگەڵی دا
خەوت : مەرگە . ـی پیر : دونیایە . ـ ناپاکی (خیانەتە) یەهێندێکیش
دەڵێن : شادی و ئاواتە . کەژنەکە جحێڵ بێ : کەیفخۆشی و کامەرانی و
هەواو هەوەس پەرستی یە . دیتنی ژنی ئاوس : سەر سووڕمان و

سەر گەردانیەکی گەورەیەو بەسەرهاتێکە. وەدا کەچاوەڕوان‌نەکرابێ

ژن‌لەباوەش گرتن : ئارەزووی‌هەواوهەوەسی‌هۆلمانی (نفس) یە .

کوژتنی-: بەسەر هۆلماندا زالٚ بوونە . کەلەخەونداکارە کەرێکی ڕەش

بیبنرێت : ڕەنج‌وئازارێکی کەلەتوانادانیە مرۆخۆی‌لی‌دوور دەخاتەوە

کەـە کەبرچی‌سپی‌بێ : شۆفاری‌و دووارۆژێکی‌خراپە . کە - یێك‌ببینێ

سیرەتی‌هەیەو لەو کاتەدا ئاوسیش‌بێ : کوڕێکی‌دەبێ و بەلاٚن دەمرێ .

بەلاٚن کەزکی نەبێ : ئاووس دەبێ .

ژمارە ( عدد ) : ابن سیرین دەلێ دیتنی - : باشە ابراهیم‌دەلێ ژمارە(١)

باشەبەلاٚن ( ٢ ) خەم‌وخەفەتە کەژمارە ( ٣ )ی ببینێ : لەکارێکی‌دا کەبە

دەستی‌یەوەیەبەرخوردار نابێ‌ژمارە ( ٤ ) باشە ژمارە ( ٥ و ٦ )زۆر باشە

ژن خوازتن : ابن سیرین دەلێ کەبینێ ژنی دەخوازێ : ئابڕوو و گەورەیی

دەستەدە کەوێ . جحێلێك لەخەونیدا ببینێ ژنی‌دێنێ : ژنێکی‌جحێل‌دێنێ

کەلەخەونی‌داژنی بەرەڵابکات : ئابڕوو و گەورەیی لەدەست دەچێ . کە

ژنی مردووی خۆی‌بکاتەژنی‌و لە گەلێ کۆ بێتەوە : هێندێکی لەمالٚ و

سامانی‌وی‌دەستەدە کەوێ . کەسێکی لە خەونی‌دا ژنێکی وا بخوازی کە

نەیدیتبێ‌ونەیناسێ :ئاکام ( اجل )ی نزیکە . کەژنێکی ناکەس بێنێ‌ولە

گەلی کۆبێتەوە : کاروباری گران لەپێش‌وی ئاسان دەبێ ، کە لە گەلی

کۆنەیێتەوە ئەوەی کوتم کەمتر دەبێ . کە کچێکی یێنێ و کچینی لابیات ؛ لەوساڵیدا ژنێك یا کەنیزەکێکی بێ دەبڕێ و لەپادشاش خێرو سوودی پێدەگات .

ژوور بڕوانە ( دیو )

ژووژك ( ژووشك ) ابن سیرین دەڵێ : ـ لە خەونەدا دوژمنێکی ناحەز و بەد خووە .

کەبینێ ـ ی کوژتووە : دوژمنێکی لە ناو دەبات . کەبینێ گۆشتی ـ ی دەخووا ؛ هێندەی وی ماڵی دوژمن دەستدە کەوێ . کەبینێ ـ ئەوی گەزت بەچەشنێکی وا کە خووێنی لە بەر بڕوات : لە کەسێکی ـ یەوە زیان و ئازاری پێدەگات .

ژێر دەریایی : دیتنی ـ ؛ دوژمنێکی پەنهان و نهێنی‌یە کە زیان بە تۆ دەگەیەنێ .



سابوون . ابن سیرین دەڵێ کەبینێ بەرگی خۆی بەسابوونی دەشووات : نیشانەی وەیە کەیەکێکی کاری خراپ دەگێڕێتەوە . ـ خـوواردن : خوواردنی چتی نارەوایە . کرمانی دەڵێ کەسێکی کەبینێ ـی زۆر هەیەو بەرگی پێ دەشووا : لە ئاوات دوور کەوتنەوەیە . جابر دەڵێ ؛ کڕینی سابوون لەفرۆشتنی باش ترە .

ساردا‌و : بڕوانە ( سەرداو ) .

سەتڵ (دۆلکەی ئاو هەڵێنجانێ ) ـ لەخەوندا : پیاوێکە کەماڵانی ئەنا‌سراو دەردێنێ . کەبینێ ـە کەی پڕ ئاو کرد یائاوی بەوی هەڵێنجا : هێندەی وی ماڵی بەرەنج دەست دەکەوێ . کەبینێ ـە کەی پڕ لەئاوی خاوێنی هەیە یایەکێك بەوی داوە : ماڵێکی بەئاسانی دەستدەکەوێ . کەبینێ بەـ ئاوێ لەجۆگەی هەڵدێنجا : هێندەی وی ماڵ دەستدەکەوێ بەفرت و فێڵان . کەئاوی ـە کەی برژێتە سەرزەوی : ماڵی خۆی بۆچتێکی یا بۆ خێرێ دەچووێنێ . جەفری صادق دەڵێ : کەبینێ ـ ێکی گەورەی هەیە یایەکێك داویە بەوی : لەگەڵ یەکێکی ماڵدار دەبێتـە دۆسـت و سوودی لێ دەبینێ . ابن سیرین دەڵێ : کەسێکی بینێ کە ـ ی هەیـە ؛ نۆکەریاکارەکەرێکی ڕادەگرێ . کەبینێ ـە کەی شکاو ەخزمەتکارە کەی دەمرێ . جابر دەڵێ ـ ی نووێ : کارەکەرێکی زۆر جـوانـە .

سەدەف : ( ابن سیرین ) دەڵێ کەبینێ ـی هەیە : نۆکەرێکی پەیدا دەکات کەبینێ ـە کەی لێ بزر بووە : نیشانەی وەیە نۆکەرەکەی هەڵدێ .

سەر : لەخەوندا سەرۆکی هۆزە . کەبینێ ـی براوێ هەیە یاهەڵی گرتووە گەورەیێکی خۆش دەوێ ولەوی‌یەوە خێر و سوودی پێ دەگات . کە بینێ سەری ویان بەبێ تیغ لەلەشی جووێ کردەوە : کەقەرزدار بێ قەرزە کانی بۆ دەدرێتەوە ولەخەم ڕزگاری دێ . کەئەو خەونەبەندە ( عبد) بێ

ئازاد دەبێ . کەنەخۆش بی بینێ : چادەبێتەوە . کە گەورەیێك بی بینێ : وولاتی دەستدە کەوێ . کەهی ئازاد بی بینێ : ژنێکی دەولەمەند دێنێ هێندێکیش لایان وایە ئەو کەسە لێ دە کەوێ . ابن سیرین دەڵێ ؛ کە کەسێك چەند سەرێکی بڕاو لەشوێنێکیدا ببینێ فڕێ دراوە : دەستەیێك لە گەوران لەوی کۆ دەبنەوە . کەببینێ لەوسەرانە موو یا پێست یامێشکی هەلگرت : ماڵی لە لایەن گەورانەوە دەست دە کەوێ . کە پێستی سەران بخووا : ماڵی لەسەرۆکان دە کەوێ . کەپێستی سەری یەکێکی نلسراو بخووا : سەرمایەی کەسێکی دەخووا . کەببینێ سەری باڵندان دەخوو! : ماڵی پادشای دەخووا : کەی ژنان ببینێ : لەژنانی دەولەمەند ئاسوودە دەبێو خێری پێ دە گات . کەببینێ سەری مەڕی دەخووا : تەمەنی درێژ دەبێ و ماڵی ڕەواشی دەستدە کەوێ . کە ببینێ سەری گای دەخووات : لەوساڵیدا ماڵو بەهرەی دەست دە کەوێ .
کرمانی دەڵێ کەسێکی لەخەونیدا سەری گەورە ببینێ : بەپایە دە گا کەببینێ دوو سەری هەیە : کارو باری بەهێز دەبێ . کەسەری خۆی بەڕووتی ببینێ : لەو کارەی لە کیس دەچێ کەهەیەتیو خەمگین دەبێ کەببینێ لەسەری خۆی هەواو کیم و خووێن دێ : تووشی گێرە و کێشەی دێ لە گەڵ یە کێکی . کەببینێ لەی وی مێشك هاتە دەرێ و ڕژایە سەر زەوی : سەرمایەی لەدەست دەچێ . کەمێشکە کەی بخاتەوە شوێنی خۆی : مایە کەی دێتەوە دەست . کەسەری چەور بێ . کارو باری خێری دە کات . کەسەرێکی بڕاو بە دەست خۆیەوە ببینێ : ماڵێکی زۆری دەست دە کەوێ و لەوولاتێکیدا گەورە دەبێ .

سەر : کەبینی ـ ێکی بڕاوی بەدەستەوەیە و نەزانی هی کێیە : دە هەزار درەمی زێوی دەستدە کەوێ . کەبینی ـە کەی فڕێ دایە سەر زەوی : ماڵێکی هەیەتی لەدەستی دەچێ . ئەگەر دوو سەری بڕاو بە دەستـەوە بینێ : ماڵێکی زۆری دەستدە کەوێ . کەبینی سەر لە گەڵ وی دەدوێ بەباش : دادو مرۆیەتی لەوی ڕوودەدات . کەسەر بەخرابی لە گەڵی بدوێ مرۆیەتی ( انصاف ) نیە . کە بینی سەری بۆتە دوولەت ؛ لەتێکی لـە دەستی ڕاستی داو ئەوی تریشی لەدەستی چەپی دایە : دایك وباو کی دەمرن کەسەری خۆی لەدەستی خۆ بدابینێ لە گەورەیێکی یەوە خێروسوودی دەستدە کەوێ . کەسەری دوولەت بێو وێك کەونەوە : دایك وباو کی نەخۆش دەبن وچادەبنەوە . جابردەڵی کەسەری خۆی وە کوسەری فیلی بینێ : ماڵو وولاتی دەستدە کەوێ . کەبینی سەری وی وە کووسەری شێری لێ هات : تووشی خرابە ومالی نارەوا دێت . کەسەری وی وە کوو سەری ئەسپی لێ بێت : لەلایەن پادشاوە ماڵ و بەهرەی دەستدە کەوێ کە ـی خۆی وە کوو سەری وورچی بینێ ; لە بەختی خۆیدا بەئاوات دە گات . کەوە کوو سەری مەڕی لێ هاتبێ : نەزانێ بەسەر وی دا چیرە دەبێ . کەبینی وە کو هی ووشتری یە ; دەبێتە فەرمانڕەوا وبەسەردوژـ منانیدا زاڵدەبێ . کەسەری وی وەشووشە بچێ : دەمرێ . کەبینی سەری زێوین یازێڕینە : ماڵی دەستدە کەوێ . کەسەری وە ئاسن یابەرد بچێ : خزمەتی پیاوێکی سەر سەری دە کات . کە لە سەری وی داناگر بسووتێ و هەڵبێ : کـارو بـاری باش دەبێ . اسماعیل اشعث دەڵی کە بینـێ سـەری وە کـور سـەری چـوار پـێ یـانی لـێ هـا تـووە

خەم و خەفەتە . کە ببینێ سەری وی وەك هی جانەوەرانی لێ هاتووە : هەربە قسە وولاتێکی دەگرێ و بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . کەسەری وەکو هی باڵندانی لێ هاتبێ کۆچ دەکا . کەببینێ یەکێك سەری وی لەلەشی جووێ کردەوە و دووبارە لە شوێنی خۆی دانا وە و چاك بۆوە : لە ئەنجامدا لە رێگای خودا دا دەکوژرێ . کەببینێ سەرێکی لە تەنیشتییە ژنەکەی ناووس و کوریشی دەبێ . ئەگەر ژنێك سەری خۆی بەتراشراوی ببینێ : مژدە کەی دەمرێ . کەسەری بەرژاو بخوا ماڵە . جابر دەڵێ کە سەری برژاو بخوا : سەرۆك . کە سەری بریانی بکرێ یا بیدرێتێ : لەیەکێکەوە سوودی پێ دەگات کەسەری خاو بخوات : لەپشتە سەری گەورەیەکی دەدوێ سەری کوڵاو و برژاو لە هی کاڵ باشترە اصفهانی دەڵێ سەری مرۆیان لە خەوندا باو کە یا کورە . کەسەری خۆی بەبراوی ببینێ نیشانەی جووێ بوونەوەیە لە دایكو باوکی کەسەری خۆی لەسەر دەست ببینێ : لە گەڵ وان رێکدەکەوێ کە سەری خۆی دووبارە لە ملی بنێتەوە : کووتاڵی لە یەکێکی وەردەگرێت یاقەرز وەردەگرێت . کەببینێ چەند سەرێکی براوی لەپێشەوە هەڵدەبەرن : خەموخەفەت توو شی گەورەی ئەو وولاتی دێت . کە سەری پادشای لە سەر شانی خۆی ببینێ : دە هەزار درەمی دەست دەکەوێ بەڵان بەرەنج .

سەرا : ( خانووبەرە ) دانیاڵ دەڵێ کە کەسێك ببینێ چۆتە ناو ـ ی کەسێکی بێگانەوە و کەسی نەناسی و لەوێدا مردووی زۆر دیتن : ئەو سەرایە سەرای بەسڵان ( قیامەت ) ە وخەون دیتوو ئاکامی نزیکە . کە ببینێ چووە ناوی ولێی هاتە دەرێ : نەخۆش دەکەوێ و بەڵان چاك دەبێتەوە

سەرا . کەبینی چووە ناو سەرای ناسراوێکی کەلەگڵ بێ : ڕۆژی ڕەوای دەست دەکەوێ بەڵاّن کەبنیاتی لەخشتی و گێچی بێ : ماڵی ناڕەوایە . کەسەرایەکە گوشادو گەورە بێ : دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە کەگچکە بێ : وانییە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینی ـیەکی گەورەو گوشادەو لەوێدا کۆشك‌و هەیوان زۆر هەیە : نیشانەی ئەوەیە کەلە ڕۆژی دووایی ( بەسلاّن )دا ئابڕوو و پایەی دەستدە کەوێ بەڵاّن لە وێدا کێشەڕوودەدا . کەسەرای‌خۆی‌هەڵکەنی: ڕێگای‌باشی‌لەسەرخۆی دەگرێ . کەبینی سەرای کۆنەی هەڵدە کەند : دەرگای خێراتی بۆ دەکرێتەوە . دیتنی ـی نووێ‌و خاوێن : نیشانەی لەش‌ساخێتی‌و تەمەن درێژی دایك‌و باوکی‌یەتی . جابر دەڵێ ؛ کەبینی چووە ناو سەرایەکی پاك‌و نووێ‌و زانی هی خۆیەتی : دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوەو بەپایە دەگات . کەدەزگای ـە کە بشکێ یابسووتێ : خاوەندەکەی تووشی ڕووشە دێ .

سەراپەردە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا ـی بینی‌و هی خۆی بێ ا تووشی گەورەیی‌و پایە دێت . کەهی پادشای بێ : لەوەوە ڕێزو پایەی دەستدە کەوێ . کەـ بڕووخێ هی‌هەر کەس بێ : لەسامان ودەستەلاّت دەکەوێ . کەـ بسووتێ : خاوەندەکەی دەمرێ . کەلەناو ـدا دانیشێ کالاّی گێتی دەستدە کەوێ یاژنی دێنێ کەـە کە هی خۆی بێ . کەـ کەی بەخەنەی ڕەنگ بکات : لەڕێگای گوزەراندا دەردەدار دەبێ ـی سەوزو سپی : خێرو چاکەیە . ـی سوور : خۆش ڕابواردنە . ـی شین : خەم و کارەساتە . ـی ڕەش : سوودێکی کەمە .

سەرەتیر : بڕوانە ( سەرە نیزە ) .

سەرەنێزە . جابری مغربی دەڵێ ؛ دیتنی - لەخەوندا : هێزە لە کوتن‌دا کەبە دوژمنی بلێ . لەخەوندا دیتنی - : پیاوێکی گەورەبەو تەلەزگەیێکی زۆرە . کەسەرنێزەی تیژی هەبێ پایە کێك پیداتێ : کارو باری دروست دەبێ کەببینێ -ی لەلەشی دوژمنی بدات و پیخات : بەبەهانەو پابەبە. ئگە بەسەر دوژمن دا زاڵ دەبێ . کە-ی خۆی بەشکاوی ببینێ‌و پالێ‌ی لەناو بچێ واتایە کەی بە پێچەوانەیە . کرمانی دەڵێ کەببینێ -ی پۆلاو تروسکە داری هەیە ئەگەر لەو بووەشێتەوە : وولاتی دەست دەکەوێ دەنا لە گەورەیێکی‌یەوە سوودی دەست دە کەوێ . کە- ژەنگی گرتبێ: سوودی کەمترە

سەرەك وەزیر کە - ی ببینێ : پیاوێکی گەورە ئاوڕی لێ دەداتەوە و چاکەی لە گەڵ دەکات

سەرباز بە پیشك ( قرعە ) لە هەر لایەکی‌یەوە مزگێنی و وەڵامی خۆشـە ( -ی سووارە ) : مزگێنی دەری بەختیار و پیرۆزە

سەربازخانە ( هێز ) : ئارامی و توواناو بەسەر دوژمنانـدا چیرە و زاڵ بوونە

سەربڕین : ابن سیرین دەڵێ : کە کەسێك ببینێ سەریان بڕی و لـە لـەشی جووێ بووەوە : کە خەون بین بەندەبێ ئازاد دەبێ ، کە نەخۆش بێ : چاك دەبێتەوە ، کە قەرزدار بێ : قەرزی بۆ دەدرێتەوە ؛ کـە هـەژار بێ : دەولـەمـەنـد دەبێ

سەرپەرشت : ابن سیرین دەڵێ کەببینێ لەوشوێنێ دا بۆتە- : دوژمن ئێلی لێ‌دەکات کە بە سەر ئاوی ڕوون و پاك دابێتە - : دەبێتە پایەخداری پادشا . کەئەولە - یتی بخرێت : زیانە .

سەرپەرشت : لەـێتیدا : کاروباری باش و خێری تێدایە .
سەرپۆلیس ( مفوض ) تەلەزگە ( خطر ) یێکە ڕوو لەپۆلیسان دەکا .
مرۆ کە خۆی لەخەونیدا بوو یێتە ـ : پاداشی دڵداریێتی‌یە .
سەرتاووس ( اصلع ) : کابرایەکی ـ ی ببینێ کە مووی لە سەری هاتووە مالێکی کەمی دەستدەکەوێ . کەببینێ لە خەونیدا بۆتە ـ : لە خـەم و خەفەتان ڕزگاری دێت . کەژنێك ببینێ لەخەونیدا بۆتە ـ لەجووانی و شەنگی‌وی دا کەمو کوڕی پەیدا دەبێ . دیتنی ـ کەبازرگان‌بی :سوودە بۆپادشا لێ‌ڕامانە ؛ بۆ گردو کۆکار ( کاسب ) ان : سوودە .
سەرجێبی : کەببینێ لە گەڵ یەکێکی ـ کرد : لەوەوە چاکەی دەبینێ و ئاتاجی یێکدێ . کەببینێ ـ یەکێکی‌تر ـ وی‌دەکات : خانەوادەی‌وی دەوڵەمەند دەبێ . کەلەگەڵ ژنی خۆی ـ بکات بەچەشنێکی وا کەپیاوـ ەکە لەژێرەوە بێ : ژنێکی تر دێنێ و سوودی لێ دەبینێ . ابن سیرین دەڵێ : کەلەگەڵ ژنی خۆی لەڕێکایەکی ترەوە ـ بکا : نیشانەی وەیە کەپیاوێکی هیچو پووچ‌و بێ شێوازە . کە لەگەڵ دایك یـا خوشکـی خۆی یائەو کەسانەی کە بۆی ڕەوا نین ـ بکات : قازانجی خزمایەتی لەو دەبڕێ . کەزیندوو بن یامردو : خەم و خەفەتە . هێندێکیش دەڵێن کەزیندووبێ : خێرو چاکەی لێ دەبینێ　کەلەگەڵ ژنێکی مردووـ بکا : خەمگین و پەرێشان دەبێ هێندێکیش دەڵێن ئاواتی پێك دێ . کە لەگەڵ ژنێکی مردووی یێکانە ـ بکات : کارێکی دەکات بەناری ژنە مردووەکەی کەبەتەواوی لێی ناهومید بووبێ . کەلەگەڵ کەنجێکی نەناسراودا ـ بکات کەدوژمنایەتی‌یان لەنێوانیدا بووبێ : دەبنە دۆستی یەکتری . کەلەگەڵ پیرە مێردێکی ـ بکات : سوودی لێ دەبینێ .

کەلەگەڵ کچێکی ـ بکا : لەو سـاڵی دا ژنێکی دێنێ یا کەنیزەکێکی دە کرێ . کەلەگەڵ شاژن ـ بکا : سوودەو بەسەر دوژمن‌دا زاڵ دەبێ کەلەگەڵ جانەوەرێکی دڕندە ـ بکا : کاروبـاری پێکـدێ و بەسـەر دوژمن‌دا زاڵ دەبێ ، هێندێکیش دەڵێن لە پادشـاوە ترسی بێ دەگـات کەلەگەڵ باڵندەیێکی ـ بکات بەسەر ئەو کەسەدا زاڵ دەبێ کەپەیوەندی بەسەر باڵندە کەوە هەیە . پیرەمێردێکی کەتوواناى ـ کردنی نەبێ .
لەخەونی‌دا ببینێ وەکوو جحێڵانی لێ هاتووە : ڕوو لەئایین دەکات کەلەگەڵ ژنێکی ناکەس ـ بکات : دەبێتە هـەوا خوازی ماڵی نارەوا ئەو خەونە ژنێکیش بی بینێ هەروەکوو وی وایە . جابر دەڵێ لەگەڵ ووشتر ـ کردن : ڕزگاری‌یە لەسەختی‌و بەسەر دوژمنان دا زاڵ بوونە ماڵی زۆر دەبێ‌و ناودار دەبێ لەگەڵ ژنی تێکەوتوو (حیض) ی خراپە ـ کردن لەگەڵ ژنی مردوو . خراپەیە کە تا لەگەڵ خێزانی وی نزیك بێتەوەو هاوسـەریان لێ بێنێ . کەژنە کە زیندوو بێ : لەخـزمانی وی جووێ دەبێتەوە .

سەرداو ( ژێرخان یائەنباری ئاو ) کەپڕ بێ : شانازی دەمە کی (وقتی)یە ـی بەتاڵ : بەد بەختی و نەگبەتی یـە . لەـ کەوتن : بقەی مـەرگ و لەناو چوونە . خۆلە ـ دەرهێنان : کاروبار بەپێی دڵخـوازدەبێ .
سەر دەرگاه ( ئاستانەی سەرەوە ) خراپ بێ یابکەوێ : خاوەنـد ماڵ دەمرێ یاکارەساتێکی خرابی بەسەر دێ .

سەر کەوتن . ابن سیرین دەڵێ : کەببینێ سەر کەوتە سەر کێو یا سەربان و لیتر لەسەری دانیشت : بەئاوات دەگاو مـرازی پێـك دێ کە بەڕەنج سەر کەوێ : بەدژواری بەئاوات دەگات . بەنەردیوان(پەیژە) سەر کەوتن:

پایەو قەدرە بەومەرجە کەپلیکانە کە لەگلّ بیّ بەلاّن کەلەگیّچو بەردی بیّ : گەورەیی و ئابڕووە . کەسەر کەویّتە سەر ئلسمانیّو نەکەڕیّتەوە ئاکام (أجل)ی نزیکە بەلاّن کەبکەڕیّتەوە : نەخۆشی‌یەکی سەخت دەگری و چاك دەبیّتەوە .

سەرما . ابن سیرین دەلّیّ ؛ سەرما لەخەوندا : ڕەنج و زیانە . کەبینیّ سەرمایەتی : تووشی دەرویّشی دیّ و دەستی کورت دەبیّ . کەسەرما زیان بەلەشی وی بگەیێنی . لەخزمانی‌یاوە ڕەنج و زیانی پیّ دەگات . کە امشی وی ووشك بکا : زوو خۆی یا یەکیّك لەخزمەکانی دەمریّ .

سەرۆکی ئاینی : ئاشتی و ڕیّزە . مرۆ کەخۆی بە بینیّ : فیزو هەوایە .

سەرویّ . ابن سیرین دەلّیّ ؛ ـی مەڕ خواردن : بەهرەی دەست دەکەویّ . کەسەرویّی ڕەشەوولاّخی بخووات : لەو سالّی دا بەپیتو پیرۆزی و گوشادی و بەهرە دەگات . جابری مغربی دەلّیّ ؛ خواردنی سەرویّ : نیشانەی مالّی هەتیوان خواردنە بەتایبەتی کەبەخاوی بیخووات .

سەرووی کیّوی (دارە سەرو) کەبینیّ ـیّکی هەیە لەگەلّ پیاویّکی خانەدان دەبیّتە برادەر . دیتنی ـ نیشانەی پیاویّکی‌یە کە کەمتر خیّری بکات

سەقر : بڕوانە ( چەرخ ) .

سەگ . زات بڕ ( جورئەت ) . ئەمەگداری و پایەداری‌یە لەژیان دا .
کە بوەڕیّ : پاش ملەو ووتەی خراپەو خراپ دروانە . کە ـ ڕقی هەلّستابیّ : پیّویستە لەدوژمنیّکی بترسیّ . کەسیّکی ـی خۆی بکوژیّ وەلاّمی مەرگەو ڕووداویّکی شوومە . ابن‌سیرین دەلّیّ ؛ ـ لەخەوندا دوژمنی نزم و سووکە بەلاّن میهرەبانە . سەگی میّ یەنە ژنیّکی

بەو چەشنەیە . ـی ڕەش : دوژمنێکی ڕەشە لەنەتەوەیەکی ڕەش . هی سپی دوژمنێکە لەنەتەوەیەکی سپی . کەسەگ بەوی بوەڕێ : ووتەی ڕەقی لەدوژمنان گووێ لێ دەبێت . کەـ بیگەزێ : زیانی لەلایـەن دوژمنەوەبێ دەگات . کەجلو بەرگی لەئاوی زاری ـی بەوەبچێ : بە دووانی دوژمنانەوەماندو ونەخۆشدەبێ . کەسەگ‌بەرگی‌وی‌بدڕێنێ : زیان بەماڵی وی دەگات . کەگۆشتی سەگی بخووات : لەشەڕی دوژـ منێکی ڕزگار دەبێ . کەنانی بدات بەسەگی : ڕۆزی ڕووی تێدەکات کەبینێ ـێك خۆی لێ نزیك دەکاتەوە : دوژمنێك قرم (طمع) ی لێ خۆش دەکا . کەسەگێك پاڵی پێوە بدا : بەدوژمنێکی نزم دڵ قایم دەبێ وپشتی پێ دەسپێرێ . کەشیری سەگی بخووات : ترس و سامێکی پێ دەگات . کەبینێ ـ ێك لە دەستی وی هەڵبێ : دوژمن لە پارێز دایە و خۆی لەوی دەپارێزێ . کرمانی دەڵێ کەدێلە سەگێك بێتە ناوماڵی‌بەوە ژنێکی سووك دێنێ . اسـماعیلی اشعث دەڵێ : سـەگی ڕاوێ : دوژمنی ئاشکرایە . کە ببینێ بەسەگی ڕاوێ ؛ ڕاوێ دەکا : لە دوژمنێکی کـە داوای زانست وهۆش دەکات خێری پێدەگـات کـە ببینێ گـۆشتی سـەگی شکاری دەخووارد : میراتی دەست دەکەوێ .

---

ئەوانەی کە لەبارەی سەگەوە نووسراون کەم و زۆر باوەڕیم پێیان نیە کە لەڕووی مرۆڤایەتی‌یەوە تەماشای خوو وڕەفتاری وی بـکرێ هیچ گیان لەبەرێك بەقەدەر نیوەی ویش ئەمەگدار و دڵسۆز وڕاستی‌وماف بەرست نیە ، ئایا کامە مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی بەدرێژایی ڕۆژگار لەکانی کێشك دا دەتوانی بەقەدەر دەیەکی وی ئەمەگـدارێتی بنوێنێ ؟ ئایا لە وورتکە نان و ئێسکی ڕەق و ڕووت چی‌تر بـە سەگی بێچارە دەدرێت ؟ گ . م

سەلە : بڕوانـە خووانچە

سەلکە تەشی : کرمانی دەڵێ کەسێکی ـ دەست کەوێ یـایە کێك بیداتێ : کارە کەر یا کەنیزە کێکی پەیدا دەکات . هەر ژنێکی لـە خـەونی دا ـ یە کەی لە کلکی تەشیە کەی بکەوێ : مێژدە کەی بەرەلاَی دەکات .

سەما کردن . بـڕوانە هەڵپەڕین .

سەنیر (سەرین ، بالیف) : ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەوندا نۆ کەرە کەسێکی لەخەونیدا ـی هەبێ یا کەسێکی تر بەوی بدات کە ڕەنگی سەوز بێ نۆ کەرێکی لەخوا ترس وپارێز گاری دەستدە کەوێ ؛ بەلاَن کە ـە کە کۆنو چلکن وزەرد و ڕەش بێ : واتایە کەی بەپێچەوانەیە کە سەنیر لەماڵی ویدا بەزرێ یابسووتێ ؛ یە کێك بەدەوری ژنە کەی وی یا کەـ نیزە کە کەی وی هەڵدێت کە لەخشتەی بەرێ . هێندێکیش دەڵێن دیتنی ـ لەماڵیدا : نیشانەیوەیە کە یە کێك لەماڵی واندا دەمرێ کەپیاوێك ببینێ ـێکی زۆری دەست کەوت : هێندەی وان نۆ کەر و کـەنیزە کی دەستدە کەوێت . کە ئاگر ـە کانی بسووتێنێ نۆ کەر و کارە کەرە کانی دەڕۆن یـا هـەڵـدێن

سەوزە : ابن سیرین دەڵێ کە لەخەونیدا ببینێ ـی هەیە. ناوی ویبە خـێرو چاکە بلاَو دەبێتەوە ، ئەگەر ببینێ کە لە زەوی ویدا ـابی هەیە کە لە کاتی خۆیدا بێ خێرو سوودە ، کەبە پێچەوانە بێ : زیانە . ابن سیرین دەڵێ سەوزە لەخەوندا ئاییندە بـەتایبەتی کـە لە کاتی خۆیـدا بێـت . کە لە زەوی خۆیدا گیـا و دار و بـاری وای لێ بێ و نەزانێ چـێن

ئایینداری و پارێزگاری‌یە ، کەیان ناسێ ڕۆزی زۆردەبێ . کە میوەی تاڵ و نەناسراوبێ : جوایەزە . بەڵان کەیان ناسێ وخۆشبێ : ڕۆزێکی فراوانە . کەلە ناو شیناوەردێکی دا دانیشتبێ : لەئایینی خۆی‌دا پایەدار دەبێ . کەمردووی لەناو شینایی دا ببینێ : نیشانەی چاکی بارو ئەنجامی کاری وی‌یە . سەوزایی هەر چەندە سەوز و ئاودار بێ : سوودی پترە ؛ هی زەرد وسیس بە پێچەوانەیە .

سەوزی ؛ بڕوانە شیناوەردی

سەهۆڵ : ابن سیرین دەڵێ : ـ لەخەوندا خەمو خەفەتە . کە لە هاویندا ـی کۆبکاتەوە : ماڵی کۆ دەکاتەوە . کە لەزستانی‌دا بی‌بینێ ژیان‌وخۆشی‌یە

سەیوان و هەر چتێکی کە سێبەری بکات : ناوبانگی دڕۆزنانە و بەخۆوە بەستراوە . ابن سیرین دەڵێ - لەخەوندا پادشای گێلە کەببینێ لە ژێر سەیوانێ‌دا دانیشتووە : خزمەتی پادشایەکی ئاوا دەکات . کەـی بەسەردا بکەوێ وئازاری بدات : پادشا ڕقی‌لی‌ی هەڵدەستێ وزیانی‌پێ‌دەگەیەنێ جابردەڵێ کەـی‌وی خوری یاجاو و سەوزو یا-پێ‌بێ : خزمەتی‌پادشای- دادگەر دەکات ؛ هـی پێچەوانە پێچەوانەیە .

سبەینێ ابن مستوفی دەڵێ : کەببینێ بەیانی بەسەردا هات وڕووناك بوو خەڵکی ئەو وولاتێ ئەمین‌دەبن . کەببینێ دووای ڕووناکی تاریك‌بوو بەپێچەوانەیە . کەببێتە بەیانی ورەنگی سووربێ : لە وولاتی‌دا خوێن ڕێژی زۆر دەبێ . هی زەرد : نەخۆشی‌یە .

سێی : مزگێنی خۆش . کەسێکی بەرگی سێی پۆشی بێ : دووا ڕۆژێکی خۆش و پیرۆزە . ( نانی سێی ) : بەهرە و سوودە . بەرگی سێی : هەستی خاوێن و پاکە داوێنی سێی : سەلیقە و ذەوقی باشە . گای‌سپی : شانازی و کارو باری گەورەیە ، بازرگانی بایەخدار و ڕەونەقدارە .

سپیاو . کرمانی دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەون دا ؛ خەم و نیگەرانی‌یە .
هێندێکیش دەڵێن گفت و گۆیە . کەبینێ ـ ی هەیە یا یەکێک داویە
بەوی ؛ لەگەڵ یەکیکی وتوو وێژێ دەکاتو هەمیشەش خەمگین دەبێ
کە ـ ی بەڕووی خۆیەوە ببینێ ؛ شڕەوبڕەی دەست دەکەوێ . جابر
دەڵێ کە ـ ی هەبێ و بیەوێ لەڕووی خۆی بدا ؛ خەمە .
سپێدە ؛ مزگێنی‌یە بۆ ژیانێکی تازە ، دڵدارێتییێکی گەورە و سبەینەیێکی
پڕ پیتە .
سپڵ . ابن سیرین دەڵێ ؛ لەخەوندا ـ دیتن ؛ ماڵو شادمانی‌یە . کەبینێ ـ ی
ئێستری‌هەیە ؛ لەلایەن پیاوێکی گەورەوەماڵو سامانێکی زۆری‌دەست
دەکەوێ . کەبینێ ـ ی گای هەیە ؛ لەوساڵی دا ماڵی دەست دەکەوێ
کەبینێ ـ ی مەڕی هەیە ؛ لەپیاوێکی گەورەی ماڵ دەست دەکەوێ‌و
یا لەیەکێکی ناسراو و ئاوارە . کەسپڵی جانەوەرانی هەبێ ؛ هەندەی
وی ماڵ لەئەرزی دەست دەکەوێ و کەیفی خۆش دەبێ . ـ ی جانەوە.
رانی دڕندە ؛ ماڵی نارەوایەو هی بێ ئازار ؛ ماڵی ڕەوایە .
سرکە ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ماڵی‌ڕەوایە یابیت وبێزە وخواردنیشی
باشە . هێندێکیش لەخەون لێکدەرەوان دەڵێن ـ ی‌ترش ؛ خەمو خەفەتە
ـ فرۆش ؛ پیاوێکی شەڕفرۆش ونا کۆکی بەرست ودوژمنایەتی‌خوازە
سروود ؛ ابن سیرن دەڵێ ـ گوتن لەخەوندا ؛ پووچە . کەبینێ لەخەونی‌دا
ـ ی دەڵێ خەمو خەفەتی بێ دەگا . کە ـ ی لە گەڵ موسیقا بڵێ ؛ کێشە و
ڕووشەیە . کەئەو گوێ بداتە دەنگی سروودی یەکێکی تر ؛ ئاخافتنی
درۆی گوێ لێ دەبێ . کرمانی دەڵێ ـ بۆ گەوران ڕیسوایی و بۆ
دەروێشانیش ؛ خەم و خەفەتە .
سزا ؛ ( جزاء ) ـ وەرگرتن ؛ ئاشتی و تەبایی‌یە لەگەڵ دۆست
( ـ دان ) سووچ و تاوانێکە دەبێ پەیی بکەی و تۆڵەی بکەیەوە ،

سفره . ابن سیرین دەلێ ؛ کە-ی تازەی هەبێ و پاییکرێ : کەنیزە کێکی ناحەزە . کە-ی پڕ نان‌و چێشت ببینێ‌و لێی بخووا ، لە کەنیزە کە کەی سوودی دەست دە کەوێ . کرمانی دەلێ - لەخەوندا ؛ سەفەرێکی پڕ سوودە . کە- گچکەو بەتاڵ بێ ؛ سوودی کەمترە . کە-ە کەی بسووتێ یالەناو بچێ ، کەنیزە کە کەی دەمرێ یازیانی بێ دە گات . کرمانی دەلێ ـ لەپێش نانخواردن‌دا هەلگرتن ؛ نەخۆشی و بێ کاری‌یە . جابر دەلێ ـ لەخەوندا ، چا کەو هێزە . کەلەپێش نانخواردن ـ هەلگرتن ، خەم‌و خەفەت دەڕوات . ابن سیرین دەلێ ؛ کە-ی تازەی هەبێ ، ماڵ‌و بەهرەی دەست دە کەوێ و کەنیزە کێکی جووان دە کرێ . کەسفره چلکن بێ کەنیزە کە کەی ناشیرین دەبێ . کەسفرەی پڕ لەنـان و چێشت ببینێ لە کەنیزە کە کەی سوودی دەست دە کەوێ .

سفر کردن : بڕوانە ( ڕاڕەوی ) .

سکە لێدان . ابن سیرین دەلێ - لێدان لەخەوندا پیاوێکە کەقسەی خۆی دەڕازێنێتەوە و بەشانازی‌یەوە دەیگێڕێتەوە . کە ببینێ -ی لێ دەدا : چەند ئاخەفتنێکی بێ بنچینە دەڕازێنێتەوەو ناسك‌و شیرینی دە کا . کە-ی خراپ لێ بدات ، قسەی ناخۆش دە کات .

سلام : بڕوانە ( ڕۆژ باشی ) .

سم . ابن سیرین دەلێ ؛ - لەخەوندا دیتن ، منداڵە . کە ببینێ -ی هەڵگرتوە یایە کێك‌داوی‌یەوی ، منداڵێکی‌دەبێ . کە(سم )ی‌هەبێ‌و لێی‌بزر بێ : منداڵی وون دەبێ‌و یادەمرێ . . کرمانی دەلێ -ی ئەسپ یاسمی کەرێ لەخەوندا ماڵە . کەلە-انە هەلگری یایە کێك بەوی بدات ، ماڵی دەست دە کەوێ . کەیە کێك پێی خۆی وە کوو-سمی ئەسپی یا کەرێ ببینێ :

تەمەنی بەخۆشی ڕادەبووێرێ . هێندێکیش دەڵێن ؛ کەمێکی ماڵ دەست
دەکەوێ . کەبیینێ ـی کەوت ؛ بەپێچەوانەیە .

سماق . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا ؛ شەڕو دوژمنایەتی یە . کەـی
بخوات ؛ لەگەڵ یەکێکی وتوو ویژی لێ پەیدا دەبێ . لەخواردنی
ـ دا لەهیچ لایەێکەوە سوودی تێدا نیە .

سمۆرە . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ؛ پیاوێکی ڕێکروزۆردارو لارێیە
کەلەگەل ـی شەڕی بکات ؛ لەگەل پیاوان دوژمنایەتی لێ ڕوو دەدا
کەگۆشتی ـی بخوات ؛ ماڵی بێ ئاین و زۆردارێکی دەخوات .
کرمانی دەڵێ ؛ ـ لە خەوندا ؛ پیاوێکی ئاوارەو دەولەمەندە . موو و
پێستی سمۆرە ؛ ماڵێو داخووازە . گۆشتی ـ ؛ ماڵی ئاوارەیێکی یە .
کەبیینێ ـی کوژت و گۆشتەکەی وی بەسەر زەویدا فرێدا ؛ ماڵی
ئاوارەیێکی لەناو دەبات .

سمێڵ . دیتنی ـ سامی پیاوانە . کەکەسێك بەمقەستی بەر سمێلی وی بکاو
جووانی کا ؛ سوودو باشەو زیانی پێ ناگات . لەکاتی بەر ـ کردنێ دا
بیتراشێ یاڕووی بربندار کات ؛ لەسامی پیلو کەم دەکاتەوە . درێژی ـ
هێزو توانایە . کەکەسێك سمێلی وی هەڵکەنێ ؛ لەگەڵ یەکێکی
دوژمنایەتی لێ پەیدا دەبێ . کەسمێلی سپی بێ ؛ لەو کارەی بەدەستی
بەوەیە ڕادەوەستێ . کەبیینێ ـی درێژی هەیە ؛ خەمو خەفەتە . کەـی
کورت بێ ؛ خەمو خەفەتی پێ دەگات .

سنجوو . ابن سیرین دەڵێ سنجوو لەخەوندا ماڵێکی باشی وایە کەبەڕەنج
دەستدە کەوێ . کە سنجووی هەبێ یایە کێك پیداتێ ؛ ماڵی ڕەوای
دەست دەکەوێ . کە ـ ی بخوات ؛ ماڵی بەسەر خێزانیدا دەبەشێتەوە

سندان (هی ئاسنگەران) ابن‌سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : سەرۆکێو گەورەیە کەبیبنێ ـی هەیە پایە کێك داویە بەوێ‌و زانی کەهی خۆیەتی : سوودی لەلایەن گەورەیێکی‌یەوە دەست دە کەوێ‌و لە گەڵ وی دەبێتە دۆست و یادەبێتە نۆ کەری پادشای‌و خێری لێ دەبینێ . کرمانی دەڵێ سندان لە خەوندا : گەورەی راست کـردارە کەـە کەی لێ وون بوو بێ یا دز بردبێتی : لەو پیاوە گەورەیە دوور دە کەوێتەوە .

سندوق : رەونەق و بایەخی‌یە ـی بەتاڵ . هەژاری و بەد بەختی‌یە . دیتنی ـ لە خەوندا : جێگا و پایە و پلەیە هێندێکیش دەڵێن ژنە . کـەبینێ ـێکی تازەی هەیە : نیشانەی وەیە کە پایە وە یا ژنی دەست دە کەوێ . جابر دەڵێ کە ـی تازە و خاوێنی هەبێ : ژنێکی جووان و ئایندار دەخوازێ . کە سندوقە کە کۆن بێ : بە پێچەوانەیە .

سوواری ابن سیرین دەڵێ کەبینێ لە خەونی‌دا سوواری دە کرد : لەپادشاوە ماڵ و بەهرەی دەست دە کەوێ . کە بینێ لە گەڵ سواران دە گەڕا و سووارەکان گووێ لە مشتی وی بوون : بە سەر دەسنەیـەکی دەبێتـە فەرمان ڕەوا کە بینێ سـە واران لە شوێنێکی دا سوواری یان دە کرد لەو شوێنی دا بارانێکی سەخت ڕوو دەدات . کە سووارێکی نەناسراو چێکی بداتە وی : لەئاوارەیێکی‌یەوە چێکی دەستدە کەوێ کەسوارە کە ناسراو بێ : لە دۆست و ئاشنایان سوودی دەست دە کـەوی

سوواری ئـەسپی لاواز بـە پێچەوانەیـە

سووالٚ : بڕوانە ( دەرۆزە ) .

سوء الهـاضمة : بڕوانـە ( کەندی هەبڕوون ) .

سوپاس ـ کردن لە خەوندا : نیشانەی دۆستایەتی و سامان دەست خستنە .

سووتان : دوژمنانی سەختە کە توانای خۆ لێ پاراستنیان نیە

سووتاندن ( ـی دۆشەک ) : بەکیەتیکی بە ختەومراتە و پێك شادبوونە
ـی ماڵ و خانوو : ڕەونەق و ئاوەدانی و ئاشتییە .

سوور لە خەوندا ڕەنگی سوور : خەم و ڕەنج و نیگەرانییە بەڵان بۆ
ژنان : خێر و شادمانییە . کە دەرپێ و کراس و کڵاو و کەوا و جبە و
مەندیلی تەواو سوور ببینێ : حەز لە خوێنڕێژی و کێشە و ڕووشەی
دەکات و بێدادی لەگەڵ مەردومان دەکات .

سوورێژە دیتنی ـ پتری ماڵ وسامانە . کەببینێ لەسەر لەشی وی ـ سەری
هەڵداوە : ماڵی ڕەوای بەڕەنج وسەختی دەستدە کەوێ . کەببینێ لەسەر
لەشی وی ـی سوور و ڕەوشەنە : ماڵی ناڕەوای دەست دە کەوێ .

سوورین ( ڕانو کەفەڵ ) ابن سیرین دەڵێ ـی ڕاست : کوڕە هی چەپ : کچە
کەببینێ ـی قایم ویتەوە : منداڵی ساخی دەبێ . کە ـی کچکە وبێ تین
بێ : بەپێچەوانەیە . کرمانی دەڵێ کە ـی بشکێ : منداڵی دەمرێ .

سووژن ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : پیلوێکە کار وباری خەلکی ڕێك دەخا
بەتایبەتی وورده کار . کەببینێ ـی هەیە یا کەسێك بەوی داوە : برادەرا-
یەتی لە گەڵ ئەو جۆرە کەسە بۆ ڕێك دە کەوێ کە لێی دووابن . کە
ـی لێ بشکێ یا لێی گوم بێ : دەمرێ .

سووسەمار ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـ ئەوی گەزت : زیانی پێ دە کات . کە
ـی بکوژێ : بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . لە لای کرمانی خواردنی
گۆشتی ـ : سوودی تێدایە . کە ـ لە ماڵی ویدا دەنگی بێ : لە وێ دا
شیوەن پەیدا دەبێ .

سووسەمەر ـ لە خەوندا دیتن نیشانەی ئەوەیە کە ناوی بە خێر و چاکە
بڵاو دەبێتەوە .

سوولاوك : بڕوانه ( پلووسـك ) .

سووێسنه ( گوڵ ) ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ كه لێ نه كراپێتەوه و له كاتی خۆیدا بێ : چتێكی پێ دەكات ومنداڵێكی دەبێ . هی بێ كاتیش : خەم و خەفەته . كه ژنێك ببینێ گوڵی ـی لێ كردۆتەوه وداویه بەمێردەكەی بەرەڵا ( تەڵاق ) دەكرێ . كه دەسكه ـ ی بفرێنێ : له نێوانی وانـدا ووتووێژی خێرێ ڕوو دەدات . جابر دەڵێ گوڵه ـ : كەنیزەكێكی بەد خوو و بەد كرداره . كه ـ بدرێ به نۆكەر : نۆكەر هەڵدێ .

سووێنه : بڕوانه ( تەبەك ) .

سووێند ابن سیرین دەڵێ كەببینێ ـی خواردووه بەڕاستی : كاروباری باش له دەست وی‌دێ یا ئەسپاردەیێكی بەخاوەنی دەداتەوه یاشاهیدی ڕاست دەدات ویا خێرێ دەكات وله هەر چتێكی بترسێ ئەمین دەبێ . ـی درۆ خواردن : چونكو خودا پێی ناخۆشه خێر و خۆشی هەردوو گیتی له كِس دەچێ . پێویسته پەشیمان بێتەوه

سێبەر ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا گەورەیی وسامانه . سێبەری پادشا : پادشایه ـی دیوار پیاوێكی گەورەیـه و بـه سوودە كـه لـه ژێر سێبەری دا دەحاوێتەوه ـی داران : ئاسوودەیی و هاسانییه له پەنای پیاوان دا . كه له ژێر ـی داری درِكاوی یا داری بێ بەر دابێ نیشـانەی پیاوی درۆزمـان و بێ باك و دوو ئایینه و ئاكام ( مەرگ ) پشی نزیكه

سێبەلاك ( ـی ) دیتنی ـ : شادمانیه . كـه ببینێ ـ ی زۆره : شـادمانی بـه كه ـ ی بـدات به كەسێكی : ئاسوودەیی پێ دەگـەیێنێ كـه بـه كاڵی یا به برژاوی بیخوات : ماڵی دەست دەكەوێ

سێداره كەبه فەرمانی پادشا یه كێك‌له بدرێ وخەڵكیش تەماشای بكەن : شادی‌وشكۆ وپایەیه . كەدەستەیەك خەڵك ئەوی هەڵاوەسن : بەسەربانیدا

دەیێتە سەرزۆك . کەلەسێدارە بدرێت و پەتە کە بپسێ : لەپایەو رێـزو شکۆ دە کەوێت . لە- دران : گەورەییـە . کە گۆشت بەسێدارە دا کرابێ‌و لێی بخووات : مالی زۆرداریکی دەخووات . کەیە کێك لـە دار درابێ‌و خووێنی لەبەر بڕوات لەباش ملەی خەلکی زۆردەدوی و گوناهیش دە کات .

سیر ابن سیرین دەلێ خواردنی ـ . مالی نارەوایە . کرمانی‌دەلێ‌خواردنی ـ : وەلامی‌ناخۆشە وخەم ورەنج و گریانە . کەـی کولاو بخوات :لە ووتەی ناخۆش پەشیمان دەبێ . جابردەلێ ـ لەخەوندا : رەنج و گریانە سیرەت (چوو) کە کێم و دوای لە ـی یێتە دەرێ و باش نیە . کە مەی‌لەـی یێتە دەرێ : مالی دەستدە کەوێ و بەتاوات دە گات . کەخووێنی لێ بێ : لە گەل ژنیکی دەست تێکەلاو دە کات کەلە کاتی بێ‌نوویژی دابێ . کە ئاگری لێ یێتە دەرێ ونیوەی بۆلای ڕۆژەلات ونیوە کەی تریشی بۆ لای رۆژاوا بچێ کورێکی دەبێ و دەیێتە پاشای هەموولایە کی کە پشکەلی لێ یێتە دەرێ : ئارەزووی لۆتێتی دە کات . کە بینێ ـ ی وی بەرزبوتەوەو بەهێزە : بەختو هێزی وی بەهێزدەبن . کەبینێ ـی‌وی دریژ ورەق بووە : مندالی زۆردەبێ کەلە دەور وبەری ـی وی بەرە رووابێ : ناوی لەو وولاتە دا بەناوبانگ دەبێ وبەپایە دە گا . کەبینێ ـی خۆی لە زاری کەـسیکی ناوە و ئەو دەیمژێ : لەوەوە سوود بـەو کەسیدە گات . کەمووی‌لەـی رووابێ : لەلایەن‌مندالەوە شادماندەبێ جابر دەلێ کەـی لەوی جوێ یێتەوە : مندالی دەمرێ یا مالی لە نـا و دەچێ . جوولانی ـ لەخەوندا : نیشانەی هێز و گوشادی و بەهرەوـسوودە کەـی بقەلەشێ وخووێنی لێ‌بێ : زیانی مالێ ومـردنی مـندالـە . کـە ـ ی‌هـەلاسـابێ : مـالی بتر دەبێ . کـە بینێ‌لەـیان دا : نیشانەی ناخـۆشی ژیـانی وی یـە . کـە بینێ ـ ی خـۆی لـە پـشتی

خۆی بەستووە . ئاگادارێکی کەلەلایەتی نایدات . کەژنێکی ئاووس
ببینێ سیرەتی هەیە . کورێکی دەبێ و دەمرێ بەڵام کەزگی ئەبێ ئاووس
دەبێ . کەبیینێ ـی وی باریك بووە . هەر ئەو واتایەی هەیە . کەبیینێ
لەـی وی ئەختێکی لێ براوە . منداڵی دەمرێ یالەماڵێ پایەدا کز دەبێ
کەلەکونی سیرەتی وی‌دا مرواری یا گەوهەرێك بێتە دەرێ . منداڵێکی
زاناو پارێزگاری دەبێ کەـی خۆی بەبراوی ببینێ یایەکێك ببرێ.
منداڵی نابێ .

سێزوو ( رەشۆلە ) ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا . پیاوێکی نیاتەکار
(مکار ) ە کەزۆر کۆچان دەکا . کەـی بگرێ یایەکێك بیداتێ . لەگەڵ
پیاوێکی کۆچکار (مسافر) برادەرایەتی پەیدا دەکات . کەگۆشتیـی
بخوات سوودە . جابر دەڵێ دیتنی ـ : کابرایەکی گاور و درۆزنە .
سیسارگە کەچەڵە . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی هەیە . لەپادشاوە شان و
شکۆی پێدەگات . ئێسك و گۆشتیشی هەر ئەو واتایەی هەیە .

سێلاو . ابن سیرین دەڵێ ؛ ـ لەخەوندا : دوژمنێکی گەورەیە یاپادشایەکی
بێ دادە . کەبتوانێ خۆی لەـێ رزگار بکا ، بەسەر دوژمنی دا زاڵ
دەبێ و خەم و خەفەتی وی کەم دەکات . کرمانی دەڵێ سێلاو لەووڵاتی
کوویستانی‌دا ، خەم و خەفەتە . کەلەخاکێکی گەرمەسێردابێ سوودە
کەلافاو ووڵاتی داگرێ : ئەو ووڵاتە تووشی کێشەو ڕوو ۹ دێت
هێندێکیش دەڵێن کەببینێ ـ جێگایەکی کاول دەکت : دانیشتووانی
ئەو ووڵاتی ترس و سامیان لەپادشاوە پێ دەگات .

سیمورخ ، دیتنی ـ لەخەوندا : پیاوێکی خۆش خووە کەـە کە مێ بێ :
ژنێکی جوانە . کەـ ئەوی هەڵگری و ببیانە هەوا : لەگەڵ گەورەیێکی
کۆچ دەکات . کەـ لەگەڵ وی بدووێ : دەبێتە وەزیری پادشا .

کە بیینێ سیمورغ لەگەڵ وی شەڕێ دەکات : لە گەڵ پیاوێکی گەورە دوژمنایەتی بۆ پەیدا دەبێ . کە گۆشتی سیمورغ بخوات : هێندەی وی ماڵی گەورەیێکی دەستدە کەوێ . کرمانی دەڵێ کە سیمورغ بکوژێ پەردەی بنی کچێکی دەدڕێنێ . کە ـ لە دەستی وی بفڕێ : ژنەکەی بەڕەڵا دەکات . کەپێچوی سیمورغی بگرێ : منداڵێکی گێل و گەوجی دەبێ . جابر دەڵێ سیمورغ : پادشایە . کە ـ لە کووچە بنیشێ و بێ کووژن : پادشای ئەو شوێنێ لە ناو دەچێ

سینگ ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ ـی وی ئاوەڵە و گوشاد بووە : کار و باری ڕاست دەبێ . کەـی تەنگ بوبێ . بە پێچەوانەیە . کەبیینێ لەسەر سینگی وی خەتێکی سەوز نوسراوە : خودا چاکەی لە گەڵ دەکات ، ابراهیم دەڵێ کە بیینێ لە سەر سینگی موو ڕوواوە : قەرز دار دەبێ ، کە بیینێ مووی سینگی خۆی دەتاشێ : قەرزان دەداتەوە .

سێو ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : خەم و نیگەرانیە ، خواردنیشی کەم و کرڕی وزیانە یا کارێکی دەکا لێی پەشیمان دەبێتەوە کەـ سەوزبێ : منداڵە . کەـ سوور بێ : سوودە لەلایەن پادشاوە . کەـ سپی بێ سوودە لەلایەن بازرگانێکییەوە . کەـ زەردو ترش بێ : ڕەنجوو نەخۆشییە . کەـ سپیەکەی لەت کات : هاو کارێکی لە گەڵ یە کەلە هەیە لێی جوێ دەبێتەوە . ـی شیرین : وەڵامی خۆشە . دانیال دەڵێ کە بیینێ ـی هەیەو دەیخوات : سوودە . کە پادشایەک ـی بیینێ وولاتێکی تریشی دەست دەکەوێ

شابەڕوو : کەلەخەونیدا ببینێ ـ هەیە : سوونی لەلایەن گەورەیێکییەوە پێدەگات کە ـی بخوات : تووشی خەم وخەفەتان دێت .

شاخ ( قۆچ ) : ابن سیرین دەڵێ شاخ لەخەوندا دیتنی باشە . کەببینێ ـ هەیە سوود و گەورەیی دەستدەکەوێ . کەببینێ ـی مانگای هەیە :ماڵێکی تەواوی دەستدەکەوێ هەتاشاخەکە گەورەتربێ : سوودی پتردەبێ . کرمانی دەڵێ کەلەسەری خۆیدا شاخی ببینێ : هێزە . کە لەسەر سەری خۆی چەندین شاخان ببینێ وە کومەڕو کایان : کاروباری ڕوو لە باشی دەکاتو تەمەنی خۆشی لەنەخۆشیدا رادەبووێرێ . کەببینێ بەوشاخانە لەخەڵکی دەدا : زیانیان پێدەگەیەنێ . صادق دەڵێ دیتنی شاخی چووار ـ پێیانی کێوی : خێر و سوودە .

شادی ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا . خەم وخەفەتە . کەبەهۆی کەسێکییەوە شادمان بێ : هەر بەهۆی وییەوە خەمگیندەبێ . کەمردووی لەشادمانی دا ببینێ باری باش و بەختەوەر دەبێ . کە لەخەونیدا ببینێ کە بەبێ هۆ شاد بووە دەمرێ

شار ابن سیرین دەڵێ کەببینێ چوەشارێکی : لەبیروباوەڕی ئاینیدا بەهێز دەبێو بە ئاواتیشردەگات . کەببینێ لەناو ـی چووە دەرەوەو یادەریان کرد ; بە پێچەوانەیە . کە لە شارێکەوە بچێتە شارێکی تر : ژنە کەی بەرەڵا دەکات ومێردێکی تر دەکاتەوە . کەلە شارێکی گەرمێنیدا بەفر و سەهۆڵی ببینێ : لەو شارەدا تەنگانە پەیدادەبێ بەڵان کەلە شارێکی کوێستانیدا بەفروسەهۆڵی ببینێ : نیشانەی هەرزانی وزۆری ڕۆزییە کەلەدێیە کەوەبچێتە شارێکی : سودە . کەلەشارێکەوەبچێتە گوندێکی

بەئاوات ناگات. جابر دەڵێ : کەخۆی لەووڵاتی هیندیان ببینێ : کارو باری خراپ دەبێ .

شارو دێهاتان : کەلە خەونیدا ببینێ چووە ـ : ئایینی بەهێزدەبێ و ئەنجامی خێر دەبێ . کەچووە ـ یێکی بەئارامی دانیشت : دەچێتە لای پادشا و خێری لێ دەبینێ .

شاگردی : کەخۆی بە ـ ببینێ : کار وبارێکی پڕ سوودی دەست دە کەوێ

شان : ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ : نیشانەی هێمنی وشان وشکۆی مرۆڤانە . کەبینێ ـی وی ساغ وبەهێزە : نیشانەی پتری ماڵ و شان و شکۆ و جووانی یە کەبینێ ـی بێتین و شکستە : بە پێچەوانەیە : ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـی وی بەهێز وساخە : ئەسپاردەیێکی لەگەردنی دایە وبەجێی دێنی ومالیشی لەشوێنێکی وا دەستدە کەوێ کە جێگای ئومێدی نەبێ کەسست وبێتین بێ : ئەو ئەسپاردەیەی لەملی‌یەتی نایداتەوە . دەشڵێن کەتوو کی بە ـیەوە ببینێ لەشووێنێکی نەناسراو سوود دەبینێ .

شانە ابن سیرین دەڵێ : خزم و کەس‌و کارە . کەبینێ سەرورِیشی ـ دە کرد : لەخەم رِز گاردەبێ وقەرزیشی بۆدەدرێتەوە وبەئاوات دە گات . کرمانی دەڵێ : ـ لەخەوندا برادەرانی سازگارن لەکاروباری خێرێ دا .
ـ کردنی موو بە ئاوات گەیشتنە .

شاهەنشا ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ ـ هاتە ناو سەرا یامز گەوت یاناوشار یا دێ‌یەکی : نیشانەی وەیە کەتووشی رِەنج و کارەساتێکی وی‌دێ .
کە ببینێ لە شەرِی شاهەنشای دا زاڵ بوو : بە ئاواتی دە گات کـە ـ دەستی راستی ببرِێ سووێند دەدرێ . کەببینێ ـ لە تەختی بکەوێ یا تەختە کەی بشکێ یا ئەسپ لەقەی لێ بدا یا شیرە کەی شکا یاگایەك بە شاخی لێی بدا و بربنداوی کرد : لە شاهەنشاهێتی دە کەوێ .

ئەگەر ـ دادگەر بێ : نیشانەی ئابڕوو و گەورەیی وی‌یە . کەبیینێ ـ
ئەرشێکی گەورەی ڕاخست : ملك و سامانی زۆر و تەمەنیشی درێژ
دەبێ . جابر دەڵێ ؛ کە ـ کاروباری خۆی باش ببینێ : تەمەن و پایەی
پتر دەبێ . کە ـ مردووی بەڕووخۆشی ببینێو بەخۆشی لەگەڵی بدوێ
کاروباری باش دەبێو کاروباری مردووەکەش زیندوو دەبێتەوە .
شاهێن . ابن سیرین دەڵێ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا : نیشانەی ئەوەیە کەلەپادشای
زۆردار گەورەیی دەست دەکەوێ . کە ـ ڕامی وی بێ : منداڵی دەبێ .
شەترنج : کێشەو پیلەو شەڕو درۆیە . ـ کردن : ساختەچیەتی‌و فێڵو کات
دۆڕاندنە . کەبە ـ لەیەکێکی بیاتەوە : بەساختە بەسەر یەکێکی‌دا زاڵ
دەبێ کەلەوی ببەنەوە : بوخنانی پێدە کرێت کەتەنها گەمەی ـ بیینێ
هۆشی لەتاقی کردنەوەدا بەکار دەبا .
شەڕ : ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا نیشانەی تاهۆ ( طاعون ) یە . کە
لەشەڕێدا بەسەر دوژمناندا زاڵ بێ : لەدەردی تاهۆ ڕزگاردەبێ . کە
بیینێ ـی لەگەڵ مرۆیەکی کرد یاوولاخێك لەگەڵ وولاخێکی‌تر ـی
کرد : بەو مەرجەکە هەردوو کیان لەیەك ڕەسەنی بن هەر کامێکی‌سەر
کەوێ بەسەر دوژمناندا چیرە وزاڵ دەبێ . ( ـ بە ڕێك و پێکی )
ڕوودانی کارەساتی لەژوورووی پاسایە . ( مەیدانی ـ ) فریو وتەفرەی
ناخۆشە . ـ لەدەریادا : بەدبەختی‌و نەگبەتی‌یە . (هاوکاری لەشەڕدا) :
ماڵ زۆری‌یە و بەسەر نەیاراندا چیرە بوونە و ئاڵوگۆڕێکی بەجێیە
لەکار وپایەدا (ـی ژنان ) : نەکێشان وبەد ڕەفتاری‌یە . ( ـ لە نێوانی
دوو پیاواندا ) : پیلەیە لەنێوانی دوو ژناندا . (ـ لەنێوانی پیاووژنێکبی
دا ) دڕندەیی و کرداری ناپاکە لەنێو خانەوادەدا .

شەرم :- کردن لەچتی باش : ڕوولە باشی وبەختەوەری یە . - لەچتی خراپ کردن : کەم باوەڕی و خراپەیە .
شەقام( -ی پاك ) : ڕێگادان (موافقەت) ێکی پڕسوودە . (-ی خوار و خێچ) میوانی ئازار و ڕەنج دەرە . ( - ی بەرەو هەوراز و پڕ مەترسی ) : کێشە کێش و بەربەرە کانێیەکی سەختە .
شەکراو : بڕوانە ( خۆشاو ) .
شەکرۆکە بڕوانە ( شیرینیات )
شەل ابن سیرین دەڵێ کەبینی - بووە : لەپێش خزماندا نزمدەبێ . ابراهیم دەڵێ کە خۆی بە - ی ببینێ : ئاواتی پێك نایەت . کەبینێ - بووە و بەداری دەڕوات : کۆمەڵێ لە کەسێکی یەوە دەخوازێ وئاواتی پێکدێ کەبەهەردووك پێیان - بووبێ : لە کارو باری کووێخایەتی دا دادەمێنێ ودەردە دار دەبێ
شەم ابن سیرین دەڵێ کەلە دەستی خۆیدا -ی هەڵکراو ببینێ : ڕێز و بەهرەی پتردەبێ . کە -ی هەڵکراو لەدەستی کەسێکی وەر گرێ لە لایەن کەسێکی یەوە هێزوڕێزی دەستدە کەوێ . کە کەسێك -ی هەڵکراو یاشەمدان بدا بەو لەبنە ماڵێکی گەورە ژنێ دێنێ . کرمانی دەڵێ کە - لەدەستی وی‌دا بکوژێتەوە : ژنەکەی دەمرێ کەژنی نەبێ باری تێکدەچێ کەیەکێك -ی لەدەستی وی‌دا بکوژێنێتەوە یەکێك چاوی پێ هەڵنایەت . ئەگەر شەمی هەڵنەکراو لە دەستی خۆی‌دا ببینێ لەوانەی لە پێش‌دا باسیانکراوە کەمێك سوودی دەست دەکەوێ . دانیال دەڵێ ئەگەر -ی هەڵکراو لە دەستی خۆیدا ببینێ ئەگەر ژنی هەبێ ، کوڕێکی دەبێ . کەلەشارێکی‌دا چەند -ێکی هەڵکراو ببینێ : پادشای ئەوشاری دادگەر و شادمانی لێ پەیدا دەبێ . ڕووناکی - : مزگێنی خۆش‌و بەختەوەری‌یە هەڵکردنی - : منداڵی تازەیە کوژاندنەوەی، کز کردنی هۆش و زرنگی‌یە کەشەمە کوژابێتەوە ڕزگاری بەه

لەبێوەیی ( بێ ژن و بێ مێردی ) . ( کە شەم بکوژێتەوە ) : هـەلاتنـی زیندانی یە . ( کەهەردوو سەری (شەم) بسووتێ ) بێ ئەمەگی وسپڵەیی یە شەم کەهەڵکرابێ ومالیش ڕووناك بکاتەوە ڕێزوپلە وشکۆی دەست دەکەوێ و لە نەخۆشیش چابونەوەیە . کە ـ بلێتە بلێی بکات بقەیـەك ڕوو لە یەکێکی خۆشەویست دەکات .

شەمامەدیتنی ـ : کوتوپڕ دەولەمەند بوون وزوو لە ناو چوونە

شەمدان دیتنی ـ : منداڵ بوون وشایی وجەژن و میوان داری یە

شەو کە لە خەونی دا ببینێ کە ـ تاریك بووە : نیشانەی خەم و خەفەتە کـە ڕووناك یامانگە شەو بێ : شادمانی یە ابراهیم دەلێ کەببینێ بەشەو بە ڕێگادا دەڕۆیشت : نیشانەی پایە داری ( استقامە ) یە

شەوبۆ ابن سیرین دەلێ دیتنی ـ لەکات وبێ کاتدا : ڕەنج و نەخۆشی یە .

شەونم ابن سیرین دەلێ کەببینێ لەشوێنێکی ـ دەبارێ : ئازار ڕوولەشوێنی دەکا . کەببینێ گرمە یاتروسکە یاشەونم هەیە لەوێدا قاتی وقڕی پەیدا دەبێ وزیان وتەنگانە سەر هەلدەدا . کرمانی دەلێ دیتنی ـ لە گـەڵ بـارانە گوشادی و بـەهرە و هێمنی یـە .

شەیتان ـ لەخەوندا دیتن : گەندە یاکێشەی ناوماڵ ، ڕەنج و ئازاری گیانی یە ـ هێنانە ژێردەست : سەر کەوتنە بەسەردوژمناندا کە ـ جادوی لی کرد بێ : بەخت و شانسێکی گەورەیە کە لەگەڵ شەیتان شەڕی بکا و سەری دا زاڵ بێ تووشی خێرو خۆشی دێت کە ـ بەسەر وی دا زاڵ بێ توشی شەڕو گێچەڵ و کێشان دەبێ . کە ـی بدوێنێ یاناموژگا ی بکاو دەستی بگرێ شەڕ و گێچەڵ لـە ڕێگـای دەر دەکا ـ کـوژتن : هـۆڵمای ( نفس ) کوژتنـە کەشەیتان بەسەر وی دا زاڵ بێ : ڕێگای شەڕ و گێچەڵ دەگرێ

شكان . کەئەندامێکی بشکێ : زیانێکە لەلایەن خزمانیەوە بەوی دەگات .
شکلێ . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـو شێوەی وی گۆڕاوەو شێوەیە کی تر دەنووێنی : هەر بەو چەشنە دەگۆڕێ . کەببینێ گەڕاوەتەوە سەر شێوەی خۆی : نیشانەی گەڕانەوە سەر دۆخی خۆیەتی و لەخراپەش پەشیمان دەبێتەوە . ابراهیم دەڵێ کەڕوخساری خۆی ئاوەژوو ببینێ : هەموو کەسێك ڕووی لێ وەردەگێرن .

شلالە . بڕوانە ( برژ ) .

شووان و شووانی . ـ ی مەڕ و بزن و ئاژاڵان : ڕۆزی بە . ـ ی ئەسب : گەورەیی داهاتە . شووانی کەر : ماڵ و ڕۆزی ڕەوایە . کە لەگەڵ شووانێکی شەڕ بکات : لەگەڵ گەورەیێکی دوژمنایەتی دەکات .
شووان : بەختەوەری ناو ماڵە . ـ بەمەڕەوە : ژن هێنان یا مێرد کردنە لەناو دێهاتان دا .

شووره . شوورەی شارو قەڵات و دێ پادشاو میرو ئاغایە . کەشووره بڵندو قایم بێ هێزو چاکی پادشایە کە ـ بکەوێ و بڕووخێ وە کە هێندێکی بڕووخێ بەلای شاریدا مردنی میرو ئاغایە کەهەمووی بەلای شاری دا بڕمێ : پادشا دەمرێ کە کەمێکی ـە کەی دووبارە نووێ کەنەوە فەرمان ڕەوا یائاغایە کی نووێ دێتە ئەوێ و لەوێ دا دادەنیشێ . کەـ کە هەمووی دووبارە دروست کرێتەوە پادشایە کی نووێ دێتەوە ناوی . کەـی نزیك دەروازەی ببینێ : خۆشڕابوویری و هێمنی یە کەشوورەی لەدووری دەر گایە ببینێ یاڵەپشت ڕاوە ببینێ ، ژنی شاری یە .

شۆرباو گۆشت . ـی مەڕی کەخۆش لێ نرابێ : سوودە . کەسارد بێ : خەم و گرفتاری و گرانجانیی‌یە . شۆربای گەرم : دەوڵەمەندیو دارایی دەمەکی ( مۆقت ) یە . کەـ لەسەر ئاگری بێ : سامانێکە زوو لەناو دەچێ . ـ کە کەف بکات : کارێکە ئەنجامی نی‌یە . ـــ خوواردن : زیان و لەناو چووواندنە . نان لەشۆرباو کوشین : خـۆش بوونەوەی نەخۆشە . ـی نیسك ( بڕوانە نیسك ) . جابر دەڵێ ـ بە گۆشتی ناسك لێ نرابێ : سووودە ، کەبە گۆشتی ئەستوور لێ نرابێ : خەمو خەفەتە

شووشە . دیتنی ـ : ژنە . ـی زار ئاوەڵە دیتن : تا دەتوانێ ڕازی خـۆی نهێنێ ڕابگرێ . کەئاوی لەشووشەی دا بخوواتەوە : دەبێتە خاوەندی خاوو خێزانو ماڵ . کەلەـەوە ئاو یامەی بدرێ بە کەسێکی تر : ژنی بۆ داخووازی دە کرێ کەشووشـەی سپی ببینێ و ناوی وی لەسـەر نووسرابێ : ماڵێکی زۆری دەست دە کەوێ و هەموو گرێیەکی بـۆ دە کرێتەوە : کەلەسەرـە کەناوی پادشا نووسرابێ : ئاکام ( مەرگ )ی نزیکە . کەشووشەکەی بکەوێو بشکێ ژنەکەی خۆی بەڕەڵا دەکا کەنەبێ ژنی خزمێکی دەمرێ . کەشووشەی بەدەرو دیواری ماڵیەوە کردبێ : هێندەی وان ژن و کەنیزەکی دەبێ کەشووشەی سپی یاسەوز بێ ژنەکانی‌ساز گارو بەئایین . ـی زەرد : ژنەکانی نەخۆشو ڕەنگ زەردن . کەڕەنگی شووشە ـوور بێ ژنی لۆتیو دووزمانی دەبێ .

شۆفار ( جاسوس ) . کەـ ببینرێ : سەر کەوتن و پیرۆزی‌یە لەدادگایەدا . بوونە شۆفار : بێ ناموسی و بێ ئابڕوویی‌یە .

شیاکە بڕوانە ( ڕیخ ) .

شێپوور . بڕوانە ( بۆڕی )

شوشتن : بڕوانە لاپەڕە ( ١٦٩ ) ٠

شێتی : بەختەوەری‌یەکی گەورەیە . مرۆخۆی بە- بیبنێ : ژیری وزیر کیە

شێر ( دڕندە ) کە-ی ببینێ : گرێی کاری دە کرێتەوە . کوژتنی- : جووا
مێری‌یەتێکی وا دەبینێ کە چاوەڕێی‌نەدە کرد . کە (شێرەوی بگەزێ)
لەلایەن دوژمنی‌یەوە زیان دەبینێ . ( کە لە گەلێ -ی شەڕێ بکا) لە گەلێ
دوژمنی دە کات . ( کەلە خەونیدا بە سەر شێرێدا زالێ بێ ) بـە سـەر
دوژمنی دا زالێ دەبێ ( کە شێر بەدووی دا بێت و نەیگاتێ ) لە لایەن
پادشاوە تووشی ترسی وهەراس دێ . ( کە لەبەر شێر هەڵبێ وشێردوای
نەکەوێ ) لەو چتەی کە لیێ دەترسێ دڵنیا دەبێ . ( گۆشتی -خواردن
لە پادشاوە خێر پێ گەیشتنە . کرمانی دەڵی شێری نێر پادشایە وهی مێ
شاژنە . کە لە گەلێ شێری بنوێ (جووتبێ) : لەلایەن پادشاوە دەچرووـ
سێتەوە . ( کەپادشا -ی بداتێ ) لەووڵاتێکی‌دا دەیکاتە فەرمان ڕەوا . کە
سواری - بی بەپایەکی تەواو دەگات . کە - ی مێ بدوێنێ : دەبێتە
نووسیاری پادشا کە -ی لە سەر پشتی خۆی دابنێ : زاڵی یە .

شیر ( تیغ ) - لە کالانەدا ژنە و هی بێ کالان مال و فەرمانڕەوایی‌یە . کە
ژنێك ببینێ لەدەستی خۆیدا -ی هەیە : کوڕێکی دەبێ کە -ی لە نێو
کالاندا بشکێ : منداڵی لەناو زگی دا دەمرێ کە پیاوێك ببینێ - ی
ڕووتی لەدەستی دایە و لە یەکێکی بدات نیشانەی وەیە کە بیرلە قسەك
دە کانەوە کە بە کەسێکی بلێ . کە- لە کەسێکی بداو کاریگەر نەبوبێ
نیشانەی وەیە کە لێدراو وەجاخ کوێر دەبێ . کەلەملی دابێ بەنشتوەوە
دەبێتە فەرمان ڕەوای ووڵاتێکی کە بەبێ‌هۆ لەیەکێکی بدات : ناوی
لێدراو بە ناوبانگ دەبێ . کەببینێ چەندین - ی هەیە یا یەکێك داویە
بەو دەوڵەمەند دەبێ . کە-ی لێ بستێنرێ لە کار دوور دەکەوێتەوە
کە - ی لە ناو قەدی ببەستێ تەمەنی درێژ دەبێ . کـە - ی زێـڕینی

هەبێ : بەهۆی گەورەیێکی‌یەوە تووشی ئاسوودەیی دێت .

شیر ( خواردنەوەی شیر ) : سەودا و دڵداریێکی تەڕ و تازەیە . کەبینی
- رژاوە : زیانە . - دان مندالی تازەیە . ( تەماشای شیردانی کردن )
خۆشحالی دڵ و دەروونی‌یە . - هەرچەندێکی تازە تر وشیرینتر بێ :
سوودی پترە . -ی تازە خواردن : مالی رەوایە کە ژنێك ببینی شیرلە
مەمکی‌وی دا کۆبۆتەوە . نیشانەی ئەوەیە مندالی دەبێ . کەلەکاتی‌شیر
دۆشینی‌دا خوێن بێ : مالی نارەوایە . کەببینی لەمەمکی خۆی‌دا شیری
دەمژی : لەکاروباری خۆیدا کەم و کووڕی روو دەدا . کە پیاوێك لـە
خەونی‌دا ببینی کە مندالێ بۆتەوە و -ی دەخوات : ئاواتی پێك نایەت .
ابراهیم دەڵێ دیتنی -ی چواریێ‌یانی دەشتی : مالێکی کەمە . -ی‌ووشتر
خواردن : سوودی لە ژنێکەوە دەستدە کەوێ . کە -ی مامزی بخوات:
رۆزی‌زۆر دەبێ . -ی بزنان و سوودە لەژنانەوە . کە-ی‌پلنگی بخوات :
بە سەر دوژمناندا چیرە دەبێ . -ی فیلی بخوا : لە گەورەیێکەوە مالی
پێدە گات . -ی گامێش : لە ژنێکی رەنج دەبینی . کە-ی بەرازی بخوا:
بێ هۆش دەبێ . کە هی گورگ بخوات ، خێزانی ناپاکی لە گەڵێدە کا
خواردنی -ی مەڕ : مالی رەوایە .

شیر کتك ابن‌سیرین دەڵێ‌دیتنی- خەم‌و خەفەتەو خواردنیشی کەم‌و کوڕی‌ماڵە

شیریژ ( ژاژی ) ابن سیرین دەڵێ - خەم و خەفەتە . هەرچەندێکی ترش‌و
تیژتر بێ : خەم‌وخەفەتە کە سەخت تردەبێ . کە -ی بفرۆشێ یا پیدا
بە کەسێکی :لەخەم وخەفەت رزگاردەبێ . کرمانی دەڵێ خواردنی - :
وو تەیە کە کـە بێی تووڕە دەبێ

شیرینی ( شیرنیات ؛ شەکرۆکە ) دیتنی ـ : شادی ورۆزی ڕەوایـە ، فێڵ و تەفرەی ژنانە . کەکەسێك ـ بەوی بدات : ئاسوودەیی بەو دەگەیەنێ ، خواردنی ـ : دڵدارێتیکی بۆە (خطر) دارە . ـ لەبابەت بوو کێکەوە: بەڵیە کە لەسە باوەڕی، وپاك داوێنی وی ـ دان بەکە سێکی کەیف خۆشی‌یەکی دەمەکی ( موقتی ) یە دروست کردنی ـ پارێشانی و بێ چارەیی‌یە . کە ـی شەکر و بادامی بخوات ماڵێکی زۆرە

شوشتن سەر و لەش بە ئاو ـ ڕزگاری‌یە لە خەم و خەفەت . کەگرتوو بێ بینی‌ئازاد دەبێ . نەخۆش‌بی‌بینێ : چاك دەبێتەوە . کەببینێ مردوو خۆی دەشووا ; خزمەکانی لە خەم ڕزگار دەبن .

شیلان دیتنی ـ : ماڵە کە ـی‌بدا بەکەسێکی : ئاسوودەیی بەوی دەگە‌یەنێ کەببینێ ـی‌هەیە وخواردی : ماڵی دەستدەکەوێ جابر دەڵێ کەببینێ لەدارێکی ـی لێ کردەوە : بەقەد وی ماڵی دەستدەکەوێ

شیلە (شیرە) ابن سیرین دەڵێ ـ ی ترێ سوودە . کەببینێ ـ ی ترێ ی دەکوشێ : ژنێکی ئابڕوو مەند دێنێ .

شێلم : خەم وخەفەتە ـی بداتە هەر کەسێکی : خەم‌و خەفەتی پێ‌دەگەیەنێ جابر دەڵێ هی کوڵاو لەهی کاڵ باشترە کە ـی لەخۆی دوورخاتەوە لەخەم وخەفەت ڕزگار دەبێ .

شیناوەردی : وەڵام ومزگێنی خۆشە . (لێکردنەوەی ـ ) : سوود وبەهرەیە پاك کردنەوەی : سوود لە بۆە (خطر) کەوتنە . چاندنی : تەمەن درێژی‌یە . ابن سیرین دەڵێ کە لە کاتی خۆیدا ببینی کە زەوی هەیە ـ تێدایە : نیشانەی ئایین پاکی وداوێن خاوێنی‌یە . کەببینێ لەزەویەکی خۆیدا گیای وای لێ ڕوواوە تەماشای دەکات و نازانێ چی‌یە ونایناسێ نیشانەی ئایین داری‌یە

که بیناسیٚ : مالۆ و ناز و بەهرەیە . مغربی دەڵێ که شیناوەردی لە کاتی خۆیدا ببینیٚ : ئاییندارى وپارێزگاری یە . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا باشە . کەبینیٚ لەناو ـدا دانیشتووە : سوودی گیتی وئایینی یە . کرمانی دەڵێ کە ـ پاك وخۆش ببینیٚ وبشزانیٚ هی خۆیەتی ئاییندارى وپارێز-گاری یە . کە ـ زەرد وژاکاو ببینیٚ : بە پێچەوانەیە . کە بەناو ـ خۆیدا بگەڕیٚ : گوزەرانی خۆش دەبیٚ و ئەنجامی باشە . کە گوڵ و ڕیحانەی لەناو ـ دا ببینیٚ ڕرواون : دۆستایەتی لە گەڵ گەورەیێکی دەکات کە ئەو گەورەیە لە نۆکەر و شان وشکۆی خۆی دوور کەوتیٚتەوە . کە لەناو ـ دا کەر و گایان ببینیٚ : لەشکری شای بە سپلەیی دەبینیٚ . کە گوڵ و ڕیحانەی لەناو ـیە کەیدا کۆ کاتەوە : ماڵ بە ڕەنج کۆ دەکاتەوە . کە بچێتە ناو ـ سەوز : ژنێکی توند و تیژ دێنیٚ

طاعون : بڕوانە ( ئاهۆ )

طۆفان : بڕوانە ( لافاو )

عاشق : بڕوانە ( دلدار )

عزل : بڕوانە ( لێکەوتن ) .

عەرەبانە کەند و کۆسپە و گرفتارییە لە کار و باری ناوەوە . ڕاکیشانی ـ : کۆسپە و کارەساتی هەمیشەیی یە .

عەرش ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : فەرمانێکی گەورەیە یا ماڵو داخوازێکی زۆرە . کە ـی بە ڕازاوەیی ببینیٚ : پایە و کار و بار پێکهاتنە . کە ـی بەسووکی و نزمی ببینیٚ : لە پێش خەڵکی سووك دەبیٚ

کەخۆی لەسەر عەرشی ببینێ ؛ لە گەورەیێکی نزیك دەبێتەوەو لەوەوە ڕێزو سوودی دەست دە کەوێ .

غاردان . ابن سیرین دەڵێ کەلەخەونیدا ببینێ غاری دەدا یائێستری غاردەدا دەچێتە سەفەرێ . کەببینێ سوواری ئەسپی کورتاندار دەبێو غار دەدا لە گەڵ خێزانی . بەخێزانەوە کۆچ دە کات و ماڵیشی دەست دە کەوێ . لە کاتی -یدا پێش‌یە کی تر بکەوێ ؛ نیشانەی‌ئەوەیە کەلەوی ئارەزوی ماڵدارێتی پترە . کەلەغاردانیدا ماندوو بێ و ئارامی بگرێت ؛ واز لە گیتی دێنێ و ڕوو لەچاو تیژی دە کات

فاڵ . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ -ی دە گرتەوەو باشی هێنا ؛ بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێ . کەخراپ بێ ؛ خراپە . -گرتنەوە بەدەنگی باڵندان ؛ هەواو فیزێکی پووچە بەڵام لەلایەن - لێکدانەوە باشە . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ بەدەنگی باڵندان - دە گرێتەوە ؛ بەبڕو پووچی گیتی هەڵدە. خەڵەتێ و لەلایەن ئایینیشەوە بێ هێز دەبێ . جابر دەڵێ کەباڵندەیە کی تاك بێ ؛ باشە . بەڵام کەجووت بێ بە ئەژمار ؛ نەخۆشیە لە ئەنجام چا کەبێتەوە

فانووس . -ی هەڵکراو ؛ هومێدە . هی کوژاوەوە ؛ بەدبەختیو کوێریە

فەرەجی . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ -یە کی گوشادو خاوێنی لەبە کردووە لەخەم ڕزگار دەبێ . بەڵام کە کۆنو چڵکن بێ ؛ بەپێچەوانەیە . دیتنی -ی ئاوریشم بە کەسێکەوە کەئاوریشم پۆش بێ ؛ باشە . بۆ پیاوی

خودا پەرست خراپە . فەرەجی لۆکەو خرری : هێزی ئایینی‌یە . جابر
دەڵێ کەبیینێ ـی تازەی پۆشیوە : ئایینداری‌یە . ـی سوور : خـێرە
فەرەجی شین : کارەساتە .
فەرمان . ـی قاضی کەمرۆ خۆی قاضی بێ : پێویستە لەبیرو باوەڕ ووتن‌دا
پارێزگاری بکات و خۆی لـە کێشـە و محاکمات دوورخاتەوە .
فەرمانرەوا دانیاڵ دەڵێ لە تەختی کەوت و یا تەختە کەی بشکێ و یا شیری
لێ بستێنرێ ویا وولاخی وی سەرەنگرێ بێ وئەوی فرێ‌داتە خوارەوە
نیشانەی داد گەریێتی وی‌یە و لە لای هێندێکانیش نزمی و لێ کەوتنە .
ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ پێچی سەری وی‌لەگەڵ پێچی سەری یە کێکی
تر وێك کەون : گەورەیی وی پایە دار دەبێ
فەلە کە موسلمانێك لەخەونی‌دا بوبێتە فەلە : دیارە لەئایینی ئیسلامدا بڕوای
بێ تینە و لارێ دەبێ و وەدووی گێتی دە کەوێ . کە ـ یێك بووبێتـە
موسلمان : دەبێتە موسلمان یا دەمرێ . صادق دەڵێ هاونیشنی فـەلان
کردن : بێ بیر و باوەڕی‌یە و وەشووێن هۆلمان ( نفس )دە کەوێ .
جابر دەڵێ کەسێکی بووبێتە ـ : بەسەر دوژمنان‌دا زاڵ دەبێ چونکەو
ـ بەئارەوی (نصرانی)یەو ئەویش لە (نصرة) دوەیە .
فراوان . ابن سیرین دەڵێ کەلەخەون‌دا لەشووێنێکی تەنگەرە بچێتە جێگا-
یەکی فراوان : کاروباری بەستراوی بۆ دە کرێتەوەو لەخـەم ڕزگار
دەبێ کەبیینێ دووکان یامالی وی ـ بووە : ڕۆزی زۆر دەبێ
کەبیینێ جێگایەك لەوی تەنگ هـەڵکەڕاوە : دەرگای گوزەرانی
بەسەردا تەنگ دەبێ .

فرمێسك ـ ی ساردلە چاو هەڵوەراندن : تووشی شادی و خۆشی هاتنە .
ـ هەڵوەراندن : خەم وخەفەتداری یە . بەبێ گریان ـ لەسەر ڕووبوون بە قسە تانووتی لێ دەدەن . کە لە جیاتی ـ تۆز و خۆڵ کۆبێتەوە ماڵێکی زۆری بەبێ ڕەنج دەست دە کەوێ
فرۆشتن ـ ی بەرتوو کانی ئاسمانی : وا دەردە کەوێ کە لە ئایین دا سست دەبێ . کە نۆ کەری خۆی بفرۆشێ : کار و باری تەنـگ و زۆر دار (ظالم) دەبێ . کەژنی خۆی بفرۆشێ : ڕێز و گەورەیی وی بەدناو دەبێ بەڵان ئەگەر بەبێ وی ژنێکی تریشی هەبێ کار و باری ڕوو لە باشی دەکات . هەرچێکی بفرۆشێ ئەو چتە نزم وسووك و بێ نرخ دەبێ .
فڕۆکە ( دیتنی ـ لەحەوادا ) : دڵنیایی و ئاریشەنی ( معنوی ) و گیانی یە ، ( کەوتنی ـ ) : کەلکەڵە و پیشنیازانی بێ ئەنجام . هەوا و هەوەسی زۆر لە کاردایە
فسرێدان : بڕوانە ( ئاویشتن )
فڕین لە شووێنێکەوە بۆ شووێنێکی تر وەکوو باڵندە فڕین : کۆچ کردنە و بەرزی و ئابڕووە . کە ڕاستە و ڕاست بەرەو ئاسمانی بفڕێ : زیانی پێدە کات . کە بکاتە ئاسمانێ و لەوێدا بزربێ و نەگەڕێتەوە سەر زەوی زوو دەمرێ . ابن سیرین دەڵێ کە بەرە و باشوور بفڕێ و بگەڕێتەوە شووێنەکەی خۆی : بە سوودەوە لە ڕاڕەوی ( سفر ) دەگەڕێتەوە بەتایبەتی کەبینێ پەڕی هەیە ، بەڵان کە پەڕی لێ نەبینێ : باری دە گۆڕێ . کە لە بانێکەوە بۆ بانێکی تر بفڕێ : ژنەکەی بەرەڵا دەکا و ژنێکی تر دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکڕی . کە لە ماڵی خۆیەوە بۆ ماڵێکی تر بفڕێ : ئاکامی نزیکە . کەبینێ پەڕی هەیە و وەهی باڵندان ناچێ : نەخۆش و زۆر سەختـەت دەبێ و لە ئەنجام دا چاك دەبێتەوە

نۆتە ابن سیرین دەڵێ کەسێکی ببینێ بەرگی لەنۆتەی هەیە ؛ شادمانی یە . کە نۆتە کە کۆن بێ : بەپێچەوانەیە . جابر دەڵێ کەبیینێ بەرگی لە- پۆشیوە و ئەو کەسە ئابڕوومەند بێ : باشە ، ئەگەر ئاژاوە گێڕیشە بێ : خراپە که پادشایەك بەرگی - بپۆشێ : نیشانەی دادگەرێتی وی یە .

فیل ابن سیرین دەڵێ خەونی شەو ورۆژی هیچ جیاوازی نیە تەنها بۆ دیتنی فیلی نەبێ . کەسێکی بەشەو لە خەونی دا وا بیینێ کە لە سەر پشتی فیلی سووار بووە ؛ ژنێکی بێ کارە دێنێ ؛ کە بە ڕۆژ بێ ؛ ژنە کەی بەرەڵا دە کات ویا کەنیزە کە کەی دەفرۆشێت . خواردەمەنی ( بە - دان ) : دادە زانی و ئەمە گداری یە . لە کاتی هەڵاتنێ دا - دیتن ؛ مێردێك ژنە کەی تەفرە دەدا . کە -ی بکوژێ : پادشایەك بە دەستی وی دە کوژرێ یا قەڵاتێکی سەخت دە گرێ . کەفیل ئەوی بخاتە ژێر پێیانەوە و بیکوژێ هەواڵی خراپ دەبێ و نزیکی لە ناو چوونە . کرمانی دەڵێ لەسەر -ی سووار بوون و -ە کە چە کی هەبێ و گووێ لە مشتی وی بێ : دەبێتە پادشا و یا پادشای لەناو دەبات . کە گۆشتی -ی بخوات : ماڵێکی زۆری لەلایەن پادشاوە دەست دە کەوێ .

کە ببینێ پێست یا ئێسکی فیلی بێ یە : ماڵ و بەهرەیە کە لە پادشایەوە دەست دە کەوێ . لە کاتی شەڕێ دا سوواری - بوون : دوژمن شکاندنە کە لە سەر پشتی - بکەوێتە خوارێ : تووشی ڕووشە و کێشەیە کی سەخت دەبێ . کە - لە شەڕێ دا بکەوێ و بمرێ : پادشای ئەو وولاتی دەمرێ

قاب ( ئاوەخۆرە ) محمد ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا دیتن : کەنیزەکێکە کە لە گەڵی بە تێکەڵاوی ڕابوێرێ . کە لە ناو ـی دا ئاو یا گوڵاوی بخواتەوە ; لە گەڵ کەنیزە کە کەی بە پێی دەستووری ڕەوایی ئـایین دەبێتە هاوسەر و منداڵی باشی لێ دەبێ . کەبینێ ئاو یا گوڵاوە کەی ڕژت : منداڵی دەمرێ

قابی وێنە گەرێتی و شامی و دووربین : کارەسـاتی نـابـەدڵ و پـەشیمانی لەسەر کێشی‌یە .

قاز هێندێك دەڵێن ـ دیتن لەخەوندا ; پیاوێکی گەورەیە لەخانەوادە دا یـا ماڵ و سامانە . ـ دیتن : مـاڵ وسـامان و بەهرەیە کە بەوی دەگـات بەتایبەتی کە لە ماڵی بێ هی خۆشی بێ . کە ببینێ ـ ێکی زۆر لە ماڵێ یا لە کۆڵانێ دا کۆبوونەوە و قارە قاڕی دەکەن ; نیشانەی وەیە کـە کارەسات ڕوو دەدات . کە ـ لە گەڵ وی باخووێ بە هـۆی ژنێکـی دەوڵەمەندەوە کۆچێکی پڕسوود و ئابڕومەند دەکات . دیتنی ـ سپی : ماڵە یا ژنی دەوڵەمەندە ، هی ڕەش : کەنیزە کە . کە ـی بکوژێتەوە و گۆشتی بخوات : میراتی ژنی دەستدە کەوێ ولە ناویشێ دەبا . کرمانی دەڵێ ـ لەخەوندا : پیاوێکی گەورەیە بەماڵ وشان وشکۆیە کیزۆرەوە

قاژوو ابن سیرین دەڵێ کە ـ لە خەوندا ببینێ ; پیاوێکی بێ ئایین و درۆزنە کەبینێ ـێکی گرت یایە کێك داویە بەوی : بە کارێکی پـووچ تـەفرە دەخووات . کە ـ ێکی بکووژێ : بە سەر پیاوێکی وا دا زاڵ دەبێ . کەبینێ ـ لەشووێنێکی کۆبوونەوەلەوشوێنی‌دا دزوجەردە کۆدەبنەوە جابر دەڵێ ـ کەنیزە کێکی هیندی‌یە . ـی زۆر : لەشکرە . کە ـێکی ئاوەڕووت کات ; لە گەڵ ژنێکی ئاوارە داوێن پیسی‌دە کات . کەـی بکوە وژێ : کارەساتێك تـووشی خانەوادەی وی دێ . کـە ـ لـە گـەڵی باخووێ لـە ووەڵامێکی ئـاگـا دار دەبـێ . کـە بینێ ـ

لە ناو دەرێ‌ی دایە : منداڵی یا کەنیزە کێکی کاری خراپ دەکات . کە دەرمانی ـ ی بکات : پەند دادانی دزێکی‌یە . کە قاژوێك بە دنسوو کی چتێکی لە ماڵی وی ببات : چتێك لە ماڵی وی دەدزرێت .

قاضی ( دادپرس ـ حاکم ) کە مرۆ خۆی ـ بێ : پێویستە لـە بیر و باوەڕ دەرخستن و دادپرسی‌دا خۆی بپارێزێ . دیتنی ـ : کار وباری سەخت و ناهەموارە . گیرە و کیشەیە لە دادگایەدا بەشێوەیێکی تێکەڵاو پڕدەردە

قاقەز ابن سیرین دەڵێ کەببینێ چتێکی لەسەر ـی دەنووسی : میراتی دەست دە کەوێ . کە نەنووسێ : داوای میراتی دە کا و هیچی دەست نا کەوێ کەببینێ ـی سپی و پاکی هەیە : هێندەی وی ماڵ و گەورەیی دەست دە کەوێ . کە ـە کەی لێ لە ئاوێ بکەوێ یا بسووتێ : نیشانەی کەم‌و کووڕی ماڵ و گەورەیی‌یە . جابر دەڵێ کە ببینێ ـ ی زۆر هەیە : لـە زانست و هونەر دا ناوبانگی دەر دەچێت

قالب ابن سیرین دەڵێ کە ـی قۆندرە و ئیتر لە خەوندا ببینێ : نیشانەی ژن و کارە کەر ونۆ کەرە . کەببینێ ـی‌هەیە : نۆ کەرێکی دەستدە کەوێ کـە ـ ە کەی بشکێ یا بسووتێ : نۆ کەرە کەی دەمرێ . جابر دەڵـێ کەببینێ ـ ی زۆر هەیە : لە نۆ کەران سوودی دەستدە کـەوێ . کـە خۆی قۆندرەچی بێ : باشتریشە

قالۆچە دیتنی ـ لە خەوندا : پیاوێکی ماڵداری کارە . کە ـ ی بگرێ : لـە گەڵ پیاوێکی نارەوا خۆر دۆستایەتی پەیدا دەکا کە ـی بکووژێ : پیاوێکی سووت خۆر ( مردە خۆر ) دە کووژێ . کـەببینێ ـ یێکـی زۆری تێ ئاڵاوە : لە نێو مردە خۆراندا گرفتار و زیانیان لێ دەبینێ کەببینێ ـیێکی خوارد : ماڵی مردە خۆرێکی دەخوات

قامچی ـ لە دەست بوون : مندالە . ـ کە لە داری بێ : هێزی باری وی بە
کە لە چەرم و ئیتر بێ : خێر وسوودی بۆ دەگات . کە بە کێیك بە ـ لە
بە کێیکی تر بدات : تووشی کارێکی دێ کە لەوەوە قازانجی بۆ ناگات
کە ـ لەدەستی خۆی فڕێ دا : کارێکی بە دەستی یەوەیە وازی لێ دێنێ
کە بە ـ هێندە لە یەکێکی بدات تاخوێنی لەبەر بڕوا : دووانی ناخۆشی
گوێ لێ دەبێ ویا مالی نارەوای دەست دەکەوێ . کە ـ لە دەستی دا
بشکێ : مندالی دەمرێ یا کاری خۆی بەری دەبێ . کە سواری ئەسپی
بێ وبە ـ لێی بدات : کاری لەجیانی خەلکی دەکا وبەچاوی دادەداتەوە
قامك پێنج ـەکانی دەستی ڕاست  پێنج جارە نوویژە . پێنج ـەکانی دەستی
چەپ  مندالێ وبرایانی زۆرە یا مندالی برایەتی . کە بیبنێ دەستی ڕاستی
قامکی نیە : مندالێ یا برای دەمرێ یا برازای لە ناو دەچێ . کە ببینێ
ـەکچکەکانی لە سەر یەکتری داناوە : دەستکورتی و تەنگدەستی بە
کە ـەکانی کۆ بکاتەوە (وێك بینێ)  کاروباری برایان و مندالانی
جێ بەجێ دەکا . کە ـەکانی قووچاندبێ : گرێ لەکارو باری دەکەوێ
کە ببینێ ـە تووتەلەی بڕاوە  ئەوەی وی دەمرێ . ـی بێ بان : جوانی
وڕازانەوەیە  قامکی بێ یان کەئەستوورو زل و بەهێز بێ : دەێتە
کووێخا  کەئازارێك بەقامکەکانی بێی بکات و نەتوانێ بڕوات ،
خەم و زیانە . قـامکی دەست و پێی بەشکـاوی ببینێ : کار و باری
وە دەکەوێ .

قامیش . ـ لەخەون دا دیتن : پیاوێکی بەدخووی پێکوڵچینە . کە ببینێ
لەخەونیدا ـی زۆر هەیە : چتێکی کەم بەوی دەگات .

قامیشی شەکری . کەلەخەونیدا ببینێ ـ دەفرۆشت یادەیدا بەکەسێکی ،
لەگوفت و گۆ ڕزگار دەبێ .

قاوورمە ابن سیرین دەڵێ کە لەخەونیدا ببینێ کە گۆشتی مەڕی کردۆتە ـ: بەهرە وتالاَنە ، کەهی ئەسبی بێ : خەڵکی لەباشملەی وی دەدووێن و خووادرنیشو هیچ نی‌یە .

قەتران ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی هەیە ; هێندەی وی‌ماڵ دەستدە کەوێ کە بەرگێ یا لەشی خۆی لە قەترانەوە بدات : بەرگی نارەوا لەبەر دەکات . هێندێکیش دەڵێن . تووشی کێشە و گێچەلان دەبێ .

قەسەتۆرە ؛ ( چەقۆیەکی گەورەیە ) ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا دیتن : پیاوێکی ئازای وایە کە لەجیاوازی کاروبارانی ئاسان ودژوار دەکات. کەببینێ ـی هەیە یا یەکێك داوبە بەوی : دۆستایەتی لەگەڵ پیاوێکی وا لێ ڕوو دەدات کە باس کراو سوودی لێ دەبینێ . کە لێی بشکێ: پیاوێکی وای لێ جوێ دەبێتەوە

قاشـە : بڕوانە ( سەرۆکی ئایینی ) .

قەفەز ابن سیرین دەڵێ کەببینێ قەفەزێکی هەیە : لـە جێگایەکی تـەنگـدا گرفتار دەبێ ؛ خەون لێکدەرەوان دەڵێن لە زیندان دەکەوێ .
کەببینێ ـ شکاوە : لە زیندان ڕزگار دەبێ

قەلات کەببینێ چۆتە ناو قەلاتێکی‌یەوە : لە شەڕی دوژمن دڵنیا دەبێ . کە لە ـێ یێتە دەرەوە : بەسەر دوژمناندا زاڵدەبێ . کرمانی دەڵێ کەببینێ لەقەلاتێکی قایم دایە وەی خۆیەتی لەشەڕی دوژمنان دڵنیا دەبێ ، کە لە ـ ی یێتە دەرێ بەپێچەوانـەیـە جابر دەڵێ لـە نـار ـ دابـوون : ڕۆزی و بەهـرە و گوشادی‌یـە .

قەلاَیی : ماڵ و سامانە کە کەرستەی وەکو قاب و کەوچك و چەنگاڵ و ئیتری لە ـ هەبێ : نۆکەر وغولامی باقەی وی‌دەبێ . کە بیانتاوێنێتەوە بە خراپی لێ دەدووێن .

قەلەرِەشە . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ : پیاوێکی کەم ئایین و بێ پەیمانە .
کەبینێ ـی هەیە : لەگەڵ پیاوێکی وا دەبێتە هاودەم . ابراهیم دەڵێ
کەلەراوێ‌دا ـی بگرێ : بەفێڵ ماڵی لەخەڵکی دەستێنێ . کەلەسەر
دارێکی ـ بخوێنێ : تووشی رِەنج و ئازار دێت .

قەڵەم : برِوانە ( پێنووس ) .

قەلەموونە ( عەلەشیش ) . ـی مێ : دیاری و بەخشە . ـی نێر : جێژنـەو
میوانداری‌یە . نەرخە ـ : گیلی و دووا رِۆژی خـراپە . کە ـ کرابێتە
کەباب : میوانداریێنی و بانگهێشتنی لە دەست چووە .

قەند ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـی دەخوارد : بەتاڵوو کەکارێکی دەکات و
لێی پەشیمان دەبێتەوە . کەبینێ بەخەروار ـی هەیە : هێندەی وی ماڵ
دەستدەکەوێ . ـ فرۆشتن : زیانە . کرِینی ـ لە فرۆشتنی باشترە .

قەنداو : برِوانە ( خۆشاو )

قەیسی ابن سیرین دەڵێ کە ـی لە کاتی خۆی دا و شیرین بێ بەقەدر هەر
ـێکی کە بیخوات دینارێکی دەستدەکەوێ . بەڵان هی ترش نەخۆشی
و خەمە . هێندێکیش دەڵێن ـ لە خەوندا دیتن ماڵە یـا کەنیزە کە .
کرمانی دەڵێ کە چەقالەی بشکێنێ وتاڵ بێ : خەفەتێك بەوی دەگات
جعفر دەڵێ ـ لەکاتی خۆیدا نەخۆشی‌یە ، لە بێ کاتیش دا کە ترش بێ
خەم و خەفەتە ؛ کە شیرین بێ : سوودی دەست دەکەوێ

قبلـە : برِوانـە ( رِوو گـە )

قرپ ، ـ هاتنەوە : روتەبێکی لەزاری دێتە دەرێ کە دەبێتە هۆی رِێزوتەدرو

کە لە گەڵ ـ خواردەمەنی لە زاری بێتە دەرێ : ئاکام ( مـەرگ ) ی نزیکە . کە قرپە کە ترش و ناخۆشبێ : ووتەیێکی لەزاری دێتە دەرێ کە دەبێتە هۆی بێ ڕێزی و زیانی لێ دەبینێ . کـە ( قـرپ ) وە کـو دوو کەڵ بێ : ووتەیەکی لێ ڕوو دەدا دەبێتە هـۆی شەرمـە زاری و لێشی پەشیمان دەبێتەوە .

قرژاڵ ابن سیرین لای وایە دیتنی ـ : دۆستایەتی پیاوێکی سووك و نزم و لـە چەر کردنە و کـەمێکیشی ماڵ لەوی دەستدە کەوێ . کـە ـ ی بـکووژێ و یا لە خۆی دوور خاتەوە : لە پیاوی وا دوور دە کەوێتەوە کە گۆشتی ـی خواردبێ : ماڵی دەستدە کەوێ . کە ببینێ ـ ی هەیە : تووشی پیاوێکی بەد خوو و ناساز گار دێت و چاکـەشی لێ دەبینێ . دیتنی ـ : محا کەمەیێکی لە سەرە خۆیە کە هۆی بـەد بەختی و چـارە ڕەشێتی ویـە .

قـە ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ قـەی بۆ خەڵکی کرد : لە ترسی زۆر داران دڵنیا دەبێ . کرمانی دەڵێ کەببینێ ـی بۆ خەڵکی کرد : ئاواتی پێـك دێ . کەببینێ قـەی چا کە وبرِ بەرژەوەندی دە کات ، لە بێداریێتیش دا هەروا دەبێ . ـی خراپیش هەروایە .

قسڵ : ـ لەخەوندا وەڵام ودەنگـوباسیخراپە (خانووبە ـدروستـکردن): خراپە. بە ـ بەرلێ کردنەوە: ماڵوساما.ە لەخەمێز گاربونوتەرزدانەوەیە

قفـڵ ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا ببینێ کە ـی کردەوە : دەر گای کارانی لە سەر دە کرێتەوە ، کە نەتووانی ـ ە کەی بکاتەوە : کار وباری لەسەرە خـۆ پێك دێ .

قوتابخانە : ـ دیتن لە خەوندا ; جێگای خەم و خەفەتە بەڵان لـە ئەنجام دا مایەی سوود و سـەر کەوتنـە

قوتابی دیتنی ـ : کار و بارێکی بڕ سوود وەدەست دەهێنێ

قوتوو : ڕەونەق و بایەخداریە . ( ـی بەتاڵ ) : هەژاری و بەد بەختیە.

قۆچان ( سند ) کە ـی مۆر کات ویا هەیبێ : سوود و قازانجە . کە ـ ی لێ گوم بێ یا بسووتێ : دەمرێ . کە ـ ی مۆر کراوی دەست کەوێ یـا بیدەنێ : سوودی دەست دە کەوێ . مغربی دەڵێ کە ـ ی مۆر کات یـا هەیبوو و مۆرە کەی لێهەڵگرێ : کەم و کوورِی دە کەوێتە ناو ماڵی وی بـەوە

قۆچەقانی ( بەردەقانی ) ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ یە کێك بە ـ بەردی بۆ کەسێکی‌تر داوێ : لەوی ێز و بۆیە دە کات . دیتنی بەردێکی کە بـە ـ داوێژرێ : قسەی ناخۆشـە

قـورِ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـ ی دەخوا : ماڵ و سامانی بۆ منداڵە کانی صرف دە کا . کەببینێ ماڵی خۆی بە قورِی سوواخ دەدا : خەم وخەفەتە ـی سوور وسەوز وسپی : گەمە وفشە وخۆش رِابووارد‌نە ، هی‌رِەش ؛ خەمە . کە لەناو ـێ دا رِۆچێ : دە کەوێتە ناو کارەساتێك . کە لەناو ـێ بێتە دەرێ : لە خەم و خەفەت رِز گار دەبێ

قۆرە ( بەسیرە ) کەببینێ ـی دەخوارد و لە کاتی خۆی داىە : ماڵی بەرِەنج دەستدە کەوێ ابراهیم دەڵێ کە ببینێ ـ ی خوارد : خەمگین دەبێ ، کە قۆرەی بفرۆشێ ونەیخوات : هیچ خەمێکی بێ ناگات . کە ببینێ ـ لەناو گۆشتاوێدا لێنراوە : هیچ خەفەتێك نایگرێ و بەڵکو باشە .

قوربانی ( ـ کردن ) : داد و ماف نەناسی و سپڵەیی وفێڵ وفەرەجە . وەرە گرتنی ـ : کەیفخۆشی‌یە کی‌چاوەرِێ نە کراوە کەیە کێك لەخەونی‌دا ببینێ کە مەرِێك یا ووشترێکی کردۆتە ـ ئەگەر بەندەبێ ئازاد دەبێ کە نەخۆشبێ چاك دەبێتەوە ، کە هەژار بێ : دەوڵەمەند دەبێ ، کـە ترسی هەبێ : هێمن و دڵنیا دەبێ ، کە قەرزدار بێ بـۆی دەدرێتەوە ، کە لە تەنگانەدا بێ : رِز گار دەبـێ

که ئەو خەونە لەبەرە بەری جەژنەی قوربانیدا ببینێ باشترە . ابراهیم
دەڵێ کە گۆشتی قوربانی بخوات : باشترە . کە گۆشتی قوربانی بەنجنێ
وییدا بەخەڵکی : پیاوێکی گەورە لەوی دەمرێ ومالیوی دەبەشێتەوە
قۆرخانە دیتنی - : دووری و جووێ بوونەوەیە لە خانەوادەدا .
قۆزاخەی ئاوریشمی کرینی - : ئاوەدانی و گوشادی‌یە . فرۆشتنی وی :
ڕەونەقی کار وباری ماڵ و ئابووری‌یە .
قۆڵ : بڕوانە ( باسك )
قۆڵبەند کە قۆڵبەندی زێڕینی لە قۆڵ دابێ : لە برادەران یا لە کەسێکی تر
خەم وخەفەتی بێ دەگات . کە -ی زێوبێ : کچی خۆی یا خوشکەزای
خۆی بەشوو دەدا .
قولاب ـ لە خەوندا : میراتێکی زۆرە ؛ هەڵبژاردنی پایە و پلەیەکی‌یە ؛
هەڵبژاردنی مێردێکی دڵخووازە .
قولنگ (باڵندە) ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ؛ پیاوێکی ئاوارە و دەروێشە
کە ـێکی بگرێ : لەگەڵ یەکێکی ئاوارە و دەر بە دەر دەبێتە برادەر
و سوود لێك دەبینن . کە ـی زۆر هەبێ : بەسەر دەستە ئاوارەیێکی دا
دەبێتە سەرۆك . کەسوواری ـی‌بووبێ : کۆچ دەکا . کە بزانی هێلکەی
ـی هەیە : ژنەکەی دەبێتە هەژار و دەروێش
قوون : بڕوانە ( کۆم )
قوونێژ هەر کەسێکی ـی ببینێ ؛ خاوەند قەرز تەنگاوی دەکات . کە ـی
دەربێ بە تەواوی لە تەنگانە ڕزگار دەبێ . کە ـ لـە خۆی بێ
قەرزداری و دەستکورتی‌یە

دەست لە قونێر دان هیـواو کەڵکەڵەیە کە ئەنجامی نی‌یە .

ابن سیریـن دەڵێ کە بیینێ ـی هەیە : ماڵی زۆر دەبێ . کەبیینێ ـی دەربووەو خووێنی لێ هات ، هێندێك لەماڵی وی لەناو دەچێ . مغربی دەڵێ کەبیینێ کێم وهەوا لەقوونێرە کەی‌دێ ودەیەڕێ : هێندەی‌وی‌ماڵی نارەوای دەست دەکەوێ .

قیرِ . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەونەدا : ڕۆزی‌یە . کەبیینێ ـی هەیە بەقەدوی ماڵی دەست دەکەوێ . کەبیینێ قیرِی خووارد : چتی نارەوا دەخووات .

قیامەت : بڕوانە ( ئەسلان ) .



کارەبا ( مووررووی – ) ابن سیرین دەڵێ دیتنی – لە خەونیدا : نەخۆشی‌یە .
کەبیبنێ –ی زۆر هەیە : بەرەنج و سەختی ماڵ وسودی دەستدە کەوێ
کار کەنار ( لێکەوتوو « معزول » ) کە کەسێك ببینێ لـەکار کەوتووە یـا
لێخراوە : ژنە کەی بەرەڵا دە کات ، کە نەشیبێ : زیانی پێدە گات .
کار گ لە خەوندا : ژنێکی خراپی وایە کە خێری پێوە نیە . کە – ی زۆر
ببێنێ : ماڵ وبەهرەیە کی زۆرە لەژنێکی‌یەوە بەوی دە گات . کرمانی
دەڵێ کە –ی گەورەبێ : کورە ؛ کە گچکە بێ : کچی دەبێ . کار گ :
ژیانێکی خۆرِسکی‌یە . خوواردنی کار گ : مەر گێکی لەبـرِ- رِایی‌و
سەختە .
کاروان . ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ لە گەڵ –ێکی لە رِێگایە دابوو : سودە
کە لە – ە کەدا سووار بێ سوودە . کەببینێ لە – ە کەدا سووارە : بـە
ئاوات دە گا کە پیادە بێ بەپێچەوانەیە . ابراهیم دەڵێ کەببینێ لە گەڵ
– بەرەو ماڵ دەرِۆیشتەوە کاری بەستراوی لە سەر دە کرێتەوە .
کارێز ابن سیرین دەڵێ کەببینێ لەشووێنێکی‌دا کارێزی هەڵدە کەند : فێڵ
لەنزیکانی خۆی دە کات بەو مەرجە کەئاو نەهاتبێ . کە هـاتبێ : ژن
هێنانە یامێرد کردنە .
کاریلە . کە – ی بدەنێ یایسکرێ یادەستی کەوێ : منداڵێکی بێ بەخێری
دەبێ کە کاریلەی بکوژێتەوە : منداڵە کەی دەمرێ .
کاسە ابن سیرین دەڵێ ؛ کە کاسەیێکی پرِ لەئاو یا کولاوی هـەبەو لێی
خوواردووە ژنێ دێنێ یا کەنیزە کێکی دە کرێ و منداڵێکی بارێز.
گاری دەبێ . کەببینێ –ێکی داربێ هەیە و پرِە لەخوواردەمەنی :

لە کۆچێ دا سوودی دەستە کەوێ بە ڕۆزی‌یەوە ، بەڵان ـ ی بەتاڵ :
نیشانەی داماوی‌یە . دیتنی ـ لەخەوندا : نیشانەی نۆ کەرێکە خێری لە
دەستبێ . کاسەی زێڕ و زێوی بەتاڵ : ڕۆزی‌نارەوایە . ـی مس‌وقەڵابی:
ڕۆزی‌یە . ـی شووشە ژنە . ابراهیم دەڵێ کەلەناو ـ دا چتێکی خۆش
هەبێ‌سوودە ، هی‌ترش : خەمە. دیتنی کاسەی‌بەتاڵ : داماوی‌ونابووتی‌یە.
کاڵەك ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : نەخۆشی‌یە . ـ ی سەوز لە هی زەرد
باشترە و هی گەورەش لەهی گچکە باشترە . خواردنی زیانی نیە .
کرمانی دەڵێ ـ لە کاتی خۆیدا شیرین بێ و بیخوا : خەم و خەفەت
نامێنێ چەندەی لەپاش بەجێ بێنێ ; هێندەی خەم و خەفەت دەمێنێ .
کەبیبنێ ـی زۆر هەیە ولە پێشیشی دانراوە ; تووشی خەم و خەفەت
دەبێ و چارەی بێ نـا کرێ . هێندێکیش دەڵێن خواردنی ـ زەرەر و
زیانی ماڵی‌یە . کە یەکێکی‌تر بیخووا : هومێد و سەر کەوتنی تەواوە .
کڕینی کاڵەك : وێنەی یە کێك لە دۆستە کانی بێ دەگات
کانی ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : گەورەیی و جوامێری وڕەندی‌یە
کە ئاوە کەی خۆش و بۆنخۆشبێ . کە لێڵ و ناخۆش و بۆ گـەن بێ ;
خەم و نەخۆشی‌یە . کەبیبنێ ئاوی کانی‌یە کەی پتربوو : نیشانەی وەیـە
کە لەوی‌دا ڕێز و پایە و جوامێری سەر هەڵدەدا کە ئاوی ـیە کە ڕوو
لە کەمی بکات : بەپێچەوانەیە . کرمانی دەڵێ کە لە ماڵی‌وی‌یا لەدو کانی
وی‌دا کانی پەیدا بێ تووشی خەم و گریان دەبێ ، کە ئاوە کەشی لێڵ
و ناخۆشبێ خەم و خەفەتێکی سەخت تـرە .
کـە بیبنـێ دەسـت و ڕووی بـەوی دەشـووشـت —

کەنۆکەر بێ ؛ ئازاد دەبێ . کەخەمگین بێ . کەبەخۆش بێ : چاك دەبێتەوە . کەقەرزداریش بێ ؛ قەرزو قۆلەی بۆ دەدرێتەوە . ئاوی ڕاوەستاو لە ئاوی ڕەوان سوودی کەمترە . هێندێکیش دەڵێن ئاوی ڕاوەستاو لەکانیدا ؛ خێرو چاکەیە . بەڵام هی ڕەوان : خەم و خەفەتە کاول ئەگەر خۆت لەناو کاولێکیدا ببینی ؛ نیشانەی خرابی کارو کارەساتە کەبەك ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا ـ دیتن : نیشانەی ئاتاجیو دەستکورتیە کەببینێ پیاوێك لەخەونیدا نانی کەبەکی دەخوارد ؛ لە وولاتیدا قاتی و قڕی پەیدا دەبێ . کەببینێ ـی لەماڵیدا فڕێداتە دەرێ یابە کەسێکی بدات ؛ لەو وولاتیدا قاتیو قڕی و گرانی پەیدا نابێ .

کەپر دیتنی کەپر : ناوبانگی درۆزنانەیە کە بە زۆر بەخۆوە بەسترابێ .

کەپۆ دیتنی کەپۆ : نیشانەی پایەو جێگایە . هەر کەمیو پترێکی لە ویدا ببینرێت نیشانەی پایەو پلەی خەون دیتووە . کە کەپۆی کوورت بووبێ نیشانەی کەمی ڕێزو پایەی ویە . کە کەپۆی کەوتبێ ؛ لە ڕێز و پایە دەکەوێ . کە تفنکی فش بووبێ : ڕۆژی ڕوو لە زۆری دەکا و لە مرۆیەکی گەورەشەوە سوودی دەستدەکەوێ . کە جانەوەرێك لە ـی وی بێتە دەرێ وەکوو کرمو مێشو چتی وا : منداڵی دەبێ . کە ـ ی کونو مەهار کرابێ : سەر بۆ خەڵکی شۆڕ دەکات وەیا لەگەڵ ژنێکی گەورە دەست تێکەڵاو دەکاتو ماڵو بەهرەشی لێ دەستدەکەوێ .

کە کونی تفنکی گیرا بێ و پشووی پێدا نەیەت : دەرگای کاری لێ دەبەسترێت . کەبە ـ قسە بکا ؛ سامانیلەناو دەچێ . کەپێستی سەری ـی

نەمابێ : زیانی پێ دەگات . خوێن لە کەپۆ هاتن : سوودە و زیانیشە .
کە هەردووك تەنکی بووبێتە یەك لە گەڵ ژنێکی ژیر کۆ دەبێتەوە .
کەسەری کەپۆی برابێ : کوری خۆی سوننەت دەکا لە وانەشە بابە و
ماڵی ڕوو لە کەمی بکا . کە خوێنی کەپۆی لەشی خووێناوی بکات
ماڵی نارەوای پێدەگات . کە خوێنی پەیت و کەم لە کەپۆی بێتە دەرێ:
خێزانی کە ئاووس بێ بەر داوێ . کە ـی بکەوێتە سەر زەوی : کچی
دەبێ . کەبیبنێ ـی خۆی دەشووا : ژنی فریبو دەدرێ . کەباڵندە لە ـی
بێتە دەرێ : وولاخەکەی دەزێ . هەڵامسانی ـ : ماڵو سامانە . بۆنی
خۆش : منداڵی باشە . کە خۆی بەبێ ـ ببینێ : خزمێکی دەمرێ
کە دوو کەپۆی هەبێ : نیشانەی ناکۆکی نێوانی وی و خێزانی یە ..
کەتان ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لە خەونداا : ماڵی ڕەوایە . سوودی وی
لە لۆ کە کەمترە .
کەتیرە ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : ماڵ لە چرووك ئەستاندنە .
صادقیش دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : هونەرو سوودو درۆباری بڕقازانجە
کەچەڵ ابن سیرین دەڵێ کە لە خەونیدا ببینێ بۆتە هاوڕەمی ـێکی ،
لە گەڵ گەورەیێکی دۆستایەتی پەیدا دەکا . کە ـ ببینێ سەری تووکی
هێناوەتەوە : کەچەڵ دەبێ .
کەر دانیاڵ دەڵێ لە خەوندا ـ دیتن مایەی بەختاوەری و گەورەیی یە
چاکەوخراپەی دە گەرێتەوە سەر بەختی خەون دیتوو . کەببینێ ـی هەبو
یا هاتە جێگای وی گرتی و بەستیەوە ؛ دەرگای خێراتی لە سەر
دەکرێتەوەو لەخەمو خەفەت ڕزگای دێت کە نوستبێ : سەرکەوتنو
کامەرانی یە لەوروچانو بشوو درێژی وی دا کە ـ لەراست تۆدا بزەرێ

ناپاکی لەڕاست تۆ دا دەکرێ و باش نیە . ( کە کەری بە بار کراوی بینێ ) : سوودێکی زۆرە . کڕینی ـ : شادمانی و خۆشحاڵی‌یە لەخانەـ وادەدا . سوواربوونی ـ لەفیز وهەوای بێ‌جێ خۆت دوورخەوە . لەسواری ـێ بەربوونەوە : پارەو سامان لە کیس چوونە لە بەر نەزانی و گێلی کە کەر لووشکەیەکی لێ‌بدات : ئابڕو و نامووس چـوون و بەد ناوی‌یە . کە چەند لووشکەیەکی لێ بدات : دەبێ زۆر ئـاگادار و پارێزگاری ژیانی بێ . دیتنی ـی زۆر : ماڵ وبەهرەیەکی زۆرە . باشترین کەرێکی لە خەون دا ببینرێت : هی گوێدرێژ و فـەرمانبەرە . ابن سیرین دەڵێ کەبینێ سوواری ـێکی ڕەش بووە : گەورەو مەزن دەبێ . سوواری ـی سپی بوون : بەپایەو ڕێز دەگات . هی ـی ڕەش : دەبێتە پارێزگار و پیاوی باش‌و خێر و خۆشی هەردوو دونیای دەســت دەکەوێ . کەسوواری کەرێکی سوور بوو بێ ئـاسوودە و خۆش گوزەران دەبێ . سوواری کەری‌زەرد بوون : نەخۆشی‌یە . کە کەری وی مێ‌و ئاووس بێ : پتر ئومێد بەخێر و بەهرە و سوود و شادمـانی دەکرێت . کەبینێ گۆشتی ـی دەخوارد : ماڵ‌و بەهرەی‌لە بازرگانیتی دەستدەکەوێ . کە کەری خۆی بکووژێ و لەگۆشتەکەشی بخوات : ماڵی خۆی دەچووێنێ . کە سوواری ـێ‌بێ‌و ـە کە لەژێرویدا بمرێ: زوو دەمرێ . کەبینێ ـە کەی وی مردووە : ماڵ‌و سامانی لەناودەچێ کە لەسوواری ـێکی‌بەرێتە خواری‌و هی‌خۆی نەبێ : زیان‌و ئازاری لەیەکێکی‌یەوە پێدەگات . کە لە سوواری ـێ دابەزی و جارێکی دی سوواری نەبێتەوە : مراز و ئاواتێکی بیخوازێ جێ بە جێ دەبێ . کە کەرە کەی‌خۆی لەگەڵ یەکێکی‌تر گۆڕی‌یەوە : کاروباری تێکدەچێ کەـی بکڕێ‌و نرخەکەی نەدات خێرێکی‌دەبینێ بەهۆی دووانێکەوە

کەبە گەورەییەکی بلێ . کە کەرێکی بە کچاوی هەبێ یاچاوی کز بێ:
شلەژانی کاروباری وی‌یە لەرێگای گوزەراندا . کە کەرە کەی هەر-
دووك چاوی نەبێ : ماڵێکی کە هەیەتی لەناو دەچێ . کەچووار پەلی
-ە کەی درێژ بێ : دیارە فرۆشی زۆر دەبێ . کەـە کەی بتۆپێ یالەسەر
-ێکی تر سووار بێ یاهی خـۆی بفرۆشێ یاکەرێکی تـر بکڕێ :
گوزەرانی وی لەبارێکی‌یەوە دەگۆڕدرێتە سەربارێکی تر . کەـە کەی
بێتە ووشتر یا ئەسپ : گوزەرانی دەکەوێتە سەر پادشای بەڵام بەبێ
داوی . کەـە کەی بێتە مەڕ : ماڵی ڕەوایە . کەبێتە باڵندە : سوودی
لەچێتێکی دایە کەبەندیواری بەباڵندە کەوە هەبێ . کە کەرە کەی دز
ببات : ژنە کەی بەداوێن پیسی ناو دەردەکات و لێك جووابەز دەبنەوە
کە کەرە کەی باش و توووانا بێ و باش باری ببات : کاروباری گیتی لەسەر
ڕووی وی ئاسان دەبێ . کەبەپێچەوانەی ببینێ : ئەویش بەپێچەوانەیە.
کەباری گرانی لەسەر پشتی کەرە کەی بار کردبێ و خۆشی لەسەری
سووار بووبێ : بێ ئـەندازە دەوڵەمەند دەبێ و نازانی ماڵی چەنـدە .
کەکاری خراپ لەگەڵ ـە کەی بکا ئاواتی پێك دێ . کە کەرە کەی لەپشتی
خـۆی بکات و لەئاوێ‌ی بیارێنێتەوە . نیشانەی هێزی بارو گەورەیی
بەخت و هاتە . کەببینێ سوواری کەرێکی بووەو لەو دەمەی‌دا کەرە کە
دەزەڕێ : نیشـانەی بـەد خوویی ژنەکەیەتی کە کەرە کەی لەگەل
-ێکی تر بگۆڕێتەوەو لەهی خۆی خراپتر بێ .باری خراپتر دەبێ ،
بەڵام کەلەهی خۆی باش‌تر بێ : باریشی باش و ماڵیشی زۆرتر دەبێ .
کەـی خۆی بەئەسپێکی یابەووشترێکی یابەئێسترێکی بگۆڕێتەوە

لـەپادشاوە سوودی پێ دەگات . ( کەرەکەی کـە بـە بـاڵندەیێکـی بکۆڕێتەوە ) : بە قەدەر قەدر و نرخی باڵندەکەی سوودی پێدەگات .
( کە لەخەونیدا خۆی بوو بێتە کەر) : دەرگای ڕۆزی لەسەر دە کرێتەوە
کەرەستەی وێنەگرتن ( قاپ و شاسی و دووربین ) : کارەساتی نا بە دڵ و پەشیمانی لە سەر کێشانە .

کەرەووز ابن سیرین دەڵێ کە لە خەونیدا بەبێ کات کەرەوزی بخوات : خەمگین و هەژار دەبێ . هێندێکیش دەڵێن کە لەخەونیدا ـ ی ببینێ و نەیخووا : خەمی کەمتر دەبێ

کەروێشك ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا ـ دیتن : گەندە ، ژنە ؛ کەنیزە کە کەببینێ ـی هەیە یا بەکێك داویە بەوی : ژنێکی گەندە دێنێ یـا کەنیزەکێکی خراپ دە کڕێ . ( کەببینێ کەوڵی ـ ی پۆشیوە یا لـە گۆشتی وی دەخوات ) : چتێکی کەمی لـە ژنانەوە پێدەگات . ( کە ببینێ فەرخەی ـی هەیە ) : تووشی بارێکیبرِ ڕەنج دێت هێندێکیش دەڵێن خەم و خەفەتی وی لە مندالانە . جابر دەڵێ ـ لە خەوندا ژنی پارێزگارو ئایین دارە . ( کە کەسێك ببینێ لەماڵیدا هەیە ) : ژنێکی بەو جۆرەی دەبێ . ( پێست وئێسکی ـ لەخەوندا ) : ماڵوقازانجێکی کەمە . کەببینێ ـی کوژت : بەهۆی خێزانیەوە تووشی کارەساتێکی دێ

کەڕِی ابن سیرین دەڵێ ( ـ لەخەوندا خراپەیە لەراست ئایندا و بەئاوات نەگەیشتنە ابراهیم دەڵێ ( دیتنی ـ لە خەوندا ) نیشانەی بێبینایی و بەسترانی کاروبارییەتی . ( کە کەرێك ببینێ کەدەبێ) بەئاوات دەگا

کەژ (قەز) : ئاوریشمی خاوە ، بڕوانە ( ئاوریشم ) .

کەژاوە . ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ لەناو ـ دا دانیشتووەو لەسەر پشتی ئەسپو ووشتری بێو دەڕۆیشت : سوودو گەورەیی‌یە . کە کەژاوە کە بکەوێ : بەپێچەوانە .

کەشتی . دیتنی ـ : خۆشیو شادمانیو گەڕانو سەیرانە لەئاوێ‌دا . کەشتی لەئاوی پاکدا بێ : دڵنیاییو هێمنی‌یە لەکاراندا . بەڵام ـ لەئاوێ شلوێ گرفتاریو کارەساتە . ـ کەوەر بکەرێت ، نەخۆشی‌یەکی سەختە . ( ئەگەر ـ تووشت بێ ) : خۆشەویستێکت تووش‌دێ . دانیالیش‌دەڵێ ( دیتنی ـ ) : خەم وخەفەتە بەتایبەتی کە لە کەشتی دا نەیەتە دەرێ و لە دەریایێ دا بمێنێتەوە . ابن سیرین دەڵێ ( کەلە خەونی‌دا ببینێ بەساخی و خۆشی لە ـ هاتە دەرەوە ) ، لە خەمان ڕزگار دەبێ . ( کە ببینێ کەشتی وی شکاوە ) : کارەساتە . ( کە لە کەشتی‌دا لە گەڵ کووتاڵی بە ناو دەریایێ دا بڕوات ) : کۆچێکی دەکا و ماڵێکی زۆری دەست دەکەوێ . ( کە خۆی لە ناو کەشتی‌دا ببینێ کە لە ناو دەریایێ‌دا ڕاوەستابێ و نەڕوات) ، لە کۆچ ( سفر ) دا دەمێنێتەوە . ابراهیم دەڵێ کە ببینێ لە ناو کەشتی دانیشتووەو بایەك بێ و کەشتی ببات ، لە خەمان ڕزگار دەبێ . ( کە کەشتی لەناو دەریایێ‌دا ڕاوەستابێ و شەپۆلان لە هەموو لایەکی‌یەوە ڕووی تێ کەن ) تووشی خەمێکی بقە دار دێت ( کە لەناو کەشتی‌دا دانیشتبێ و لە دەریایە ترسابێ ) ، لە پادشای نزیك دەکەوێتەوە و ماڵ کۆ دەکاتەوە . ( کە کەشتی نقووم بێ ) : لەپادشاوە

هێزی بۆ دەکات. کەشتی لەئاوی ڕەواندا : کۆچە بەڵان زوو دێتەوە
کەشك . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا دیتن : خەم و خەفەتە . کە بیینی ـی
دەخوارد : قەرزدار دەبێو بەو هۆیەوە خەمگین دەبێ .
کەشکەك ابن سیرین دەڵێ کەبیینی عنابو وەنەوشەوشە کری لەکەشکەکی
کردووەو دەیخووارد : ماڵی ڕەوای دەستدەکەوێو لەخەم ڕزگاردەبێ
کەبیینی ناتوانی بیخووات : بەپێچەوانەیە .
کەڵەباب : هەواو فیزە . هێندێکیش دەڵێن کەگووێی لەدەنگی کەڵەبابی
بێت : ڕێگای چاکەو خێراتی لێ دەگیرێ . کەسێکی گووێی لەدەنگی ـی بێ : دەبێ دەژ (احتیاط) لەدەست نەدات . دیتنی شەڕە ـ :
پیلەو کێشەکێشی نێوانی ژن و پیاوانە ابن سیرین دەڵێ کە بیینی
ـی هەیە : پیاوێکی کەنۆکەر زادەی خۆیەتی بەسەریدا زاڵ دەبێ
کەـی بکوژێ : بەسەر نۆکەرەکەی خۆی دا زاڵ دەبێ . کەلەکەڵ
ـی شەڕێ بکا : لەگەڵ بێگانەیێکی دوژمنایەتی دەکات . کەلە ـەوە
ئازاری بێ بکات : لەبێگانەیێکەوە زیـانی بێ دەکات کەجووجکە
کەڵەبایێکی دەستکەوێ : نۆکەرێکی گچکەی دەست دەکەوێ یـا
کوڕێکی گچکەی لەکارەکەرێکی دەبێ . کەـ خۆی پێدادا : لـە
بەکێکەوە خەمو خەفەتی بێ دەکات . گونی ـ کوڕە . کەجووجکە
ـێکی بدزێ بەسەر کەڕێکی گەورەدا زاڵ دەبێ کەبیینی هێلکەی
ـی دەستکەوتو شکاندی نیشانەی ئەوەیە بەسەر گەورەیا گچکەیێکیدا
زاڵ دەبێ .
کەڵەکە : بەژن دانراوە ـ ابن سیرین دەڵێ کەـی لای چەپی هەڵاوسابێ :
ژن و کەنیزەکی وی هەردو کیان ئاووس دەبن . کەـی وی سوور

هەلکەرابێ‌و پارچە گۆشتێکی خوورێناوی لە ـی بکەوێ : ژنە کەی بەرداوێ . لە گەرهەردووەستی لەسەرـدابنێ: توشی خەم‌وخەفەتێکی سەخت‌دێ . کەتێسکێکی کەلە کەی شکابێ : لەلایەن‌دایك‌و باوك‌یاخێزانی‌یەوەخەفەتی بێ دە گات . کە کەلە کەی کون بێ‌و گەوهەر یادورێکی لێ بکەوێ : منداڵێکی زانای دەبێ . جابر دەڵێ کە ـی زۆر هەبێ : ژن‌و کەنیزەکی زۆر دەبێ . کەمار لەـی بێتە دەرێ : منداڵی دەبێ . ابن‌سیرین دەڵێ کەلە کە : پزیشکە . کەبینێ ـ ی بۆ لای ڕیخۆڵە کانی ڕۆچووە : خێرو بەختەوەری یە .

کەلەم . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : سوودە لەلایەن ژنانەوە . ـی لێ‌نراو لە هی کاڵ و خاو باشترە . کەـی بخوا : لەژنێکی‌یەوە سوودی دەست دە کەوێ .

کەمتیار . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : ژنێکی پیس و بەڵۆس و ناشیرینە . کەبینێ ـێك لەماڵی وی‌دا بەسترابۆوە : ژنێکی پیس و ناشیرین دەخووازێ .

کەم‌و کووڕی . کەبینێ لەلەشی وی‌دا ـ پەیدا بووە : بەئەندازەی وی زیان بەماڵی دە گات کەبینێ ـ کەوتە ماڵی وی : ڕادەمێنێ (سەرسام دەبێ)

کەنگر . ابن سیرین دەڵێ کەلەخەونی‌دا بینێ ـی هەیەو لێشی خواردووە تووشی خەمان دێ کەنەیخووا : خەمی نایێ .

کەنیزەك . ابراهیم دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : ماڵە . کەبینێ ـێکی کڕی: ماڵێ دەست دە کەوێ . کەـی بفرۆشێ : کەم و کووڕی ماڵە .

کەو . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەلەخەونی‌دا ـی بینێ : ژنی جووانە . کەبینێ کەوێکی گرت : ژنێکی دێنێ یا کەنیزەکێکی دە کڕێ . کە گۆشتی

کەوی بخووا : بەرگێکی نـووێی دەست دەکەوێ . کەگەرووی
ـێکی ببڕێ : کچێنی کچێکی لادەبات . جابر دەڵێ کەوی نێر : کوڕە
وەی مێش ژنو کەنیزەکێکی لاسارن . کەبینێ کەوی لەدەستی فرِی
ژنەکەی بەر دەدات و یا کەنیزەکەکەی هەڵدێ .

کەوا. ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ئەوای نووێی لەبەر کردووەو لەبارچەی
لۆکەیی‌یە : لەخام رِزگار دەبێ . کەـیەکەی لەناوریشم بێ : لەکەو.
رەێکەوە سوود دەبینێ . ابراهیم دەڵێ کە لە خەونی دا کەوای سپی
پۆشێ : رِووناکایی‌یە . هی زەرد : نەخۆشی‌یە : ـی سوور و شـین
قازانجە ، کە کەوای رِەش و کۆن بێ : ژنی‌بەرەڵا دەکات . کەـیەکەی
لەکەوڵ بێ : ژنێکی دەوڵەمەند دێنێ و سوودی لێ دەبینێ .

کەوانە ابن سیرین دەڵێ کەبینێ تیری لە ناو ـ ی دایە : لەکۆچێ دا سوود
دەبینێ . کەیەکێك ـی بداتێ کورێك یا برایەکی دەبێ کـە ببینێ
تیری لە ـی ئاوێت : رِاست و پووچ دەدوێ . کە ـ ی بفرۆشێ یا بیدا
بەکەسێکی یا لەناو بچێ : لە ژنەکەی خۆی جووێ دەبێتەوە

ابراهیم دەڵێ کەبینێ بەدەستی خۆی تیر و کـەوانی دروست کـرد :
کاروباری رِێکدەکەون کە کەوانەکەی بەپارە بفرۆشێ : دیارە پارەی
پێ لە ئاین باشترە . کە بەچتێکی تری بفرۆشێ : ئاواتی پێك دێ . کە
ببینێ ـ کەی لەکەوانەدانی دایە : دەمرێ

کەوانەی هەللاجی ابن سیرین دەڵێ کەبینێ کەوانەی هەللاجی هـەیە :
درو رِوو دەبێ . هێندێکیش دەڵێن ژنێکی لاسار دەخوازێ کـە
کەوانەی هەللاجی‌یە کەی لەناو بچێ : لەژنێکی وا جوێ دەبێتەوە .

کەوتن بەسەر رِوودا کەوتن : لەشەرِو دوژمنایەتی‌دا تێشکانە .
لەشوێنێکی‌بەرزەوە کەوەتنە خوواری بـە ئـاوات نـەگـەیشتنە .

ڕەنجو ئازاریشەو باری خراپ دەبێ . کەلەو کەوتنەدا لەشی برینـدار بێو خووێنی لێ بێ : زیانی ماڵێیە . کەهەڵخلیسکێو بکەوێ : ڕەنج وئازاری بێ دەگات . کەلەهەڵخلیسکانو کەوتنێدا ئازاری بێ نەگات ئاسانترە . کەمارو دووپشك لەئاستانەی وێیەوە بکەوێتە سەر زەوی : لەلایەن میر و گەورانەوە زیان و خـەفەتی پێ دەگات . کەلەخەونیدا سەربان یادیواری بەسەردا بکەوێ : ماڵو سامانی دەستدەکەوێ زۆر زۆر پتر لەوەی کەچاوەڕێی بێو بەوهۆیەوە شادو کەیفخۆش دەبێ .

کەوش ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : ژنە ، کەبینێ ـێکی تازەی لەپێ دایـە : ژنێکی دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکڕێ . کەـە کەی ڕەش بێ : ژنەکە دەوڵەمەند دەبێ . کەسەوز بێ : ژنەکە ئابڕووەـەندو هاودەم دەبێ . کەزەرد بێ : ژنەکە نەخۆش دەبێ . کەـە کەی لێ وون بێو یالێی بستێنێ : خەمو زیانی بێ دەگات .

کەوگیر . ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـی خـاوێنی هەیە کارە کەرێکی ئایندارە . کەـی بەکۆنی یاشکاوی بینێ : بەپێچەوانەیە .

کەوڵ : بڕوانە لاپەڕە (٢٢٣) .

کتێب : بڕوانە ( پەڕتووك ) .

کچ . ابن سیرین دەڵێ کچ لەخەوندا شادمانییە . کەبینێ ـ ێکی بووە یایەکێك داویە بەوی وەیا کەسێك بەوی بەخشیوە : بەپێی جووانیو چاکی کچەکە ماڵو شادیو بەهرەی دەست دەکەوێ . کەبینێ ـە کە مردووە : واتایەکەی بەپێچەوانەی سەرەوەیە . کرمانی دەڵێ کەبینێ کچی وی چڵکن و کەم و کووری دارە : نیشانەی خـەم و خەفەتە .

کەبینی کچە کەی بە باوەشی هەلگرتووە و دەیبا : سوود و کەلکە . کەبینی کچی خۆی داوە بە کەسێکی : لەوەوە شادمانی بەو کەسەدە گا

کچێنی ابن سیرین دەڵێ کەبینی ئافرەتێکی کچێنی داری مارە کردووە : مالی نارەوای دەستدە کەوێ . ئەگەر ئافرەتە کە بندار نەبێو لەخەونی دا وا بینی کە بندارە : نیشانەی داپۆشینی نامووسی وی یـە . کرمـانی دەڵێ ئەگەر پیاوێك بینی کە کچێنی ئافرەتێکی بردووە : لـەو ساڵیدا ژنی دێنی یا کەنیزەکێکی دە کرێ .

کەوڵ (قاپووتێکە لە کەوڵی دروست کرابێ) ابن سیرین دەڵێ کەلەزستانی ـی لەبەر کات : رۆزێکی بۆ دەگات . کەهاوینیش بێ هەر رۆزیە بەلاّن لەئەنجامدا خەمناك دەبێ . کەبینی ـی بەرخ یاکارێلەی هەیە : ژنێکی دەوڵەمەندی دەبێو مالیشی لێدەستدە کەوێ . کەـی سمۆرەی پۆشیبێ : ژنێکیدەوڵەمەند دێنێ . کەـی رێویێکیتازە لەبەر بکات : ژنێکی دەوڵەمەندو پارێزگار دێنێ بەلاّن بەنازو لەخشتە بەرە . کەـی کەروێشکی بێ : ژنێکی بێ کارەو خراپ دێنێو ئازاری لێ دەبینێ . کەـی پشیلەی بێ : ژنێکی جووانو دزو ناپاك دێنێ کە کەوڵە کەی بسووتێ یابدرێ : کەم و کووری مالّ و خەفەتە .

کراس . ـی دراو : دەوڵەمەندی و سامانە . هی تازە : ئازار و کۆسپەی مالّو سامانە . ـی سپی : ئایینە . ـی تازەو فراوان لەبەر کردن : چاکی وباشی کارو بارە . کەبینی کەمێك لەـە کەی دراوە لەچاکەو خراپەدا ناوونجی یە . کەـە کەی کۆن و چلکن بێ : تووشی دەروێشیو خەمو بێ چارەیی دەبێو لەوانەشە کە خەون بین لەناو بچێ کەپادشا کراسی خۆی بداتێو لەبەریشی بکا : پادشایەتی لەوی وەردە گرێ . ـی تەنگ گوزەرانێکی تەنگ و سەختە کرمانی دەڵێ کەسێکی بینی کەـی

تازەو گوشادی لەبەر کردووە ; نیشانەی باشی کاروباری‌یەتی . کەبینی
- و دەرپێی کۆن بووە ; کەدەولەمەند بێ ڕوو لەهەژاری دەکا و
تووشی خەمو خەفەتان دێت . جابری ڕۆژ ئاوایی دەڵێ کەسێکی کراسی
نووێو فراوان لەبەر بکات ; گوزەران بۆوی گوشاد دەبێ . کەتەنگ
بێ : گوزەرانیشی تەنگ دەبێ . کە کراسی دڕابێ : ڕازی ئاشکرا
دەبێ . کە-ی بێ ئێخەو بێ قۆڵ بێو لەبەری بکا ; مەرگی نزیکە .
کە کراسی درێژ بێ ; کاروباری خراپ دەبێ و ئاواتیشی پێکدێ . کە
پێخەی کراسەکەی لەپشتەوە بێ : بوختانی پێ دەکرێ . کە کراسی
خووێناوی بەدەستەوە بێ : ڕۆژگارێکی درێژ لەخەم و خەفەت دا
دەمێنێتەوە . کراسی دڕاو لەبەر کردن : ڕاز ئاشکرا بوونەو کار و
باریشی پەرا گەندە دەبێ .

کڕنۆش ( سجدە ) ابن سیرین دەڵێ کە کەسێك ببینێ -ی بۆ خوای دەبرد
بەسەر پیاوێکی گەورە دا زاڵ دەبێ . کە - ی بۆیەکێکی تر ببات
هەرپایەکی هەیەتی پێك نایەت .

کرێکار . ابن سیرین دەڵێ کە - ان لەماڵی وی‌دا کار بکەن ; دوژمنایەتی
لەگەڵ یەکێکی دەکات . کەبینی لەماڵی یەکێکی تردا -ی دەکرد ;
تووشی کارێکی سەخت دێو خاوەند ماڵە کەش لەگەڵ یەکێکی تر
توشی دوژمنایەتی‌دێ . کە- لەماڵی‌وی‌داخۆڵی‌بەنە دەرەوە : بەپێچەوانەیە
کرێنامە — مۆر کردن ; ئازادی لەدەست دانە . - بەمۆر کردن دان ;
تۆکەرایەتیکی دەمەکی‌یە .

کڕین‌و فرۆشتن . ابن سیرین دەڵێ - لەخەو‌ندا ; خراپە ئینجا بەبارە بێ یا
بەگۆڕینەوەی بابەت . کە کەسێك ئەوی بفرۆشێ کارو باری ئاڵۆز
دەبێ . کرمانی دەڵێ بارتەقای نرخی کار چتێکی دەست دەکەوێ .

کشتو کاڵ. کارێکی پڕ ئەرکو پڕ سوودە ، خزمەتێکە لەلایەن یەکێکەوە بۆ خەون دیتوو دەکرێت. ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا. پشت بەخودا ئەسپاردنو ڕۆزی ڕەوایە. ابراهیم دەڵێ کەدیتی زەوی‌قەڵشی وتۆوی پێوە کردو چاندیو کۆی کردەوە : بەهرەیێکی زۆری دەست دەکەوێ. کەبینی هەرچیەکی چاندوویەتی هیچی لێ پەیدا نەبوو : مایەی خەم و خەفەتە. جابر دەڵێ کەبینی گەنمی چاندووە : بەهـرەی دەستدەکەوێ. کەبینی جۆی چاندووە : ڕۆزێکی زۆرو ماڵێکی بێ ئەژماری دەست دەکەوێ. ابن سیرین دەڵێ کەبینی لەزەوی خۆیدا تۆی دەچێنێ ؛ کارو باری چاك دەبێ. کەبینی چـاندراوی وی شین بووە : ڕۆزی زۆر دەبێ .

کشمیش. ابن سیرین دەڵێ کەبینی ـ ی هەیەو خوواردی : بەقـەد وی سوودی دەست دەکەوێ. کە ـی بدا بەکەسێکی ؛ ئاسوودەیی بـەو دەگەیەنی. ابراهیم دەڵێ کەبینی بەخەروار ـی بردەوە ماڵێ ؛ ماڵێکی زۆری دەست دەکەوێ .

کفن : بڕوانە ( خەڵات ) .

کل. ابن سیرین دەڵێ ـ ماڵە. کەبینی کلی‌لەچاوی کێشا ؛ خێری ئاینی‌یە. کە ـ لەچاو کردن بۆ جووانی بێ خۆی بەجـووانی نیشانی خەڵکی دەدات. هێندێکیش دەڵێن ـ لەخەوندا ؛ دەستکەوتنی ڕێگای ڕاستو ڕەوایە. جعفری‌صادق‌دەڵێ ـ فرۆشی لەخەوندا ؛ پیاوێکە بەرژەوەندی ئاینی دەوێ چونکو چاو ئاینە ، کـلیش ڕوونـاکی‌یـە کـە کـلی بەرێتێ : سوودە

کڵاو ابن سیرین دەڵێ کە لەخەوندا ـ ببینرێت : نیشانەی پلە و گەورەیی‌یە بەپێی نرخی کڵاوەکە. کە ـی جەنگاوەران لەسەر بکات : پیرۆزی‌یە

کڵاو ( پاشماوەی لاپەرە « ٢٢٥ » )

بەسەر دوژمناندا . کە کڵاوی موغان لە سەر بنێ ڕێز و شکۆی ئەم دونیایەی دەستە کەوێ بەڵان لە ئاین دا بێ تین دەبێ . کە کـڵاوی پادشای لە سەر بێ : ڕێزو پایەی دەستە کەوێ . کە مێزەری لەسەر-ی دابنێ : ڕازی خۆی لە خەڵکی دەشارێتەوە . کە -ی ئاوریشمی لە سەر بێ : خێرە . -ی زێڕین : ماڵە . کە -ی لە مرواری ببینێ : خۆشەویست دەبێ . کە کڵاوی ئاسنین بێ : لە لای پاوشاوە هێزی بێ دەدرێ .

ابراهیم دەڵێ کە کڵاوی دارین بێ : خۆی لەلای خەڵکی نزم دەبینێ و چتی وێنە چوو و درۆ دەڵێ . کە لە زستانێدا کڵاوی هاوینی لە سەر بێ : بە ئاوات دەگات . کە کڵاوی ڕەشی لە سەر بێ بەو مەرجە کە لـە کاتی بێداریێتیش دا هەر ئەوی لە سەر بێ : تووشی خێرو قازانجێ دێت کە کڵاوی لەسەر بکەوێتە خوارێ : ئەگەر دە کەوێ یا تووشی خەمێکی سەخت دێ . کە -ی تازە لە سەر سەری خۆی ببینێ : پلەی بـەرز تـر دەبێ . کە کۆن بێ : بە پێچەوانەیـە .

کڵاو زرێ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ -ی پۆڵایینی لە سەرە : پـایـەو هێزی وی پتردەبێ . کە -ی لە سەری هەڵگرێ : هێز و پایەی ڕوو لە نزمیدەکات . کرمانی دەڵێ کەسێکی -ی لەسەریخۆی بنێ : نیشانەی منداڵیزیرە کە . مغربی دەڵێ ئەگەر کەسێك ببینێ کە خۆی -ی پۆڵای تروسکەداری لە سەرە : لە گەورەیێکەوە هێزو شان و شکۆی دەست دە کەوێ . کە -ی خۆیبدا بەیە کێکی : ئەو کەسە شانوشکۆ وهێزی هەیە . کە -ی بشکێ یا لەناو بچێ : هێزو پایەی وی لەناو دەچێ .

کلدان ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا ژنێکە کە هەمیشە لە گەڵ خودایە و

ڕێگای ئایینی نیشانی خەڵکی دەدات . کە ـ ی وی بشکێ : ژنەکەی دەمرێ . جابری مغربیش دەڵێ کل لەخەوندا ژنێکی ئایین دارە . کە بینی ـ ی لە ناو چووە ؛ لە دۆستایەتی ژنێکی جووێ دەبێتەوە . کە ـ ێکێ بکڕێ : کەنیزەکێکی دەکڕێ .

کلك ابن سیرین دەڵێ کەبینی وەکوو ئەسپو کەرو گا کلکی هەیە : ماڵی زۆر دەبێو بەخۆشی ژیان ڕادەبووێرێ . کەبینی ـ ی وی وەکوو هی چەقەڵ و سەگ و گورگی یە ؛ ماڵی ناڕەوای دەستدەکەوێ و خەڵکی سەر کۆنەی دەکەن . کرمانی دەڵێ کەبینی لە دەستی وی دا ـ ی گا یا ئەسپ یا هی کەرێ هەیە : ماڵی دەستدەکەوێ . کەبینی لەدەستی وی دا ـ ی داعبایەکی وای لەدەستی دایە کە گۆشتی نەخورێ : ماڵی ناڕەوای دەست دەکەوێ .

کلیل ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ ؛ پیاوێکی کار پێکهێنەر و بەسەر دوژمناندا زاڵ بوونە . کە ـ ی زۆر بێ ؛ گەورەیی دەستدەکەوێ . دانیاڵ دەڵێ ـ : هێزە . کەبینی ـ ی ئاسن یا هی مسی هەیە . قسەی گیرا دەبێ . ـ ی دار سوودی کەمترە . کە ـ ی زێڕین یا زێوینی هەبێ ؛ بەڵگەی وەیە کەماڵی دەستدەکەوێ . جابر دەڵێ کە بە ـ ی نەیتووانی قفڵی بکاتەوەو ـ ەکەی لێ بزر ببێ : بە پێچەوانەیە . کەبە ـ ی قفڵی بکاتەوە : ژنی دەخوازێ یا کەنیزەکێکی دەکڕێ

کووپە ابن سیرین دەڵێ ـ ؛ ژنێکە کە لەلایان ویەوە سوود بەماڵی دەگا بەقەد گەورەیی کووپەکە . کرمانی دەڵێ کووپەی قورس لە خەوندا دیتن گەنجە . ـ ی ئاوێ ؛ ژنێکی دەولەمەندە . کەبینی لەماڵی خۆیدا

کووپە پڕ ئاوو لەئاوە کەشی دەخواردەوە : مـالێکی زۆری دەست دەکەوێ و لەرێگای خێرێ‌دا دەبەشێتەوە . کووپەی سرکە : پیاوی پارێز کارە . کووپەی رۆنی : مالی زۆرە .

کووپەی رۆنی : بڕوانە ( هێـزەی رۆنی ) .

کووتاڵ فرۆش : پیاوێکی گەورە و پڕ سام و پڕ مەترسی‌یە . بە زیـوەرو خشڵیش دەڵێن . کە خۆی‌بە - بینێ وە لە بە های کووتاڵە کەی دراوی وەرنە گرێ : زیانو خەفەتێکی گرنگی تووش دێ . کە کووتالی بـە کووتاڵ بگۆڕێتەوە : ئاواتی پێکدێ .

کۆتر ابن سیرین دەلێ دیتنی- : ژنە . کەبینێ -ێکی هەیەیابە کێك داویەتێ نیشانەی ژن هێنانە . کە گۆشتی -ی بخوات : مالی ژنی دەخوات . کە لە -ێکی بداو بیخا ; ژنە کەی بەرەلا دە کا . کە جوجکـەی - ی زۆر هەبێ ; لە ژنانەوە سوودی دەستدە کەوێ ، هێندێکیش دەڵێن بەهۆی ژنانەوە خەمو خەفەتە . جابر دەلێ کەبینێ کۆترێکی هەیە : یە کێکی لە سەفەرێ دێتەوە . کەبینێ -ی زۆر لەمالی‌داهەیە : مندالی‌زۆردەبێ‌و مالیشی زۆر دەستدە کەوێ باشترینیان -ی سپی و سەوزە . کە ژن -ی بینێ : مێردی دە کات و کچی دەبێ .

کۆترە بارییکە ابن سیرین دەلێ دیتنی - لە خەوندا ; ژنێکی کەم ئایین و بەد میهرەو لە گەڵ کەس ناسازێ . کەبینێ - ی هەیـە : ژنێکی بـەو چەشنەی دێنێ . کە بێچووە -ی گرتبێ : مندالێـکی دەبێ . کەبینێ گۆشتی -ی دەخوارد ; بە قەد وی مالی ژنانی دەست دە کەوێ . کە - جارێکی لە سەر بانی‌وی بخوێنێ : زۆر باشە . کەبینێ - لە گەڵ قەلە- رەشەی هاتوونەتە مالی وی : دز دەچێتە مالی وی و دزی لێ دە کات .

کۆتك : ابن سیرین دەلێ - لەخەوندا ; تۆ کەرێکە کەلە کاتی‌خۆیەدا کاران

پێك دێنێ. کە کۆتکێکی گەورەی هەبێ: نۆکەر یاکارەکەرێکی باش
پەیدا دەکا. کە کۆتکی وی لەناو بچێ: نۆکەرەکەی لەو جووێ
دەبێتەوە. ابراهیم دەڵێ کە ـی وی لەناو ئاگری بکەوێ نۆکەر یا
کەنیزەکی وی تووشی ئاهۆ (طاعون)ی دەبێ.

کوتن. ابن سیرین دەڵێ کەلەخەونیدا بۆی بڵێن (مەنجەڵەکمی لێ بنێ)
نیشانەی وەبە لەکارێکیدا کەهەیە پایەدار دەبێ. کەبۆی بڵێن (مەنجەڵەکە
تێکوەردە تانەسووتێ): واتا ووشیارو ئاگادار بە. کەبۆی بڵێن (نانی
لەتکە) واتا ئاگات لەبرایان بێ. دانیاڵ دەڵێ کەبۆی بڵێن (پشتێندت
ببەستە): بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ. کەبۆی بڵێن (کەم لەگەڵ ئاور
بە): واتا ئاگات لە ماڵی خۆتبێ تا هەژار نەبی.

کووچە؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ چۆتە ناو ـ یەکی ئاوەدان: ـ سوودە
جابر دەڵێ کەببینێ چۆتە ناو ـێکی کوشادەوە؛ کاری بەستراوی وی
دەکرێتەوە. بەڵام کە ـی بەتەنگ و تاریکی ببینێ: بە پێچەوانەیە

کۆخە؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا پێنج جورە ( ـی تەڕ، ـی ووشك
ـی بەبەڵغەم، ـی کە خووێنی پێوەبێ، ـێکی زەرداوی هەڵکەنێ)
کەببینێ لەکاتی کۆخینیدا بەڵغەمی لەزاری هاتە دەرێ گلەیی و کازا-
نەی لەدەس ڕووشەو کارەساتان لەلای یەکێکی دەکات، یا ڕەنجیبێ
دەگات بەهۆی لەناو چوونی ماڵی. کە کۆخەی ووشك بێ: گلەیی بێ
سوود دەکا کە ـ زەرداوی هەڵکەنێ پیاوێکی بەد خووە و هەموو
کاسێك گلەیی لەدەس دەکات کەلەپێش گەورەیەکی بکۆخێ: گلەیی
دەباتە لای گەورەیێکی کەببینێ لەسەرەخۆ دەکۆخێ: پەرۆشی دینییە
کرمانی دەڵێ کەلەخەونیدا ببینێ دەکۆخێ: یەکێك گلەیی لێ دەکا
کەببینێ کۆخەی دێ بێ هێزییە جابر دەڵێ کەببینێ لە گەرووی
ویدا کۆخە ماوە: کاتی مەرگی نزیکە.

کەبینیِ کۆخەی پیرانی لیِ پەیدا بوو و بەڵغەمی فریِ دا : لە خـەم و خەفەتیِ رِزگار دەبیِ . جعفـری صادق دەڵیِ کەبینیِ دە کـۆخیِ : لـە پادشاوە زیانی پیِدە گات .

کورِ : برِوانە ( مندالٚ ) .

کورتان ، ابن‌سیرین دەڵیِ لەخەوندا کورتان دیتن : ژنە . کەبینیِ ـی‌هەبو وە یا لە یە کیِکی تری کرِیبوو : ژنیِ دیِنیِ یا کارە کەریِکی دە کریِ . کەبینیِ ـی لەپشتی خۆی کردووە : گوویِ لە مستی ژنە کەی خۆی دەبیِ . کە ـە کەی لیِ گومبیِ : ژنـە کەی لیِ‌جویِ دەبیِتەوە یا بەرِەلاّی دەکات . جابری مغربی دەڵیِ ـی‌تازەوخاوێن‌بیِ : ژنیِ‌هیِمن‌وساز گاری دەبیِو سوودی لیِ‌دەبینیِ . ـ چلکن‌و کۆن بیِ : ژنیِکی نا ساز گار و چیرِە دریِژی تووش دەبیِ و زیانی لیِ دەبینیِ .

کۆتك ، ابن سیرین دەڵیِ ـ لەخەوندا : نۆ کەریِکە لە کاتی خۆی‌دا کاران پیِك بیِنیِ . کە ـیِکی گەورەی هەبیِ : نۆ کەر یا کارە کەریِکی باش پەیدا دە کات . کە ـە کەی لەناو بچیِ : نۆ کەرە کەی‌لیِ جویِ دەبیِتەوە ابراهیم دەڵیِ کە ـی وی لە ئاگری کەویِ : نۆ کەر یا کەنیزە کـی تووشی ئاهۆ ( طاعون ) دیِت .

کوورە : برِوانە لابەرِە « ٢٣١ » .

کورسی ؛ ابن سیرین دەڵیِ دیتنی ـ لە خەوندا زانیاریِە . ابراهیم دەڵیِ دیتنی ـ . ئاتاجیِیە . کەبینیِ لە ئاسمانیِ لەسەر کوریِ دانیشتووە : کر و باری رِیِکدە کەویِو بە ئاوات دە گات . بەلاّن ـ یە کەی کە دارتاش دروستی کردبیِ بریِتیِیە لە ئافرەت .

کورِك ( باڵندە ) ، ابن سیرین دەڵیِ : ـ کورِی نۆ کەرانە . کەبینیِ ـی گرتووە یا کەسیِك داویە بەو : نۆ کەر یا کارە کەرە کەی منداڵی‌دەبیِ کە ـە کە نیِربیِ منداڵە کە نیِر دەبیِ . کە ـ لە دەستی بفرِیِ کورِ یا نۆ کەرە کەی دەمریِ

کوژتن : کەلەخەونیدا ببینێ ئەویان کوژت ، تەمەنی درێژ دەبێ . کەببینێ خۆی سەری یەکێکی تری بڕیوە بەبێ ئەوەی کەسەری لەلەشی جوێ بکاتەوە : سوودێکی بەوی دەگەیەنێ . ابراهیم دەڵێ کەببینێ دەستەیەك ئەویان کوژتووە : نیشانەی سوودە . کەببینێ یەکێك ئەوی بەزۆر کوژتووە : خەون بین خۆی بێچارەیە بەڵام خووای گەورە تۆڵەی وی بەهۆی یەکێکی تر دەکاتەوە . جابر دەڵێ کەببینێ منداڵی خۆی کوژت ڕۆژی ڕەوایە بەڵام کەببینێ ئێسترو داعبایەکی تری کوژت : بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێ .

کۆشك (قصر) . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ چۆتە ناو ـێکی : ماڵ و خوواستەمەنییە ، بەتایبەتی کەـە کە لەلکبن و گڵ دروست کرابێ . کەـە کە گێچو خشتو بەرد دروست کرابێ : ماڵە بەڵام کەمو کووڕی دێنێ . ابراهیم دەڵێ کەـی وی کاول بوو بێ : مـاڵی لەناو دەچێ . کەئاگر لەـە کەی بەربووبێ : لەپادشاوە زیان دەبینێ .

کوورە . ـی ئاسنگەر : ئاشتی و تەبایی ژن و مێردانە .

کۆ کردنەوە . ـ لەخەوندا بارێکیشێواوە پێویستە بەووردی تەگبیری لێ بکرێت کەیەکێکی تر کۆ بکاتەوە لە کڕینێدا تەفرە دەخوات .

کۆل ( ڕەە ، ئایار ) . بڕوانە ( پێوانە ) .

کۆڵ . کەلەخەونیدا ببینێ ـێکی سوو کی لەسەر پشتی بێ : دروهێندەی وی سوود پێ دەگات . کەـە کەی قورس بێ : گوناه و تاوانێکی زۆر دەکات . کە کۆڵەکە هی خۆی بێ : هێندەی وی سوود پێ دەگات یا خراپەو زیان . کەـە کە هی خۆی نەبێ : سوودو زیانیشی هەردەچێتەوە سەر خەو بین .

کۆڵ هەڵگرتن . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : خاوەندی پایەو بقە(خطر)ە کەببینێ لەسەرپشتی یالەسەر شانی بارێکی سووك هەیەو هی خۆشیەتی :

هێندەی‌وی ڕەنج‌و ئازار پێدە گابەهۆی گوناه‌وداوێن پیسی‌و ئاوانەوە
جابر دەڵێ کە کۆڵی‌بۆ خەڵکی هەڵگرێ بەبێ کرێ : لەگەڵ یەکێکی
خێرو چاکەی دەکاو ئەویش بۆ خاوەندی خەون دەگەڕێتەوە. بەڵان
کە کۆڵی هەڵگرێ و کرێی بستێنێ : خەم و خەفەتە بەتایبەتی کە
کۆڵەکە قورس بێ .

کۆڵەکە ؛ ابن سیرین دەڵێ - : دەوڵەت و سامان‌و بەختیارێتی‌یە . کەببینێ
-یەکی ڕاست‌و قایمی هەیە : لەلایەن پیاوێکی ماڵدارەوە ماڵ‌وسامانی
دەستدەکەوێ . کەببینێ -ی ماڵی‌وان سووتا یا شکا : کابرا دەمرێ .
کرمانی دەڵێ دیتنی - لەخەوندا کەهی ماڵێ بێ : خاوەندماڵە . جابریش
هەروا دەڵێ . کەببینێ -ی ماڵێ شکا یالەناو چوو یا کەوت : خاوەند
ماڵ لەناو دەچێ . کە-ە کە ئەستوور و بەهێز بێ : هێزی‌خاوەند ماڵ
پتر دەبێ .

کوولەکە ( کودی) . دیتنی - لەخەوندا پیاوێکی زانا یاپزیشك یاوێژەوانە
کە-ی لەکاتی خۆیدا ببینێ پایەو بەهرەی پتر دەبێ . کەنەخۆش بی-
بینێ : چاك دەبێتەوە کەگرتوو بی بینێ : بەر دەبێ . کەئاوارەش
ی بینێ : دەگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی . جابر دەڵێ کە-ی لێنراو بخوا
ئاوات و ئامانجی پێك دێ .

کۆلکە زێڕینە . ابن سیرین دەڵێ کە-ی زەرد ببینێ : نیشانەی نەخۆشی
خەڵکی ئەو وولاتی‌یە . کە- سەوزی‌یەکەی لە سووری‌یەکەی پتر بێ
لەو وولاتی‌دا ڕۆزی‌و بەهرە زۆر دەبێ ، بەڵان کەسووری پتر بێ
وا نیە . جابر دەڵێ کەببینێ سووری - لەئاسمانێ وەکوو کۆڵەکەیە
پادشای ئەو وولاتی هێزو ئاواتی بۆ پێك دێ . هی ڕەش : بەپێچەوانەیە

کولیچە ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی - لەخەوندا : ماڵ زۆری‌و خۆشڕابوێرێیە
کەببینێ -ی دەخوارد : ماڵی دەست دەکەوێ . کەببینێ -ی لەزاری

داناو نەیتروانی قووتی بدات ; دیارە مـاڵەکەی وی هی خەڵکی یە .

کۆم ( قوون ) . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : نیشانەی کاروباری وی یە . کەبیبنێ ـی هاتۆتە دەرێ ; کاروباری خراپ دەبێ . کەبیبنێ لەـی خووێن دەتکاوە : زیانە . کەلەـی ویدا کرم یاپارچە گۆشتێك بێتە دەرێ : منداڵی دەمرێ . کەبیبنێ ـی وی بریندار بووە بەهۆی ماڵ‌و سامانەوە خەم‌و نەفەتێ دەخووات . کەبیبنێ خووێن یاپیسایی ـی وی هاتە دەرێ‌و جلکی وی تێوە چوو : ماڵی نارەوای دەستدە کەوێ کەمارێك لەـی بێتە دەرێ : بەئاوات دەگا بەڵان کە مار یا دوپشك بچێتە ناو ـی وییەوە ; زیانە .

کون . ابن سیرین دەڵێ کەلەکێویدا ـی ببینێ‌و چووە ناوییەوە بەسەر ڕازی پادشایدا ئاگادار دەبێ . کەبیبنێ چتێکی لەـەکەی هێنایە دەرێ لەگەورەیێکەوە بەهرەی دەست دەکەوێ . کەلەلەشی خۆیدا کونی ببینێ و خووێنی لەبەر بڕوات ; زیانی بێ دەگات . جابر دەڵێ کەببینێ کونێکی لەزگی دایە ; لەخێزانی خۆی ناهومێد دەبێ .

کونجی . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا ماڵی ڕەوایە کەهەموو ڕۆژێ پتر دەبێ . کەبیبنێ ـی هەیە : بەقەدوی ماڵی ڕەوای دەستدە کەوێ . هێندێکیش دەڵێن ـ خراپە .

کوند . ـ دیتن : مرۆی دز و چـاو بێ هەڵنەهاتوو و پێکوڵچێنە کەـێ بگرێ . لەگەڵ پیاوێکی وای دوژمنایەتی لێ ڕوو دەدات کەشەڕیشی لەگەڵ بکات : هەروایە . کرمانی دەڵێ کەگووێی لەدەنگی ـی بێ لەو شوێنی شین‌و شەبۆڕ پەیدا دەبێ کە بێچووەـی ببـات منـداڵی شووم‌و ناپەسندی دەبێ . گۆشتی ـ خواردن : ماڵی دزیاری خواردنە کونـد کـە بخووێنێ سبڵەیی‌و بـەد نەکی یە .

کوژتنی کوند : پیرۆزی‌یەو سەر کەوتنە. کە کوندی‌هەبێ یادایانەتێ : بەسەر دزێکی‌دا زاڵ دەبێ . کەیێچووە ـی هەبێ : منداڵ یاشاگردێکی دزی دەبێ .

کوندە : پیرێکە ماڵ و ئەسپاردەی بێ دەسپێرن. کەلەناو ـدا ئاو یاگوڵاو وچتی ڕەوا هەبێ : نیشانەی پیرێکی ڕەوا خۆرە . کەچتی نارەوای تێدا بێ : پیرێکی نارەوا خۆرە . جابر دەڵێ کەبیبنێ کوندەی هەیە : لە گەڵ پیرێکی دەبێتە برادەر . کەلە کوندە ئاو و چتی تر بخواتەوە . لەپیرێکی خێرو چاکەی دەبینێ . کەچتی ترشی لێ بخوواتەوە ; خەمە کە ـ کە بدرێ یابشکێ : لەپیرە کەی‌دوور دە کەوێتەوە . کوندە؛ ڕەنگە لە گەڵ کووپەی لەلێکدانەوەدا جیاوازێکی وای نەبێ .

کۆنکە ( خەم‌وخەفەتە ) ابن سیرین دەڵێ کەجلی ـ لەبەری خۆی دا کەنێ لە خەم و خەفەت ڕزگاری دێ ؛ بەڵان مۆزەخانە ( ئەنتیکە خانە ) ی کۆن دیتن زۆر باشە . کرمانی دەڵێ ـ فرۆشتن‌و بازرگانی پێکردنی؛ خرابە . اسماعیل اشعث یش دەڵێ جلکی ـ فرۆشتن : باشە بەڵان کڕینی : خرابە .

کۆنگرە ( بورج ) : پایەی بەرز و بەڕێزە . ـ ی ددانە دار : بە یارێکی خانە دان و دەوڵەمەند شاد بوونە .

کووێر ؛ کە کەسێك ببینێ ـ بووە : لە ئایین دا گومڕا دەبێ . کە ببینێ یە کچاوی ـ بووە : نیوەی ئایینی وی دەڕوا یە تاوانێکی گەورە دەکا . کرمانی دەڵێ کە دەستی کووێرێکی بگرێ‌و بیبات : خاوەند باوەڕو بەزەیی دەبێ . کەبیبنێ یە کێکی ـ کردووە : ئەوی‌لەڕێگایە دەردەبات

کێچ ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : دوژمنێکی بێ تینە . کەبیبنێ ـیلك ئەوی گەزت : لە دوژمنان قسەی ڕەقی گووێ لێ دەبێ . کە کێچێکی

بکوژێ : بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . کەبینی کێچێکی زۆر لەلەشی وی وەرورکاون : دە کەوێتە بەر زارو زمانی خەڵکی بەوەو زیانیان لێ دەبینێ .
کێرد . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینی کێردی لەدەستی دایەو هی خۆی بێ : کوڕێکی دەبێ . کەپێچکە لەوە کە چەکی تریشی پێ بێ : نیشانەی گەورەیی یە جابر دەڵێ کەبینی کێردی لە کالانی دەرهێنا : ژنەکەی کوڕێکی دەبێ . کەوە کە لەکالانیدا بشکێ : بابی یابە کێك لەخزمەکانی وی دەمرێت . کەبینی لەی ویدا ژەنگ یاکەم و کوڕێکی تری لێ پەیدا بووە : نیشانەی کەم و کووڕی ماڵە .
کیسە . ابن سیرین دەڵێ کەی پارەی بینێتەوە : هێندەی وی ڕۆزی و خۆشی دەبێ . کەی بەتاڵ بینێ : بەپێچەوانەیە . هێندێکیش دەڵێن ؛ ئاکام (مەرگ)ی نزیکە . جابر دەڵێ : کەلەخەونیدا کیسەی خۆی بەدڕاوی ببینێ : ڕازی وی ئاشکرا دەبێ . کەبینی ـی دڕاوی دروەوە ڕازی وی بەدابـژشراوی دەمێنێتەوە . ابراهیم دەڵێ کەبینی کیسەی بەپارەوە بزر کردووە ئامۆژگاری کەسێکی دەکات و لێی نابیێ . کەی وی ئاوەڵە بێ و پارەی لێ بڕژێ : لەدوژمنایەتی ڕزگار دەبێ .
کیسەڵ ـ لەخەونیدا : پیارێکی زانابە لە هاودەمیەتی وی سوود بەمرۆی دەگەیەنێ . ابن سیرین دەڵێ کەبینی کیسەڵێك هاتە ماڵی وی یا هەیەتی تووشی هاودەمی پیاو چاکێکی دێت . کە گۆشتی ـ بخـووات : فێری زانیاری دەبێ
کێشان . ابن سیرین دەڵێ ؛ کەبینی ئەرازووی لە دەستی دابەو چێتکی دەکێشێ . لەنێو خەڵکیدا داوەری دەکات . کە چێتکی سەختو ڕەق بکێشێ : ئەگەر زانابێ دەبێتە قاضی ، کە زانا نەبێ ئاتاجی قاضی دەبێ

کێلان : بەهرەو پیت و پیرۆزی فراوانە .

کێلەر . کەبیینی بۆتە ـ : سوودو قازانجی زۆرە لەخانەوادەدا .

کێم . ابن سیرین دەلێ کێم لەخەوندا ماڵە . کەبیینی ـ لەلەشی وی دێ : زیانی ماڵی یە . کەبیینی ـ لەلەشی وی هـاتە دەرێ و دووبارە چـۆوە جێـگای خۆی : زیانی ماڵی یە بەڵآن لەئەنجـام دا باش دەبێ . کرمانی دەلێ کەبیینی ـی دەمژی : خەو خەفەتو ماڵی نارەوایە .

کێمیازان . دیتنی ـ : وەدووی خـوێندەوارێتی خـۆی دە کەوێ تاتەواوی دەکا . کەخۆی بەـ ببینێ : هەنگاوانی گرنگ و کارانی هـەڵەیە ، کەژیانی خۆی تووشی سەخڵەتی دەکا .

کێو . دانیال دەلێ ئەگەر کەسێکی خۆی لەسەر ـێکی بڵند ببینێ : دەچێتە پەنای گەورەیێکی . کەـی لەریشەوە هەڵکەنێ : بەسەر گەورەیێکی زاڵ دەبێ . کەلەچیایەکیدا جێگیر بێ : لەپاتشایەکی نزیك دەکەوێتەوە ابن سیرین دەلێ کەبیینی لەـێکیدا جێگیربوو و کەوت : خەو خەفەتە کەبیینی ـێك دەجوولآو دووایە راوەستا : پیـاوێکی گەورە لەوێدا نەخۆش دەبێ بەڵآن چاك دەبێتەوە . کەبیینی ـێکی بەئاسانی هەڵکەند زۆری بەخشش و ماڵ دەستدە کەوێ . کەبیینی لەسەر ـێکی تاریکە ، ترسی مەرگی هەیە . کەلەسەر کێوێکی بەرێتە خـوارەوە : ئاواتی پێك نایەت . کەپلیکانان دروست بکا لە کێچ و بەردی و بەهەریدا سەر کەوێتە سەر ـی : ئاواتی زوو پێك دێ . کەپلیکانەکان لەخشت و گلی بێ : باش تریشە . کەبیینی لە کێویدا کون هەیەو لەویش چووە ناوی لەرازی پادشا ئاگادار دەبێ .

گا. دانیال دەڵێ کەبیبینێ لەسەر ـی دانیشتووە: نیشانەی کارێکی‌یە لەلایەن پادشایەوە. کەگا بێتە ماڵی وی: دەرگای ڕۆزی لەسەر دە کرێتەوە. بۆرەی ـ مەرگێکی ڕاستەو خۆیە. کەـی زۆر هەبێ نۆ کەرێکی زۆر گووێ لەمستی وی دەبن. کە بەشاخ لێی بداو لەماڵێ دەرکاتە دەرەوە: لەنۆکەران زیان دەبینێو خۆی لەکار دەخا. کرمانی دەڵێ گالەخەوندا: کارە. پێستی ـ: میراتە. جابر دەڵێ کەلەگارانی دا ـی بکوژنەوەو گۆشتی دابەشنەوە: لەوێدا گەورەیەك دەکوژرێ وماڵی دەبرێ. کەلەگەڵ ـی شەڕێ بکا لەگەڵ گەورەیێکی تووشی دوژمنایەتی دەبێ.

گامێش. ابن سیرین دەڵێ؛ دیتنی ـ لەخەوندا پیاوێکی دەوڵەمەندە لەلێکدانەوەدا وەکوو گاو مانگا وایە.

گاوو گەردوون. ـ کردن دادو ماف نەناسیو سپلەیی‌یەو فێڵ و فەرەجە ـ خێر پێ کران یابۆ کران خۆشیو شادمانێکی چاوەڕێ نەکراوە.

گەردن. دانیال دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا: نیشانەی ئەسپاردەبی (أمانة)یە. کەبیبینێ ـی وی ئەستوورو قەڵەوە: هێزو ئایینداری‌یە. کەگەردنی خۆی لاوازو بێ تین ببینێ: بەپێچەوانەیە. کەمارێك لەـی وی ئالا بێ: دیارە ماڵی خوا (زکاة)ی لەماڵی خۆی نەداوە. ابن سیرین دەڵێ کەلەگەردنی خۆیدا گرانایی ببینێ نەخۆش دەکەوێ. کەبیبینێ بارێکی لەـی دایەو هیچ ئازارێکیشی پێوە نابینێ: نیشانەی تەمەن درێژی و ئایینداری‌یە. ابراهیم دەڵێ؛ کەگەردنی خۆی ڕەش ببینێ: دیارە لەئەسپاردە (أمانة) دا ناپاکی دەکا. کەبیبینێ مووی بەگەردنی‌یەوەیە: قەرزدار دەبێ. کەگەردنی خۆی کورت ببینێ: ئەسپاردە دەداتەوە.

کە گەردنی خۆی بەشکاوی ببینێ : بەڵواتیدە گاو ودڵۆی لەئایینیدە کەوێ
گەردن بەند ؛ لەخەوندا ـی زێڕ یا زیوی لە گەردنی دابێ : ووڵاتی دەست
دە کەوێو بەداد گەری رایدەبووێرێ . بەڵان کە ئاسن بێ : خرابەیە لە
ڕاست ئاییندا . ابراهیم دەڵێ کە ـی لەملی خۆیدا ببینێ : بەدرۆ داوا
دە کا . جابریش دەڵێ کە ـی زێڕین ببینێ : سامانە . کە ـی ئاسن بێ :
لە گەڵ یە کێکی دوژمنایەتی دە کات . ابن سیرین دەڵێ کە ـی مرواری
بێ : خوا زانیاریو فەرمایشی خۆی بەرۆزی وی دە کات . چەندەی ـی
نرخدارتر لە گەردنی خۆیدا ببینێ : فێری زانستو هونەران پتردەبێ
گەرماو (حمام ) دیتنی ـ : لەپێك گەبشتنێكدا ئاگادار دەبێ . ـی زۆر بایی
( اجباری ) : لەڕووی بێ موبالاتییەوە پارە لەدەست دەرچوونە . ـی
سارد ببینێ : سپڵەیی و بەد نمە کی لـە ڕاسـت وی دا دە کـرێ
( لە چڵکاوێ دا مەلـە کردن ) : بەد بەختیو پەرێشانییە .
گەروو ، دیتنی ـ لە خەوندا : نیشانەی دەست پا کی و قەرز دانەوەیە . کە
ببینێ ـیساخە : نیشانەیوەیە کەدەستو کردەوەیپا کە . کە ئازارێکی
لە ـی خۆیدا ببینێ : بە پێچەوانەیە . کە ـی خۆی گوشـاد و فراوان
ببینێ : رۆزی زۆر دەبێ . کە ـی تەنگ بێ : ئاگای لەئەسپاردن دەبێ
گـەز بڕوانـە ( بـاڵ ) .
گەزتن ، ابن سیرین دەڵێ کە یە کێك ئەوی بگەزێ هەوا و هەوەسی زۆر
دە کەوێتە دڵییەوە کە یە کێك بە ڕقەوە ئەوی بگەزێ : کار و باری
لە سەرەتاوە دە کەوێتە بقەو تەلەز گەوە کە گا یا مانگایەك بیگەزێ
لەوساڵیدا ڕەنج دەبینێ . گەروشتر بیگەزێ : لە کۆچیدا زیانی پێدەگا

گەزۆ . دیتنی ـ ڕۆزی‌یە کە بەبێ‌ترەتڕ (منەت) بەو دەگات . کەـی هەبێ یا کەسێك پیـدانێ : ڕۆزی‌یێکی زۆری بێ دەگات لەشوێنێکی‌یەوە کەچاوەڕێ‌ی نەدەکرد .

گەسك : نەخۆشی و ژەهراوی بوونە . ـ لێدان لەمـالێ‌دا : ناخـۆشی و ڕیسوایی‌یە . ـ لێدان لەهەوای ئازاد دا : بەد بەختی و ئازار و ڕەنجە . ـ لەسارداوو ژێر خانێ دا : شادمانی‌یە . ابن سیرین دەڵێ لەخەون دا ـ دیتن : نۆ کەرە . ـ لەشەوێ‌دا : نۆ کەرێکە داوای چتێ بکات . کەبیبنێ ماڵێ‌ی بەـی ماڵی : ماڵو سامانی لەناو دەچێ . کەماڵی کەسێکی تـر بماڵێ : ماڵی یە کێکی بەو دەگات بەتایبەتی کە خـۆڵی ماڵراوی وێ بهێنێتەوە ماڵی خۆی .

گەڵا کەلەدار پارچەـیە کی سەوز لێ بکاتەوەو یا کەسێکی تر پیدانێ : دیارە خوو و کردارێکی باشی هەیە . کەلەداری ـی تازە لێ کاتەوە : هێزەی وی دراوی دەست دەکەوێ . ـی دارانی میوە شیرین : خوو و کرداری‌باشە . ـی داری میوە ترش : خووی خراپە . ـی دارانی بێ بەر : درەمو دینارە . هێندێکیش دەڵێن گەڵای دارانی میوەدار : پوڵو پارەیە . ـی سەوز : ئومێدو بەختیاری‌یە . ـ پشکووێ : ئاووسی‌یە . کەـ هەڵوەرێ : بێ‌تینی‌وبێ‌هێزی‌یە . کەـ پاییزی‌بەسەردا بێ ئومێد لەدەست چوونە .

گەمەکار (گەمەکەر) . کەپیاو یاژن بەـی‌ببینرێ : سەر کەوتنێکی دەمەکی (مۆقتی)یە . مرۆ کەخۆی ـ بێ : پیرۆزی‌و سەر کەوتنە لەکاردا ، گۆڕانی بارە بەچەشنێکی دڵخواز . کەببینێ ـ یێك جلکی گـۆڕی : لەبارەی وی‌دا بەدزی وی کەین و بەینێك دەکرێ .

گەنە . ابن سیرین دەڵێ : دیتنی ـ لەخەون دا : ماڵ و منداڵە . کەببینێ ـ

لەشی وی دەخوارد : ماڵی لەناو دەچێ . کەبینێ وولاخانی وی - یان پێوەیە : خەڵکی لە وولاخەکانی وی خێر دەبینن . - فڕێ دان ( لە خۆ دوور خستنەوە ) چتێکی نهێنی بەو گەیشتنە و بەهۆی وی‌یەوە رادەمێنێ . وە ٦٢ گەر بیکوژێ : کەم و کوڕی ماڵە .

گەنج ( گەنجینە ) ابن سیرین دەڵێ کەسێکی لە خەونی دا ببینێ کە گەنجی دەستدە کەوێ : نەخۆش دەبێ . کەبینێ - بزرو پەنهان بوو : بەپێچەوانەیە . جابر دەڵێ گەنج لەجێگای کاول دەستکەوتن : سەخت ترە لەشووێنی ئاوەدان .

گەندی هەبڕوون (سوء الهضم) ابن سیرین دەڵێ کەسێکی کەی هەبێ : ماڵی ژنێکی دەخووات و لەناوی دەبات و دووایە پەشیمان دەبێتەوە . هێندێکیش دەڵێن - : باش نیە .

گەوهەر . ابن سیرین دەڵێ - لەخەوندا : ژنێکی جووان و دەوڵەمەندە . کەسێکی لەخەونی‌دا ببینێ کەی هەیە : ژنێکی وادێنێ . کەببینێ - ەکەی بزر بووە : ژنەکەی بەرەڵا دەکات . کەببینێ - و مرواری دەفرۆشێ‌و کەهی خۆی بن : دەبێتە خاوەندی زانست و ئایین و چاکەو مرۆیەتی لەگەڵ هەموو کەسێکی دەکات . کەئایندار نەبێ : دەبێتە خاوەندی نۆکەران و هێندەی گەوهەرو مرواری‌یەکان ماڵ و سامانی دەست دەکەوێ . هێندێکیش دەڵێن - : هاوسەری‌یە لەگەڵ بێوەژن‌ و یابێوە پیاوێکی . ابراهیم دەڵێ کەببینێ - ی دەفرۆشت : دەلالی دەکار کچێکی بەمێرد دەدات . کەی سبی هەبێ : منداڵێکی دەبێ . کەببینێ - ی دۆزیوەتەوە : دەبێ هەنگاوبەرەو کرداری نارەواو نالەبار نەهاوێ

گرتوو خانە : بڕوانە ( زیندان ) .

گرد : بڕوانە ( تەپە ) .

گرفتار ، کەبینی ـ بووە ؛ لەکاروبارانەدا دادەمێنی . کە ـ یێك لە خەونی دا بینی کەلە گرفتاری ڕزگاری بووە : تووشی گوشادیو ئاسوودەیی دێ کەبینی ـ یێکی زگما کە ؛ لەتاوانان پەشیمان دەبێتەوە کەبینی ـ یێکە لە سەر ئەژنۆیان دەڕوات ؛ تووشی دەست کورتیتی دێت . کە بینی کەسێکی تری گرفتار کردووە ؛ زیانی بەوی دە گەیەنی

گرمەی هەوری : بڕوانە ( هەور ) .

گڕوی‌یی ؛ ابن سیرین دەڵی دیتنی ـ لەخەوندا : نیشانەی‌ماڵوخواستەمەنیە کەبینی ـ یە کەی خارشتی هەیە و کێمی لێ هات : ماڵی دەستدە کەوێ جابر دەڵی کەبینی ـ هەیە و هەمووی لـە داوێنی بـەر بـۆوە و ڕژا ماڵێکی کۆی کردۆتەوە لە ناو دەچێ .

گریان ؛ ابن سیرین دەڵی ـ لە خەوندا : شادمانی‌یـە . کەبینی دە گریـا و فرمێسکی‌نەدەهات ؛ زیانە . کەبینی دە گریاو لە جیاتی فرمێسك خوێن دەهات لە کاری ڕابردووی‌دا پەشیمانەو خەفەتی دەخوات . کەبینی دە گریاو لە دووایە پێکەنی : ئاکامی نزیکە

گژنیژ ، دانیاڵ دەڵی دیتنی ـ لە خەوندا خەم وخەفەتە وچێتێکی وا نی‌یە

گلێرە ؛ ابن سیرین دەڵی دیتنی ـ لە خەوندا ؛ ماڵی داوا کراوە خواردنی ـ ؛ خراپە کە ـ بفرۆشی : پیرۆزی و سەر کەوتنە .

گۆ . ابن سیرین دەڵی کەبینی لە گەڵ پادشای گۆیێنی دە کا : بەسەر دوژ-منانەدا زاڵ دەبێ . کە یە کێکی بینی کەلە گۆی‌دا : دوژمنایەتی لە گەڵ یە کێکی دە کات . جابر دەڵی دیتنی گۆیێن بۆ لەشکری‌یان باشەو بۆ هی تر خراپـە

گوو : برِوانە ( ریخ ) .

گووارە . کەلەهەردووك گووێی خۆی‌دا -ی بیینێ : جووانی‌و شەنگی لەخەڵکی دەست دەکەوێ . ابراهیم دەڵێ کەپیاوێك بیینێ ژنەکەی دوو ئاڵقەی لەگووێ دایە بەکیێك لەزێڕی‌و ئەویتر لەزیوی : ژنەکەی بەرِەلا دەکات .

گۆپکەی داران . دیتنی خونچەی داران : قسەی خۆشە . کەبۆن لە-ی بکات : خەڵکی پێی هەڵدەڵێن .

گۆچان . دیتنی - : تازیەو شین‌و شەپۆرِە لەماڵی‌دا . شکاندنی - زەماوەندی‌بووك‌و زاوایان تێك دەدا . خۆ خستنە سەر گۆچانی : نەخۆشی سەختە . کەبەـی لەیەکێکی بدات : دۆستایەتییێکی پایەداری لەگەڵ دەبەستێ . بەکار بردنی گۆچانی بن هەنگن : باریێکی برِ مەترسی‌یە . دیتنی گوچانی بن هەنگن : کۆمەک و پاریزگاریێ پرِ هێزە .

گۆرِ . دانیال دەڵێ - لەخەونداا : زیندانە . کەبیینێ بەدەستی خۆی گۆرِی هەڵکەند : ژیان لەسەر وی وەتەنگ دێ . هێندێکیش دەڵێن ؛ ئەو شووێنەی کەگۆرِی لێ هەڵدەکەنێ هەر لەوێدا خانووی دروست‌دەکا کەبیینێ ئەویان لەناو گۆرِێ نا : ژیانی لێ تەنگ دەبێ ؛ دەشڵێن دەچێتە کۆچ کەبیینێ ئەویان لەگۆرِێ را کردو خاکیشیان بەسەر دادا کرد : کەم ئایینی‌یە . ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ ئەویان لە ناو -ێ نا ؛ دەیخەنە ناو گرتووخانەوە کەبیینێ لەسەر بانی‌وان گۆرِی‌هەڵدەکەنن تەمەنی درێژ دەبێ . ( مردوو لە گۆرِ دەرهێنان ) بێدادی و هەتك و کاری بێ جێ‌یە کە بەرەنگاری پاکی و چارەنووسی مرۆی دێ

مرۆ خۆی لە - ی بێتە دەرەوە ئەنجام و شووێنەواریێکی تازە و خۆش و برِ سوودە .

گۆرەوی ، ابن سیرین دەڵێ - لە خەونداا : خزمەتکارێکە لە ڕیزەی ژنان دەژمێرڕێت . کە - تازەی دەزوو یا ئاوریشمی لە پێدابێ نیشانەی ئەوەیە کەکارەکەرێکی ڕەسەنی هەیە و سوودی لێ دەبینێ . کەبینی - خوری یا ڕەنگاو ڕەنگی هەیە : کەنیزەکێکی جووان دەکرێ یا ژنێکی جووان دێنێ . کە - یەکەی زەرد بێ : ئۆکەرێکی نەخۆشی دێتە لای . کە - سووری هەبێ : ئۆکەرێکی شۆخ و بێ شەرمی دەبێ کە - ڕەشبێ : ئەگەر خەون بینەن مرۆڤێکی باشبێ ، باشتر دەبێ ، کە دووزمانیش بێ : خراپە . کە - چڵکن و کۆن بێ : ئۆکەرەکەی وی بەخراپی و داوێن پیسی لە قەڵەم دەدرێ . کە -یەکەی بسووتێ یا لەناو بچێ : ئۆکەرەکەی دەمرێ . کرمانی دەڵێ کەبینێ - وی کەوڵی ووشتری بە : ئۆکەرەکەی لەڕەسەنێکی باشەو کرتاخ ( همة ) بەرزە . کە -یەکەی لە پێستی مەڕی بێ : ئۆکەرەکەی لە دایك و باوکێکی ئاسایی یە . کە -یەکەی لەچەرمی ئەسپی بێ : ئۆکەرەکەی لەڕەسەنێکی خانەدان و سوپاهی یە . کە -یەکەی لە پێستی کێویان بێ : ئۆکەرەکەی خەڵکی دێهات و بیابانیە .

دیسان هێندێك دەڵێن : - دەزوو ئەنجامی سەرکەوتنە لە کاردا - ئاوریشم : بازو بەهرەی زۆرە - ی سپی ئەڤینی و دۆستایەتێکی پڕ بەدڵە . - ڕەنگاوڕەنگ : دۆستایەتێکی سەر زارەکی و ساختەکارانە و بقەیە . - ڕەش خۆشحاڵی سەودا و دڵداریتییە . - کۆن : بەشبڕاوی و دووری و باری نابەسندە . -- دۆزینەوە : شرە ( میرات ) دەستکەوتنە . - داکەندن کردەوەی پڕ سوودە .

گورز ، ابن سیرین دەڵێ دیتنی - لەخەوندا بریتییە لە پیاوێکی ڕاستو دروست ، هێندێکیش دەڵێن بریتییە لەووتەی سەخت ورەق . کەسێکی لە کەسێکی بدات : نیشانەی وەیە کە ووتەیەکی ڕەقی پێ دەڵێ .

کەـی خۆی بەئاسن ببینێ : لەلایەن پادشاوە هێزی دەست دەکەوێ .
کەبینێ ـە کەی وی وون بووە یالەناو چووە بەپێچەوانەیە .

گۆڕستان . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : هاودەمێتی نەخوێندەوارانە کەئایین و گیتی‌یان بـە گێچەڵ دەڕوات . ابراهیم دەڵێ کەبینێ دیدەنی ـی دەکرد : دڵنەوایی بەندی‌یان دەکات . کەبەـیدا بڕواتو ڕۆژباشی لەمردووان بکات : دەبێتە دەروێش .

کورگ . ابن سیرین دەڵێ کەـی بکوژێ و گۆشتە کەشی بخوات بەقەد وی میراتی دەست دەکەوێ بەڵان کەکورگ ئەوی بدڕێ : ژنە کەی بەڕەڵا دەکات .

کوربس . ابن‌سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : بەڵێنیو پەیمانە . کەبینێ بەدەستی خۆی ـی گرتووەو ـە کەش لەهەوا هەڵاوەسراوە : بەقەد بلندی ـە کە پایەو ڕێزی دەستدە کەوێ . کەبینێ ـە کە بساو کەمێکی لەدەستی وی‌دا مایەوە یاـە کە بەربێتەوە : لەڕێزو پایە دە کەوێ کرمانی دەڵێ کەبینێ ـێك لەئاسمانەوە شۆڕ بۆتەوەو ئەویش گرتوویە : پەیمانێك هەیە لـە نێوانی ویو خودای‌دا هەروەکوو کەنەخۆش بێو بلێ (خودایە ئەگەر چـاك بیمەوە . . . . و ئاوا دەکەم ) . کەبینێ ـیان لەملی کردووە : پەیمانێکی بەهەر کەسێکی دابێ : دووای دەخات . کەبەـی لەبانی‌یەوە بالەش ویێکی بلندەوە خۆی ڕۆ بهێلێ واز لەئاواتو هومیدانی خۆی دێنێ لەترـسان .

گۆزە ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا کارە کەرێکی دووزمانە کەلەدەستی وی‌دا ماڵو سامان لەناو دەچێ . کرمانی دەڵێ ـ لەخەوندا کەنیزە کە بانۆ کەرە . کەبینێ ـێکی تازەی‌هەیە یا کڕیویە : کەنیزەك یانۆ کرێکی دەست دەکەوێ . کەبینێ گۆزە کەی شکا یا گوم بوو کەنیـزەك یا

نۆکەرەکەی دەمرێ یاهەڵدێ و دەڕەوێ . کەگۆزەکەی کون بێ : ئەوان نەخۆش دەکەون . کەگۆزەکەی پڕ لەئاوی پاك و خاوێن بێ : سوودی لەنۆکەر یاکەنیزەکەکەی دەست دەکەوێ .

گووژاڵك . ـ لەخەوندا پیاوێکی ڕاست و دەولەمەند و سوودمەندە .

گۆشت ابن سیرین دەڵێ ـی سوور کراوەوە (قاورمە) بیبنێ بەئاوەوە ،لێ نرابێ : باشترە لەهی بێ ئاو . کەـی قاورمەی گای قەڵەو یاگۆشتی سوور کراوەوە بخووات ، لەوساڵەیدا لەترس بێ باك دەبێ بەڵان هی گیسك : کەمترە . کە ـی ئەسپی بخووا : لەلایەن پادشاوە سوودی پێ دەگات . کەـی ماـی بخووا ، لەکۆچیدا ماڵی دەست دەکەوێ . ـی لێنراو لەکەباب و یاهی خاو . باشترە . کەـی مەری بخووات . ماڵێ دەست دەکەوێ . کەبیبنێ ـی لەشی خۆی دەخووارد ، لەپشتە سەری ماڵی خۆی دەدوێ . جابـر دەڵێ دیتنی ـی قەڵەو لەهی لاواز باشترە کڕینی ـ وبردنەوەماڵ : نیشانەی لەناوچوونە . کەـی ئاسکی بکڕێ : لە ژنێکەوە سوودی پێ دەگات ـی بەوری بخوا ماڵی دوژمنان دەخوا ـی بزن : نەخۆشی و کارەساتە . ـی پلنگی بخووا لەشەڕیدا ناو بانگ دەردەکا . ـی چۆلەکە : ماڵی مندالانە . ـی فیل : ماڵی پاشایە ـی کەروێشك : میراتی ژنانە . کەـی قرژاڵ بخووا : لەژنانەوە ماڵی دەستدەکەوێ . ـی ڕێوی : نەخۆشی و ترسە . ـی قەلەرەش : ماڵی پیاوێکی بێ ئاینە . ـی شێری : لەپادشاوە قازانجی دەستدەکەوێ هی گاو گامێش : قازانجە . ـی گاکێوی : ماڵە لەلایەن ژن یاکەنیزەکەوەـی کۆترهەروایە . ـی پشیلە لەکۆچیدوورماڵی پێدەبڕێ . ـی کەمنیاز بخوات

پیرژنێك جادووی لێ دەکات . ـی ماسی : بەهرەیێکی زۆرە . گۆشتی مریشك خواردن : مالی کەنیزەکو نۆکەر دەستکەوتنە . ـی نەهەنگ خواردن : کارەسانە . ـی مەڕی قەڵەو یالاواز : زیانە . ـی لەخوێ دا پەروەردە کراو : ڕۆزی ڕەوایە .

گۆشت فرۆش ( قصاب ) ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ کەنەناسراو بێ : سامانە کەلەخەونیدا بیبنێ ـ هاتۆتە مـالی وی یا کووچەی وی : لەوێ دا یەکێك دەمرێ . کەبیبنێ ـی دەکرد : یەکێکی دەکووژێ یابریندار دەکات و خەمگین دەبێ .

گۆکرد . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەون دا : خەم و خەفەتە .

کولاَ . ابن سیرین دەڵێ دیتنی کولاَ دوو جوورە : بەدارەوەو لێکراوەوە ، ـێکی بایەدار نەبێ : نیشانەی خەم و خەفەتە . کەلەکاتی خۆیدا نەبێ : کارەسات و ڕووشەیە بەهۆی منداڵیەوە . کەـی لێکراوەوە بیبنێ : خەمو خەفەتە . جابر دەڵێ کەبیبنێ دارە ـی لەمالیەیە . بەهۆی منداڵەوە دلخۆش دەبێ . کەـی سوور بەدارەوە بیبنێ : لەکاتی خۆیدا : منداڵێکی دەبێ . کەبێ کات بێ : ئازارێکە لەلایەن منداڵیەوە پێی دەکات دارە ـی زمرد : ژنێکی بازرگان و ئاتاجی پێك هێنەرە . دارە ـی سپی ڕێزو سامانە . کەلەمالی خۆیدا دارە ـی بیبنێ : کچێکی مارە دەکات کەلەمالی خۆیدا ـی سەد بەرِ بیبنێ : بەهۆی منداڵیەوە شاد دەبێ . کەـی بشکووتوو بیبنێ : بەهۆی خزم و کەس و کاریەوە کەیف خۆش دەبێ جابری مغربی دەڵێ دیتنی کولاَ لەخەوندا : مرۆڤی بەبێ پەیمانو سوو کە . کەـی بدابە کەسێکی بالەرەستی بکەوێ لەمرۆڤێکی دوور دەکەوێتەوە . کەـو ڕیحانەی بچینێ : منداڵی دەبێ

کولاو ؛ کەبیبنێ بۆنی خۆشی لەگەڵ خۆی هەلگرتووە یا بێبەتی ، کە خەون دیترو زانابێ : خەلك لە زانایەتی وی سوود دەبینن

ابن سیرین دەڵێ ـ مـالە کە ـی بخواتەوە : مالی دەست دەکەوێ

کەدەو ڵەمەند ببینێ ; خەڵکی لەسا مانی وی سوود دەبینن . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ ; نیشانەی لەش ساخیتی یە وەبێ ی هەڵدەلـێن . کەبینێ گولاوی بە کەسێکی دا کرد ; نیشانەی لەش سـاخیتی ئەو کەسی یە . گولاو خواردنەوە ; خەفەت هێنەرە . کەگولاوی بەهەموو کەس بدا ; بەچا کە ناوبانگی دەردە کەوێ .

گوڵە بۆبەی کەڵەبابی : شادیو خۆشی یە . کەسی هەبێ یا کەسێك بیداتێ : شادی یە . کەـ بدەی بەهەموو کەسێکی : شـادی دە کەی . ـ لە کاتی خۆی دا دیتن ; گەورەیی یە . هێندێکیش دەڵێن ژنی بازر گانێکی جوانە ـ لەزەوی هەڵکەندن ; لەبرادەرێکی دوور کەوتنەوەیە .

گوڵە گەنم و جۆ . ابن سیرین دەڵێ کەلەخەونی دا ببینێ ـی تەڕی هەیە ; خێرو بەهرەیە . کەببینێ ـی ووشکی هەیە . بەپێچەوانەیە . جابر دەڵێ کەببینێ ـی تازەی دەخووارد ; ماڵی ڕەوا (حلال)ی دەست دە کەوێ یامنداڵێکی وای دەبێ کەلەوولاتی دا بەناو بانگ دەبێ . کەببینێ ـی لەسەر ئاگری دەسووتاند ; نیشانەی کەم و کووڕی ماڵە .

گوڵە مەخمەری . دیتنی ـ شادی بە بەلاَن بۆ ئایین باش نیە . کەسی هەبێ یایە کێك بیداتێ تووشی شارمانی دێت . کەـی بدا بە کەسێکی تر ; شادی دە کا . کرمانی دەڵێ ـ لە کاتی خۆیدا گەورەیی یە هێندێکیش دەڵێن ژنی بازر گانێکی دەو ڵەمەندە کەجووانو خۆش خووە . کەببینێ ـ لەجێگای خۆی دە گەڕێ : دەبێتە دۆستی بازر گانێکی . کەلەزەوی ـ هەڵکەنێ : لەپیاوێکی جووێ دەبێتەوە .

گوڵە میلاقە . ابن سیرین دەڵێ کەلە کاتی خۆیدا ـی ببینێ بەچڵە کەیەوە ; منداڵە . کەبێ کات بەبنەوەی ببینێ : خـێرە . کەبەبێ بنەوەی ببینێ ;

خەمە . کە ژنێك ببینێ گولەمیلاقەی بڕیو دای بەمێردەکەی : بەرەڵا دەکرێ . مێردیش پیدا بەژنەکەی : نیشانەی دەست لێ هەلگرتنیەتی .

گولەهەنار ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا دیتن : زەماوەندی بووکان و سوودە . کە ـی لە دارێ بکاتەوە : لە بووکێ دوور دەکەوێتەوە

گۆلەی هەوری : لە « هەور » ی دا بیدۆزەوە .

گولی ؛ ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ لە سەر لەشی وی شووێنەواری ـ بەیدا بوو و ئاوسا : ماڵ و سامانە . کە شووێنەواری ـ کەمبێ : تووشی کارێکی ناشیرین دێت .

گولی داران ( پشکۆژە ، گۆبکەی داران ) ، دیتنی ـ : قسەی خۆشە . کە بۆنی بکات : خەلکی بۆی هەلدەلێن .

گولی هەمیشە بەهاری : بڕوانە « هەمیشە بەهار » .

گومبەز ؛ لەخەوندادیتنی ـ ؛ ژنە . کە ـی پاك ببینێ : ژنی جووان دەخوازێ

گون ( هێلکەی گون ) ؛ لە خەونی دا ببینێ کە هێلکەی هەردووك گونی گەورە بووە : هێزو ماڵو منداڵی زۆر دەبێ . کە کچکە بووبنەوە : بە پێچەوانەیە . کەببینێ ـی بڕاوە : دوژمنی بەسەر ویدا زاڵ دەبێ . کە ـی خۆی بدا بە کەسێکی ؛ منداڵێکی بێزووی دەبێو بنچینەی دەچێتەوە سەر یە کێکی تر کە ـی هەڵامسابێ یا قوڕ بووبێ ماڵێکی زۆری دەستدەکەوێ بەڵان ترسی دوژمنانی دەبێ . کەببینێ ـی وی درێژبوە بەچەشنێکی وا بەزەوی‌دا دەکێشا ماڵێکی زۆر کۆ دەکاتەوە

ئەگەر ئەو ـی خۆی بدا بەیەکێکی تر و ئەویش ـی خۆی بدا بەوی هەردوو کیان بە ژنی یەکتری فێردەبن . کەببینێ پێستی لە گونی خۆی دەکردەوە ؛ یەکێك زۆری لەمنداڵی وی دەکات . کەیەکێك گونی وی سەخت بگرێ و بڕیوە بێ هۆش بێ وەلامی مردنی خۆی دەدەنێ کە منداڵی نەبێ بابە و ڕێزی

کەم دەکات . کەبینێ ـی وی ببڕن : لەهێز دەکەوێ . کەبینێ ـی
وی بەدەزوو یابەچتێکی تر بەستراوە : دەرگای کاروباری دەبەسترێ
کەـی خەڵکی بینێ : لەشەڕی دوژمنان دڵنیاو بێ باك دەبێ . کەلەـی
ویدا کەم و کووڕی پەیدا بێ : دوژمنی وی بەسەر ویدا زاڵ دەبێ .
کەبەدەستی خۆی گونی خۆی دەربێنی و لەجێگای خـۆی دانێتەوە :
منداڵی دەمرێ و یەکێکی تری دەبێ .
گوناح ( گوناه ) ابن سیرین دەڵێ کەـێکی بکاو نەزانێ چـ گوناهێکە :
لەکێشەو ڕووشە دەکەوێت . ابراهیم دەڵێ کەگوناهبارێی لەخەوندا
نیشانەی تاوان باریـە دەبێ لەبێداریدا پەشیمان بێتەوە .
گووێ . ابن سیرین دەڵێ کەبینێ گوێی وی کەوتووە . ژنەکەی تەڵاق
دەدات یاکچی دەمرێو دەشلێ : مەرگی خۆشی نزیکە . کەبینێ ـی
وی کەڕ بووە : نیشانەی بێئاینیـە .
گووێز . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : ماڵێکی بەڕەنج پەیدا بێت .
کەبینێ لەگەڵ ـی گەمەی دەکا : لەگەڵ یەکێکی دوژمنایەتی دەکات
کەـی بشکێنێ : لەگەڵ یەکێکی جەنگاوەرو شەڕانی ماڵ و سامانی
پەیدا دەکات . کەبینێ ـی هەیە : لەپـیاوێکی تەچەر سوودی دەست
دەکەوێ کەـی زۆر بێ : نیشانەی دوژمنایەتیـە کەرۆنی کاڵی
گوێزی دەربێنی : لەپیاوێکی ڕژد ـسوودی دەست دەکەوێ .
گووێلك . ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ی نـێری هەیـە . کوڕێکی دەبێ .
کەمێینە بێ : کچی دەبێ ابراهیم دەڵێ کەبینێ ـ لەمـاڵی ویدا
هاتوو چـۆ دەکات : خەفەتـە . کەبینێ سوواری گووێلکی بووە
لەگەورەیێکەوە نزیك دەبێتەوەو بەپایەی گەورەیی دەگات . کەبینێ
گووێلکی مردووە : منداڵی دەمـرێ . کەگووێلکی بکوژێتـەوەو
گۆشتی بخوات : میراتی منداڵانی دەست دەکەوێ کەـی سبی هەبێ

منداڵی جووان و پارێزکاری دەبێ . گووێلکی ڕەش : منداڵی وی ئابروومەند دەبێ . کە گووێلکی قەڵەوی هەبێ : منداڵی ساخ و باش دەبن

گیا ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـی تازە لەخەوندا :ئایینو ڕۆزی زۆرە . کە ببینێ لەناو گیا جارێکی دا دانیشتووە : لە ڕێگای ئایینیدا پێ گیر دەبێ کە ببینێ لەشی ـ ی لێ ڕوواوە : بەهرە و ماڵی زۆر دەبێ . کە ـی لە دەشتێوە بێنێتە ماڵەوە : لە کوچێدا ماڵی دەستدە کەوێ . کە ـ ی لە ماڵی خۆیەوە فرێ داتە دەرەوە : ماڵی خۆی لە ڕێگای خێرێ دا دەچووێنێ . کەببینێ گیای دەخوارد : نەخۆشییە .

گیامار ، ابن سیرین دەڵێ کە گیاماری لە کاتی خۆیدا لەزەوی کۆبکاتەوە سوودە . هی خاو خواردن : زیانە .

گیان ( روح ) ؛ـ کە خۆی بە ڕەنگی سوور یا سپی بنوێنێ : ئەنجامی باشەو لەخەم ڕزگار بوونە . بەڵان کە بەڕەنگی ڕەشی ببینێ : خرابە . کەببینێ مردووەو ـی دە کێشرێ و خزمانی وی شیوەنیان بۆ دە کرد خەمو خەفەت روولەخزمانیوی دە کات . ـ بەرەو ئاسمان بڕوا : مزگێنی و وەڵامی کەسێکت بۆ دێ کە وەت دەزانی مردووە . ابن سیرین دەڵێ ـ :منداڵ یا خێزان یا ماڵی ساز کارە . کەببینێ ـ لە لەشی وی دەچێتە دەرەوە : منداڵ یا خێزانی وی دەمرێ یا ماڵی لە ناو دەچێ یا خێزانی یا خۆی تەفروتوونا دەبێ . کە ـی خۆی وەکوو پیاوێکی باش ببینێ منداڵێکی باشی دەبێو باریشی باشتر دەبێو یا لەلای پادشاو گەورەیێکی باش میهرەبانیو خێرو خۆشیو نزیکی دەبینێ . کە ـی خۆی لەشێوەی پیاوێکی خراپو ناشیریندا ببینێ : واتای بەپێچەوانەیە کە ـی خۆی لەسەر

لەپی دەستی خۆی ببینێ . نیشانەی ئەوەیە کە لەکارێکی بڤە دایە و بۆ وی جێگای ترسە . کەببینێ گیانی وی لە سەر لەپی دەستی چووە نـاو ئاسمانێ زوو دەمرێ . کە گیانی خۆی بە زەردی ببینێ : دیـارە بـە نەخۆشی‌یە کی گرانەوە دەمـرێ .

کێچ ، ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : شەڕودوژمنایەتی‌یە . ـ فرۆشی خراپە . کرمانی دەڵێ ـ لە خەوندا : سەختی‌یە و هەر بنیاتێکی کە بـەو دروستکرابێ‌ببینێ هەمووی‌خراپە . خواردنی ـ : ترسی مەرگی‌لەدوایە

کێچەڵ ؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ لە شوێنێکی دا ـ هەیە لەو وولاتی‌دا خراپەو پێدرێژی پەیدا دەبێ . کەببینێ ـ لەوشوێنی‌دا نەماوە ؛ خەڵکی ئەو شوێنی ڕوو لە خردای دە کەن .

هەر کەسێکی یە کێك لەو دەیانە لەخەوندا ببینێ لەو شوێنی‌دا کێچەڵو ڕووشە سەر هەڵدەدا ١ ـ تاریکی ٢ ـ ئاگر ٣ ـ بای سارد ٤ ـ بای گەرم ٥ ـ خـۆر کە ڕەش هەڵگەڕابێ ٦ ـ تۆز ٧ ـ بارانەی بێ کات ٨ ـ دارهەڵکەندن ٩ ـ هەوری‌سوور ١٠ ـ بەرگی‌زەردوسوور پۆشین

کێزەر ، ابن سیرین دەڵێ ـ خەموخەفەتە . کەببینێ ـی هەیەو خواردی تووشی خەفەتێکی دێ . ابراهیم دەڵێ دیتنی ـ کە شیرین بێ سوودە بەڕەنجەوە دەستدە کەوێ ، کە شیرین نەبێ ؛ خەمە . باشترین ئەوەیـە بە گۆشتەوە لێنرابێ .

کیووژ ڕەنجو ئازارو نەخۆشی‌یە کەبخورێ ، بەماڵیشی‌دابڕژێنی‌هەروایە کە ـی هەبێو پیدا بەیە کێکی یا لەماڵێی بباتە دەرێ‌ولێی نەخووا : لە نەخۆشی و ئازار دڵنیـا دەبێ .

لافاو : مەرگ و لەناو چوونێکی نزیکە . کەلەخەونیدا لافاوی ببینێ .
دوژمنێکی گەورە یاپادشایەکی زۆرداره . کەلەخەونیدا لەگەل ـی
بەربەرەکانێتی بکا : تووشی دوژمنایەتی دێت . کەلە ـ دەربێو ڕزگار
بێ بەسەر دوژمناندا زال دەبێ . لافاو لەکوێستانیدا دیتن : خەم و
پەرۆشە ، بەلاّن لەگەرمێنیدا سوودو شادییە . ـ بەکۆلاّنیدا بڕوات
نیشانەی گوشادییە . کەـ شووێنێکی خراپ بکات : خەلکی ونێ لـە
پادشای زۆروبێدادی دەبینن .

لال ابن‌سیرین دەلێ کەکەسێك لەخەونیدا ببینێ لال بووە : کەمو کوڕی
ئایینیەتی . صادق دەلێ ـی، حەوت چەشنن : دەروێشی ، بەدحالی ، خەم ،
کەم و کووڕی ژیان ، کارەسات . لالیك ببینێ زمانی کراوەتەوه :
هەموو کاروباری پێك دێ .

لانك ابن سیرین دەلێ کەسێکی خۆی لەنلو ـیدا ببینێ کەشایانی ـ بێ
خۆش گوزەرانی باشەو لەترس بێ باك دەبێ . کەببینێ ـ کەوت پاشکا
بەپێچەوانەیە . ابراهیم دەلێ کەسێکی ببینێ کەلەناو ـیدا دانیشتووه
ژنێکی دەخووازێ یاکەنیزەکێکی دەکڕێ . دەلێن دیتنی ـ بۆ کەسێکی
شایانی نەبێ : زیندانە .

لاواز . ابن سیرین دەلێ کەکەسێك لەخەونیدا ببینێ ـ بووه : کەم و
کووڕی مالە . کەببینێ سەرڕای ـی ڕووشی زەرد بووه : نەخۆشی و
خەمە . ابن سیرین دەلێ کەببینێ سەری لاواز بووه : نیشانەی کەمی و
کووڕی‌پایەیەتی . کەببینێ کەپۆی‌لاواز بووه : پایەی ڕوولەنزمی‌دەکا ،
کەزاری‌خۆی‌ببینێ : ڕۆزی‌تەنگەوەبێ . کەگەردنی ـ بێ : ئەسپاردەی
خەلکی لەگەردنی دایە . کەزگی ـ ببینێ : پشتیوانی وی بێ هێز دەبێ

لەپی دەست ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ ـی خۆی لێکدەخستو دەیسوودەوە لەخزمان دوور دە کەوێتەوە هێندێکیش دەڵێن . لەوێ زەماوەند دەبێ کەـی خۆی ماندوو یابرینداز ببینێ : لە کۆچدا دەمێنێتەوە . ابن‌سیرین دەڵێ کەچتێکی لەـی خۆیدا ببینێ : سـوودی پێ دە گات . کەلەپی هەر دووك دەستەکانی لە سەر یەکتری بن : لەوێدا شایی و زەماوەند دەبێ کەـی خۆی هەردووك تاوەڵەو بەهێز ببینێ نیشانەی دەست درێژی و دەستەڵاتو یەتی .

لەرزین . ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ سەری دەلەرزێ : ئازارو ڕەنجە کە گەردنی وی بلەرزێ : ئەسپاردەی لەگەردنی دایەو نایداتە . کەلەپی دەستی بلەرزێ : ووتەی ڕەقی گوێ لێ دەبێ کەزگی بلەرزێ : لە کۆچیدا تووشی ڕەنجێ دێ کەئەندامی بلەرزێ : بەهۆی کارێکی کەوەدووی دە کەوێ تووشی ڕەنجو ئازاری دێت . دانیال دەڵێ دیتنی لەرزینی ئەندام : ترس و هەراسە .

لەش . ابن سیرین دەڵێ ـی مرۆڤان لەخەوندا دیتن : خەمو خەفەتە لە گوزەراندا ، هەر کەم و کورتی و پترێکی لە لەش دابێ تێخەی ژیان و گوزەرانی وی دە گرێتەوە کەبیبنێ ـی لاوازو باریك بووە : تووشی دەروێشی و بێکاری دێت . کەقەڵەوی ببینێ . دەوڵەمەندی و کارو کردارە کەلەلەشی وێ ڕشتە (ڕستە) دەهاتە دەرێ و دە کشا : ڕۆژگاری ژیانی بەخۆشی و گوزەرانێکی باشو دەوڵەمەندی ڕادەبووێرێ کەڕستە کە بسێ : بەپێچەوانەیە . کەبیبنێ ـی بۆتە ئاسن یامس : تەمەنی درێژ دەبێو دەرگای ڕۆزی لەسەر دە کرێتەوە . کەبیبنێ ـی بۆتە شووشە تاکام ( اجل )ی نزیکە کرمانی دەڵێ کەبیبنێ لەشی ساخو قەڵەوە :

کار و باری رِێك دەبێ و رِازیشی بە نهێنی دەمێنێتەوە . کەبیینێ - ی لاوازە : هەژار دەبێ‌و رِازیشی ئاشکرا دەبێ . صادق دەڵێ کە چتێکی پتر لە لەشی خۆیدا بیینێ : هێزو دەوڵەمەندیی‌و سەر کەوتن‌و پیرۆزیی‌یە کە کەم‌و کوورِییێکی بیینێ : بەپێچەوانەیە . کەبیینێ -ی هەڵامساوە: نەخۆش دەبێ .

لەش پیسی ؛ کە خۆی بە ـ بیینێ : تووشی کاروباری نارِەوا و سەر گەردان دەبێ . هێندێکیش دەڵێن دەچێتە سەفەرێ‌و ئاواتی پێکەی‌و کاروباریشی تێکدەچێ . کەبیینێ خۆی بشوواتو لەشی پیسێتی بەسەرەوە نەمێنێ و. بەرگی خۆی لەبەر کاتەوە ; لە ئەنجام دا لەو کێشەی تێی دایە رزگار دەبێ و دەرگای کار و باری لە سەر دە کرێتەوە . کە خۆی بە تەواوی نەشووات : کارو باریشی تەواو نابێ . کەسێکی لە خەونی‌دا خۆی بـە ـ و رِووتێتی بیینێ : لەکاروباری خۆی‌دا سەر گەردان دەبێ .

لەشکر ؛ « ابن سیرین » دەڵێ کەبیینێ ـ لەشوێنێکی بوو یا گەیشتە ئەوێ; زیان بەدانیشتووانی وێ دە گات . کە ـ ئامادەو تەیار بێ هێزوپیرۆزی ئەو وولاتەیە کە لەشکرە کەی تێدایەو هێزی پادشای خاوەند لەشکرە. کەیە . دیتنی ـ : دەستوبردو هەنگاوێکی گەورەیە . لەناو ـ دابوون ئارامی‌یەکی ئاشکرایە . کە لەشکری بەبێ چەك بیینێ : بێ هێـزی پادشاوخەڵکی وێ‌یە ؛ هێندێکیش‌دەڵێن دیتنی ـ وسوپا : ئامۆژ کاری ئەوەیە کە لەبابەت ئەو دوور کەوتووانەی کە چوونە کۆچ (سفر) و یا پێشەرگەن‌و چوونە شەرِێ نیگەران مەبەو ساخن و دەشلێن کەسێکی خۆی لە ناو ـی دا بیینێ کاتێکی کە بـەشـە و دەچێتـە دەرێ دەبێ ئاگای لـە خۆی بێ .

لەقەلێدان ؛ ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـی لە کەسێکیدا : باری‌خراپ دەبێ
کەبینێ ئێسترێك ـی لێدا : زیان لەکارو باری دەکەوێ . کە ووشتر
ـی لێ بدا : لە کۆچ (سفر) ێ دا رەنج دەبینێ .
لەکلەگ ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : ژنێکی بێ ئازارو دوور-
بینو خانەدانە . کەبینێ ـی هەیە ؛ لەگەڵ یەکێکی وا هـاوڕێ‌یـەتی
دەکا . کە ـێك هاتێتە سەر بانی وی : گەورەیەك دێتە ماڵی وی . کـە
ـێکی بکووژێ : دوژمنێکی دەکووژێ .
لەیلوبەرِ ، ابن سیرین دەڵێ ئەگەر لە خەونی‌دا ـ ی لە جێگای خۆیدا بـە
داری‌وە ببینێ ؛ سوودە بەڵان کە بەداری‌یەوە نەبینێ : خەم و خەفەتە
ابراهیم دەڵێ کەبینێ ـی ای‌دەکاتەوە دەیدا بەنۆ کەرێکی : نۆ کەرە-
کەی‌هەڵدێ . دانیال دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا ؛ کەنیزە کێکە کەبیکرِێ
لبـاد ( نەمد ) ، ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـی سپی هەیە : ماڵی رەوایە . کە
ـ رەشبێ ماڵی دەستدە کەوێ . کە ـی بسووتێ : ماڵی لەناو دەچێ
لغـاو ، ابن سیرین دەڵێ کە لەخەونی‌دا ببینێ ـی بسا : لە گەورەیی وی دا
کەم‌و کووری پەیدا دەبێ . کەخۆی‌بینی‌وە کوو ئەسپی ـی‌بەسەرەوەیە
گوێدێری و نۆکەرایەتی دەکات .
لـك ، ابن سیرین دەڵێ ،ـ منداڵ و برا و خزمە . کەبینێ ـی داران زۆر
تێکچرِ ژاون خزمی زۆر دەبێ کە بە کەمی ببینێ : خزمیشی کەم
دەبن . کەبینێ ـی‌داری‌خۆی‌دەبرِی : خزمێکی‌لەخۆی دووردەخاتەوە
کەبینێ ـێکی‌دارە کەی کەم بۆتەوە : خزمێکی‌دەمرێ . کەبینێ ـی
دارخورمای‌هەبە یا داویانەتێ منداڵی‌دەبێ . کەبینێ ـە دارێکی‌تەرِی

باریکیان دایە ؛ ئەگەر بەمەر ناسراو بێ - خێری لێ دەبینێ . کەبەمەر نەناسراو بێ ؛ لەبێکانەوە سوودو خێری بێ دەگات . کەلکە کە ووشك بێ ؛ هیچ چاکەو خرابەیەکی تێدا نی‌یە .

لوویا . ابن سیرین دەڵێ لوویا لەکاتو بێ کاتدا بەکوڵاوی و بەکاڵی ؛ هەر خەمە .

لۆری . بڕوانە ( ئوتوموبێل ) .

لۆکە ؛ ماڵی ڕەوایە . پەنبەدانە زۆر لەخەوندا دیتن ؛ نیشانەی ماڵە . کەئەوی بەئلسانی و بەبێ ڕەنج ومەدەست دێنن .

لوولاك . بڕوانە ( بەلەك ) .

لوولێنە . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ؛ کچە یا ژنــە . کەلوولێنەی هەبێ وەیا کچێك پیداتێ ؛ کەنیزەکێکی دەکڕێ یاژنێکی دێنێ کەلەدا ئاوێ بخـوواتەوە ؛ لەگەڵ ژنی دەست تێکەڵاو دەکات . کەـە کەی بشکێ ؛ ژنەکەی یا کەنیزەکەکەی دەمرێ .

دەڵێن ( ابو خلدە ) چووەلای ابن سیرینی و گوتی لەخەونمدا ئەـ کێدا ئاوم دەخووارد ەوە کەدوو لوولەی هەبوو ، لەیەکێکیاندائاوی خۆش‌و شیرین‌و لەوی تریش ئاوی سوویرو تاڵ بوو ، ابن سیرین گوتی تۆ ژن و ژن‌خوشکت هەیە هەردوو کیان بەکاردێنی‌وبەس کردەوەی وازایاك بکەو لێی پەشیمان ببەوە کابرا ددانی پێدانا .

لێ بەربوون ( تێ یانس کردن ) . کەلەنێو کۆمـەڵێکی دا لێی بەربێ و خەڵکی گوێیان لێ بێ ؛ قسەی ڕەق دەکاو خەڵکی بـۆی بەبەرلۆ دەبن‌و لەناو واندا ڕیسوا دەبێ . کەگوێیان لێی نەبێ ؛ بەپێچەوانە

هێندێك کەسیش خەونی وا ببینن : پێی شادمان دەبێ . کرمانی دەڵێ
کەبابەکی دەنگدارو بۆ گەنی لێ بۆوە : کارێکی وای لێ ڕوو دەدا
کەخەڵکی پێزو بۆی لێ بکەن و خراپیشی دە کەن . کەبێ بۆنو بێ
دەنگ بێ : لەکارێکی خراپ دوور دە کەوێتەوە . کەبەقەستی بەربداو
خەڵکی پێی پێ بکەن : لەکارێکی بێ مانەوو بوون دا گوزەرانی
دەست دە کەوێ .

لێدان . دانیال دەڵێ کەببینێ بەقامچی یان لێدەداو لە کۆڵە کەیان بەستووەو
تارادەیەکی شووێنەواری لێدانی لەلەشی دەر کەوتو خووێنیشی لێهات
خراپە . ابن سیرین دەڵێ کەبەقامچی لێی بدرێ : ماڵی نارەوای دەست
دە کەوێ بەتایبەتی کەلەوێ ندامی خووێن هاتبێو لەشی خووێناوی بێو
نەخۆشی لەلەشی وی دا پەیدا بێ : لەهەموو کەسێکی سوودی دەست
دە کەوێ . کرمانی دەڵێ کەببینێ بەقـامچی یابەدار لێیانداو لەپشتی
خووێن هات : ماڵی نارەوای دەستدە کەوێ . کەلەپشتی بدرێو نەزانێ
کێ لێیداوە کاروباری ڕاهی دەبێ . کەخۆی بەدار یابەقامچی هێندە
لەیەکێکی تر بدا تادار یاقامچییە کەی پارچە پارچە دەبێ ماڵو منداڵی
وی بەرا گەندە دەبێ . کەببینێ یە کێك قامچی زۆر لەوی داوە : خەمی
پێدە گات کەکاربەدەستێکی میری لەوی بدات : دەوڵەت کاری دەداتێ
و کاروباری ڕێك دە کەوێ . کەیە کێك بە گڵەتی لێی بدا : کەسە کە
ئامۆژگاری دادەدات . کەببینێ گڵەتێکیان بەپشتی وی دادا : ئابڕووی
دەبەن . کەببینێ دەمانچەیە کیان پێوەنا : ووتەی ڕەقی گووێ لێ دەبێ
کەمردوویێك لێی بـدات . لە کۆچێکیدا سووودی دەست دە کەوێ .
ماڵی لە کیس چووی دەست دە کەوێتەوە کەببینێ خـۆی مـردووەو
لێ یانەدا : هێزی دەست دە کەوێ کەژن و مێرد لێـك بـدەن : -

سەر کەوتنێکی گەورەیە . کەلەوولس ( حیوان ) بەری : سەر کەوتن و چیرەیی بەو دەستەڵاتە بەسەر دوژمناندا . کەیە کێك لەمرۆی خۆی بدا خەمی پەنهانی و ڕەنجی دەروونی سەودایـە . کە لە دوژمن بـدات : لە بەڵەی مەر گ دوور دە کەوێتەوە .

لێرەوار : بڕوانە ( جەنگەڵ ) .

لێفە . ابن سیرین دەڵێ لێفە لە خـەون دا : ژنە . کەبیینێ ـیە کی نوویی کڕیوە : کەنیزە کێکی کچ دە کڕێ یاژنێکی دێنێ . کەبیینێ ـی وی چڵکن بووە : نیشانەی وەیە کەژنە کەی سەلیتەیە . جابر دەڵێ : ـی سەوز : ژنی ئایینداره . هی سپی : ژنێکی دەو لەمەندولەخوواترسە . ـی سوور : ژنە کەی لۆتی و دۆست دەبێ . کەهی ڕەش بیینێ : ژنە کەی زانایە هی زەرد : نەخۆشییە .

لیك ( ئاوی زار ) . ابن سیرین دەڵێ کە ـی فڕێ بدات : قسەی نارەوا دە کا ـ بەدیواردا دان : ماڵ بڵاو کردنە لەڕێگای خودایدا . کەـی فڕێداتە سەر زەوی : نیشانەی هۆش ( عقل ) گوم کردنە . کەـی بەداری دادا بەبیان دەشکێنێ و سووێندیش دەخـووات . کرمانی دەڵێ ـی گەرم نیشانەی تەمەن درێژییە . هی سارد : مەر گە . ـی ڕەش : خەم و خەفەتە هی زەرد نەخۆشییە . کە لیکی لەزاری بێتە دەرێ و جلـکی تێوەبچێ لە زانبارێکی بە درۆ دەدوێ کە بەندبواری بەر . وە نیە

لێکەوتن ( عزل ) : ابن سیرین دەڵێ کە پیرێك لە کارێکی بکەوێ جحێڵ دەبێتەوە کە پیرە کە نەناسراو بێ : کەم و کووڕییە . کە گەورەیەك لەکار دوور خرایێتەوە نیشانەی بێ تینی ئایینی وییە .

لێك دانەوە ( حساب ) . ابن سیرین دەڵێ کەلەخەونی دا ببینێ خەریکی لێك دانەوەیە : تووشی ئازارو ڕەنج دەبێ . کەئەو خەونە کەنج بی بینێ بەپێچەوانەیە .

لیمۆ . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەون دا : نەخۆشی یە .

لیو . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـان لەخەون دا : بەڵگەی پێداویستی و ئاتاجی پێکهاتنە . دیتنی لێوی خوارەوە : لەهی سەرەوە باشترە . هێندێکیش دەڵێن دیتنی لێوان : نیشانەی خزمایەتی و نزیکایەتی یە . کەببینێ ـی نی یە : کەم و کووڕی ماڵەو دەڵێن لەوانەیە ژنە کەی بمرێ . کەببینێ دوو لێوە کانیان بڕی : ژنە کەی بەڕەڵا دەکات . ابراهیم دەڵێ کەببینێ لێوە کانی دێشان : خەمگین دەبێ . کەببینێ دوولێوە کانی پێکەوە نووسابوون و نەیتووانی لێکیان بکاتەوە : کار و باری دەبەسترێ .

کەژنێك ببینێ خاڵێکی ڕەشی لەسەر ـی بەتی : نیشانەی خۆشەویستی و پایەیە . کەئەو خەونە پیاوێك بی بینێ : ماڵی پتر دەبێ . کەببینێ لێوە کانی سوور بوون : قسەی ڕەوا دەبێ . کەببینێ لێوە کانی سپی یاسەوز بووە : خەم خۆری دۆستان دەبێ . کەلێوی لاواز بێ : تووشی خەم و خەفەتان دێت .



ماچ . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ کەسێکی ماچ دەکات : دەبێتە دۆست و خوازێنی کاری . کەنەناسراو بێ لەشووێنێکەوە سوودو خێری بێ دەگات، کەچاوەڕێ‌ی نەدەکرد کەبەهەواو هەوەسەوە مردووی ماچ بکات : خێری بۆ دەکاتو بەنزای چاك یادی دەکات . کەمردوو ئەوی ماچ بکات : دۆست و خوازێنی کاری زۆر دەبێ ماچ لەسەر ڕوو ئەمەگداری و سوپاسە . ماچ دان : میرات سەرهەڵدەدا . ماچ لەئافرەت وەرگرتن : سپڵەیی و بەدنەمەکی‌یە . ماچ کردنی منداڵ : بەختەوەری و کامەرانی‌یە . ماچ کردنی مردوو : تەمەن درێژی‌یە .

مار . دیتنی ـ لەخەون دا : ناپاکی (خیانەت)یە لەلایەن ژنەوە . کەـپێ‌بەوە بدات : زیانێکە بەوی دەگات . کوژتنی مار بڤە (خطر)و زیان لەو دوور دەکەوێتەوە . ابن سیرین دەڵێ دیتنی مار لەخەون دا : دوژمنێکی نهێنی‌یە . کەماری لەماڵی‌دا ببینێ : دوژمنی‌ناو ماڵی‌یە کەـی لەدەشتێ ببینێ : دوژمنی بێگانەیە . کەشەڕێ لەگەڵ ماری بکات : دوژمنایەتی لەگەڵ دوژمنان دەکات . کەمار دەرەقەتی وی بێ : دوژمن بەسەری‌دا زاڵ دەبێ . کەئەو ماری بەزێنێ بەسەر دوژمنان‌دا چیرە دەبێ که گۆشتی ماری بخووات ماڵی دوژمنان دەخووات . کەماری بکانە دوو پارچە ماڵی دوژمنان دەخووات . کەماری بەمردوویی ببینێ ڕووشە و کارەسات لەسەر وی لادەچێ . گرتنی ماری سپی گەورەیی‌یە که مار لەبەر وی هەڵبێ : نیشانەی بێ هێزی دوژمنە . ماری رەش دوژمنە کەچەند مارێك لەوێ کۆبینەوە : خزمەکانی دوژمنن . جابر دەڵێ کەببینێ مار لەهەر کونێکی لەشی وی بێتە دەرێ منداڵی دوژمنی وی‌یە . کەمارێکی بگرێ و زیانی پێ نەگات : گەورە دەبێو بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێ و بەئاوانیش دەگات .

مازوو . ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ مازووی لەداری دەکردەوە : بەرەنج ماڵی دەستدەکەوێ . کەبەخەروار ـی هەبێ : ماڵی زۆر دەستدەکەوێ مازوو خواردن : ماڵی نارەوا خوواردنە ابراهیم دەڵێ ـ لەخەوندا نەخۆشی یە . مازووی رەش و سەوز خەمە .

ماست . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـی شیرین : سوودە . ماستی ترش : خەمە . دانیال دەڵێ دیتنی ماست لەخەوندا : ماڵێکی لەکۆچیدا کۆ دەبێتەوە ابراهیم دەڵێ ماستی شیرین خواردن : ماڵی رەوایە .

ماسی دانیال دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا لەدەریای گەرمێنیدا : نیشانەی بەڵاو سەختی‌یە . بەڵان لەدەریای کووێستانیدا باشە . کەبیینێ ـی زۆر هەیە و تازەو گەورەن : بەهرەیە ، بەڵان ـی گچکە : خەمە . کەبیینێ کە لەناو زگی ـدا مرواری دەستکەوت : کورێکی دەبێ . کەبیینێ یەکێک ماسی سوورێر یـاووشکی داوە بەوی : لەلایەن گەورەیێکەوە زیانی پێ دەگات کەماسی وورد بیینێ : لەلایەن نۆکەرانەوە زیانی پێدەگا هێندێکیش دەڵێن کۆچە . کەبیینێ ـ لەزاری وی هاتە دەرێ : درۆی زۆر دەکات . کەلەسیرەتی بێتە دەرێ کچی دەبێ . کەـی تازەو ابنراو بخوات ماڵی بەقادری دەستدەکەوێ . ـی فرۆشی سوودە . کەـیانی دەریا قسەی لەگەڵ بکەن : لەرازی پادشا تاگاکار دەبێ و بەناوات دەگا

ماسی گرە ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا رۆزی و ماڵی رەوایە کە لەزنەوەی پێدەگات . کەبیینێ ماسی گرەی هەیە یا داویانەتێ : ماڵی ژنانی دەستدەکەوێ کرمانی دەڵێ کەماسی گرەی بکوژێ و گۆشتی بخوات هێندەی وی لەماڵێ شتومەکی ژنـان دەست دەکەوێ دیتنی ماسی گرە لەخەوندا : گەورەیی‌یە کەماسی گرەی بگرێ و

بهێنێتەوە ماڵی لەخزمان ژنی دێنێو لەوەوە ماڵو سوودی پێدەگات.

ماش. ابن سیرین دەڵێ کە ـی لێ نراو بخووا ؛ کەمێکی ماڵ دەستدەکەوێ کەبینێ ـی خاوو کاڵ دەخووا ؛ خەمە جابر دەڵێ : ـی تەڕو ووشك ولێنراو و کاڵ خەفەتە بەڵان کەنەیخووات خەمی نابێ .

مافووره ابن سیرین دەڵێ کەبینێ ـیان ڕاخستووەو زانی کەهی خۆیەتی تەمەن درێژو ڕۆزی زۆر دەبێ کەلەسەر ـی دانیشێو نەزانێ جێگای کێیە : باری دەگۆڕێ . کرمانی دەڵێ کەبینێ مافوورێکی گچکە دانیشتووە . تەمەنی کورت دەبێ . کەبینێ ـە کە کورتەو لەژێر وی درێژ بووە ؛ دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە . کەبەدەستی خۆی ـەکەی بپێچێتەوەو لەکونجی ماڵی خۆی دابنێ : هەرخۆی بەدەستی خۆی دەوڵەتو بەختەوەری خۆی تێك دەدا کەـەکەی بەپشتی خۆی داداتو بیبات خرابە . دانیال دەڵێ کەبینێ ـ سەوزو گچکەیە ڕۆزی کەم بەڵام تەمەنی درێژ دەبێ کەـێکی سەوزو پاکی هەبێ : دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە کەبینێ ـ لەماڵی کەـێکی تر ڕاخستووە خاوەند ماڵەکە دەرگای دەوڵەتو بەختەوەری لەسەر دەکرێتەوە . کە کەـەکەی بخاتە ماڵێکی نەناسراو کۆچی لەپێشە .

ماڵ ( خانوو ) ابن سیرین دەڵێ ـ بۆ پیاوان ژنە کەلەخەونیدا بینێ خانووەکەی بەکۆڵەکانەوە لەشوێنی خۆی هەڵگرت ژنێکی زۆر بەمرۆڤایەتی و بەخشندە دێنێ کەبینێ چووە ناو خانووێکی نوێوە ژنێکی دەوڵەمەند دێنێ و دەوڵەمەند دەبێ کەلەخەونیدا خانووێکی بینێ بەگێچ سوواخ درابوو نەیزانی هی کێیە : خاوەند ماڵ دەمرێ کەبینێ هەڵاتۆتە ناو ـێکیو دەرگایە کەشی داخستووە تەو خانوەش

بەسەرخانوویێکی ترەوە بوو: لەخەم رزگار دەبێ ، کەنەخۆش بێ . چاك دەبێتەوە . کەدەرگای ماڵی خۆی بەشکاوی ببینێ : لەیەکێکی ترەوە ماڵی پێ دەگات . کەدیوار یا خانووی بەسەردا برووخێ : ماڵێکی زۆری دەست دەکەوێ . کەماڵەکەی لەهی پێشوو گەورەتر بێ : دەرگای رۆزی بۆ دەکرێتەوە . کەدەرگای ماڵی خۆی بەئاسن ببینێ : دەوڵەمەند دەبێ . کەلەدەوروبەری وی هیچ خانوو نەبێ خراپە .

مالم : پروانە ( سەرۆکی ئایینی ) .

مانگ . دانیال دەڵێ دیتنی - : وەزیرە . کەببینێ -ی لەئاسمانێدا گرت : دەبێتە وەزیر ابن سیرین دەڵێ دیتنی - : پادشایە . کەببینێ - بۆتە دووپارچە : پادشا یاوەزیر لەناو دەچێ . کە- قسەی لەگەڵ وی بکات دەبێتە فەرمانڕەوای وولاتێکی . کەدوو - پێکەوە شەڕێ بکەن : لە نێوانی دوو پادشایاندا دوژمنایەتی ڕوو دەدات . کەببینێ کەم و کوڕی لەیەکێك لە-ەکاندا پەیدا بوو یەکێك لەپادشایەکان لێ دەکەوێ . جابر دەڵێ کەمانگی لەباوەش بگرێ یالەدەستی : ژنێکی جووان دێنێ کەمانگەکە یەك شەوە بێ : ژنەکە جسن نیە . کەلەو خەونە ژنێك بی بینێ مێردی دەکات کەمانگی چووارده لەماڵی وی بدات دانیشتووانی ئەو ماڵە لەگەورەو میرێکییەوە سوود دەبینن کەببینێ مانگی چوواردە تاریك بێ ڕەنجی پێ دەگات .

هێندێکیش دەڵێن : دیتنی مانگ لەخەون دا پادشا رەیا وەزیـر کوڕێکی دەبێ . کەمانگی بگرێ وەیا بێتە لای وی : -

کورێکی زاتای دەبێ •

مامۆستا ابن سیرین دەڵێ کەبینی بۆتە - : ئابڕو و گەورەیی دەست دەکەوێ . کەبینی -یەتی منداڵانی دەکرد ، لەو شوورێنی قسە ڕەوا دەبێ •

مامیران . ابن سیرین دەڵێ دیتنی - و خواردنی لەخەون دا : نەخۆشی‌یە کەبینی -ی بۆ دەردی چاوی لەچاوی کێشا کارێکی دەکا کەخێری لێ دەبینێ •

مامان منداڵی تازەیە کەمیراتی لەدەست تۆ دەستێنێت •

مانگا . ابن سیرین دەڵێ کەبینی -یەکی قەڵەوی هەیەو زانی هی خۆیەتی لەو ساڵی‌دا دەرگای ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە . کەمانگای لاواز ببینی بەپێچەوانەیە گۆشتی - دیتن : ماڵە . پێستی - : میراتە . کە-یەکی بدۆشێ و شیرەکەی بخوات : ماڵی پتر دەبێ کەئەو خەونە بەندە. یێك بی بینێ : ئازاد دەبێ . کە-ی بەئاووسی ببینێ : ئومێدەواری‌یە . کەبینی -یەکی قەڵەو دەکڕێ: ژنێکی‌دەوڵەمەند دەخوازێ . کەبینی-یەکەی قسەی دەکرد دەروازەی گوزەرانی لەسەر دەکرێتەوە . کە لەگەڵ -یەکەی شەڕێ بکاو ئەوی بگەزێ لەگەڵ ژنەکەی ناپاکی دەکات صادق دەڵێ کە-یێنە ماڵی وی نیشانەی ماڵ و بەهرەیە .

مایین. کەیەکێك -ی بداتێ یاسوواری بێ ژنێ دێنێ‌و لێی‌پیرۆز دەبێ کە-ە کە ڕەشبێ . ژنە کە بەڵەدارو بێ ئابڕووە کە-ە کە بەڵەك‌بێ ؛ نیشانەی وەبە کەرایك و بار کی ژنە کە لەیەك نەژادی نین ، یا لەیەك تیرە نین . کە-ە کە سەوز بێ : ژنە کە پارێزگارە کە-ە کە سوورو سپی یا سوورێکی مایل بەزەردی بێ : ژنەکە خۆشەویست و خاوەند پایەو بەڕێزە کەماینە کە کوێت بێ : ژنە کە خۆش ڕوو و

ئاهەنـگ پەرست و خۆش ڕابووێرو هاودەمە . کەماینە کە جووانووی نێری هەبێ : کوڕی دەبێ . کەمێ بێ : کچی دەبێ .

مەتاڵ . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا دیتن کەبەدەستیەوە بێ : لە کەسانی میری پشتیوانو پەنای دەبێ . کەلە گەل ـی چە کێـکی تریشی پێ بێ : دۆست و برادەران لە شەڕیی دەپارێزن . کەبینێ ـی لەسەر زەوی دانا لە گەڵ پیاوێکی هونەرمەندو زانـای دۆستایەتی بۆ پەیدا دەبێ .

مەڕ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەون دا : بەهرەیە کی گەورەیە یا ژنێکی سەنگینە . کەبینێ ـی دەلەوەڕاند : دەبێتە سەرۆکی هۆزێکی کەـی زۆر هەبێ و بزانی هی خۆیەتی : بەهرەیێکی زۆری دەست دە کەوێ . گۆشتی ـی لێ نراویش بخووات : بەهرەیە ، هی برژاو : خرابە . کەبینێ ـ دەبالێنی : یارمەتی دۆستانی خۆی بدا دیارە خۆشەویستێکی خەفەتبارە . کەبینێ ـی دە کوژتەوە : بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێو ماڵیوی دەخووات . جابر دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : دیتنی ژنێکی گەورەیە کەبینێ ـ یکی هەیە ژنێکی دەوڵەمەند دێنێ کە ـ لە گەڵ وی بدووێ : ڕۆزی زۆر دەبێ شیری ـ خواردن ئەخۆشی یە کە ـ یکی بدەن باوی : مەداڵی دەبێ کەبینێ ـ ی هەیە : لە گەورەیێکیەوە خێری و سوودێ دەبینێ . کەـ ی کەوڵ بکات بەسەر گەورەیێکی دا زاڵ دەبێ . کە لە گەڵ ـ ی شەڕێ بکات : ژنێك فێلی لێ دە کات .

مەرە کەپ : ابنسیرین دەڵێ ـ لە خەوندا داوای گوزەرانو ماڵ دەستکەوتنە کەبینێ ـ ی کڕی یا کەسێك بەویدا گوزەرانی خۆش دەبێ و ئاواتی پێکدێ کەبینێ ـ ڕژا یا بزربێ : واتای بە پێچەوانەی ئەوە یە

کرمانی دەڵێ کەبیینێ ـ بەبەرگی وی‌دا ڕژاوەو زیانی پێ گەیشتووە کەخۆی نووسەر بێ : هیچ زیانی نیە . کەبیینێ بە ـی چێتێکی دەنووسی خێرو سوودە کەوانەبێ : بەپێچەوانەیە .

مەرە کەبدان (محبرة) . ابن سیرین دەڵێ کەبیینێ ـێکی هەیە یایە کێك داویە بەوی : لەگەڵ یە کێك لەخزمەکانی خۆی دوژمنایەتی دەکات . کەبیینێ بەـی دەنووسی : خراپە لەوەوە دەگاتە نزم ترین پایە کە ـ ی بشکێ یا بەزرێ بەنابەدڵی یێوەژنێکی دێنێ . کەبیینێ قەڵەمێکی ڕەشی لە ناو ـ ەکەی دەنا : منداڵێکی نێرینەی دەبێ مفربی دەڵێ کە ـ ەکەی زێڕبێ زۆر ڕادەمێنی کە ـ ەکەی زیو بێ : ژنی دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکڕێ کە ئاسن بێ : کاروباری قایم دەبێ

مەرجان ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لە خەوندا : ژنە . کەبیینێ ـ ی هەیە ژنی دەخوازێ و منداڵی دەبێ لە ـ ی وی لە ناوبچێ ژنەکەی بەرەلا دەکات . ابراهیم دەڵێ ـ منداڵە . کە ـ ی لەگەڵ گەوهەرێکی تر ببینێ : ماڵە

مەردوم ابن سیرین دەڵێ : کە ـ ی بەبەرگی سپی یا سەوز ببینێ : گوزەرانێکی خۆشە کە بە بەرگی ڕەش ببینێ : بەپێچەوانەیە . ـ ی شین : کارەسات و ڕووشەیە . کە ـ ی بەبەرگێکی گوشادەوە ببینێ : ژیانێکی پڕخۆش و بەختیارێتی یە

مەزرا ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ منداڵە کەبیینێ ـ ی دە درویێتەوە ـ نیشانەی وەیە کە چەند کەسێك لە وێ دا دە کوژرێن . دانیال دەڵێ کەبیینێ لە ناو ـ یە کی ناسراو دایە کاریکی وا دەکات کە بۆ گێتی و ئاینی باشبێ . کەبیینێ ئاوو ر لە منداڵەکەی بەربوو سووتا قانی و قڕی،

پەیدا دەبێ کە مەزرایەکی ببینێ و نەزانێ هی کێیە : نیشانەی زیانی خەون بینییە .

مەلا : بڕوانە « سەرۆکی ئایینی » .

مەلە ؛ ـ لەخەوندا : نیشانەی وەیە کە بە فێڵ گوزەران دەکات . کە لە کاتی خۆیدا ببینێ لەئاوی پاك و ڕووندا مەلەی کرد و لە ئاوی دا قوم بوو لە نازو بەهرەی گیتیدا قوم دەبێ . ابراهیم دەڵێ کە لە ناو دەریایە دا ـ بکار نەتووانێ بکاتە قەراخی : لە بەندیدا دەمێنێ . کە لە ئاوێ دا بخنکێ : بەدەس دوژمنان دە کووژرێ . کە لە بەر ئەش پیسی ـی بکا کاروباری باش دەبێ . جابر دەڵێ کەببینێ لە ئاویدا ڕۆچووەو نقووم بوو : لەکارو باری گیتی دا نقووم دەبێ . کەببینێ بە مەلە کردن لە دەریایەدا هاتە دەر و بەرگی لەبەر کرد ؛ لە کاروباری پادشای ڕزگار دەبێ . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ دەچێتە نێو چۆمی یا لە ناو دەریایە دا مەلەی دەکا (خۆی دەشووات) ؛ لە خەم و خەفەتان ڕزگار دەبێ کە ئەو خەونە نەخۆش ببینێ : چاك دەبێتەوە ؛ قەرزدار ببینێ : قەرزی بۆ دەدرێتەوە ، بەندی ببینێ : ڕزگار دەبێ .

مەڵحەم ؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی لە سەر برینی دانێ : چاکی ئاینە . کە ـی بخووات چتی نارەوا دخووات . ـی بدا بەخەڵکی ؛ ئاسوودەبی بێ دەکەیەنێت .

مەمك ؛ ـ کچە چاکیوخراپی ـ ئێخەی کچان دەگرێتەوە کە ـ شیری لەبەر بڕوات : بەڵگە ئەوەیە کە کچەکەی بەهرە و ڕۆزی زۆر دەبێ . کە لەجیاتی شیری خوێنی لێبێ : ماڵی نارەوا وە دەست کچەکەی دەکەوێ . کە ـی زۆر شۆڕ بووبێتەوە : کچی دەبێ کە پیاوی ئەوە ببینێ کە ـی خۆی پڕبووە لەشیر : ژنێ دێنێو منداڵیشی دەبێ . کە ژنیشی هەبێ دەولەمەند دەبێ ئەو خەونە ـ

کەپیرێژن ببینێ : دەبێتە دەروێش و هەژار کەژنێکی جحێڵ ببینێ : تەمەنی درێژدەبێ . کە کچێك ببینێ : لەمنداڵیتی‌دا دەمرێ . کەپیاوێك لەخەونی‌دا مەمکی پیاوێکی تر بمژێ نەخۆش دەبێ‌و کەژنی دووگیان بێ : کوڕی دەبێ . کەژن لەمەمکی شیری بخووات : دەرگای کارو باری لەسەر دەبەسترێ جابری مغربی دەڵێ مەمکی پیاو لەخەون دا : ژنە . هی‌ژن کچی‌یەتی . کەژنێك ببینێ‌مەمکی بڕابوو کچی دەمرێ . پیاوێکی ببینێ کەمەمکی بڕاوە : ژنی دەمرێ کەژنێك ببینێ لەژێر مەمکی‌دا مەمکی تریش ڕووا‌وە : کچی دەبێ کەژنێك ببینێ هەردوو مەمکەکانی گەورە بوون باری منداڵەکانی باشتر دەبێ یا کچی بەمێرد دەوات . کەلەهەردووك مەمکەکانی‌خۆی شیری بخووات : خەم‌و پەرۆشی بۆ دەکات . کەلەمەمکی‌یەوە شیر بچێتە ناو زگی‌یەوە : زیانی بۆ دەکات . کەمەمکێکی بەئاگری بسووتێ : کچەکەی کارێکی بەپادشای دەبێ . کەهەموو لەشی ببێتە مەمك : منداڵی زۆر دەبێ یاماڵی زۆر دەبێ . کەژنێك ببینێ بەمەمکی هەڵاوەسراوە : کوڕێکی پیژووی دەبێ مەمکی پڕ شیر فراوانی و ئاوەدانی و هەرزانی گشتی‌یە . ـی بەتاڵ : بەر هاوێژتنە دەست بۆ مەمك بردن بەشێوەیەکی پەسند بەیارو دۆست گەیشتنە .

مەمك بەند ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا کەژن بێ : ڕێزو ئابڕوە کەپیاو بێ : خەم و برین و قامچی‌یە کەژنێك ـی هەبێ : ڕێزو بایەو بەئاوات گەیشتنە کەپیاو بی بینێ : تێشکان و ناهومێدی‌یە .

مەنجەڵ. لەخەوندا - دیتن : کابانی ماڵی یە . کە ـی تازەی کڕیبێ یادابیانەتێ تازارو کارەساتێك بەسەر کابانی ماڵی دێت . کەلەناو ـی دا چتێکی خواردەمەنی هەبێ : لە کابانی ماڵی وە سوودی پێ دە گات . کەلەناو مەنجەڵی دا چتێکی ناخۆش هەبێ : زیانی لەلایەن کابانی ماڵی وە پێ دە گات .

مەنجەنیق . ابن سیرین دەڵێ کەبینی ـی هاوێژتە ناو شارێکی : لەپاش- ملەی خەڵکی دەدوێ کە- بشکێ : خەڵکی ئەوشاری دڵنیاو ئاسودە دەبن مەیدانی شەڕ : کۆسپەو ئازارو دەردە سەری یە کەلەناو خانەوادەدا ڕوو دەدات .

مەیموون . ابن سیرین دەڵێ - دوژمنێکی فریودەرو لەخشتە بەرە . کە سوواری ـی بووبێ و ڕامی کردبێ : بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێ . کەلەگەڵ ـی شەڕێ بکات و بەسەری دا زاڵ بێ : نەخۆش دەبێ و چاك نابێتەوە یا کەم و کورتی یێك لەلەشی وی دا پەیدا دەبێ و لێی ڕزگار نابێ . کرمانی دەڵێ کە ـی بکوژێ : بەسەر دوژمنان دا زاڵ دەبێ کە گۆشتی ـی بخووات : نووشی ڕەنج و کۆسپەیێکی دێ کەیە ئێك ـێکی بداتێ : بە کێك دوژمنایەتی خۆی لەڕاست وی دا دەردەبڕێ جابر دەڵێ کەسێکی ـێکی بکوژێ نەخۆش دە کەوێ و چادەبێتەوە کە- سوواری ئەسپێکی بووبێ ژنە کەی وی لە گەڵ پیکاوێکی دەست تێکەڵاو دە کات . مەیموونی مێ ژنێکی دووزمان و بە گێچەڵە کەبینی - هاتۆتە ناو ماڵی وی لەو ماڵی دا ژنێك جادووی لەوی دە کات کە- لە گەڵ وی بخوێ : ژنە کەی چەنە دریژی لە گەڵ دە کا کە- بیگەزی نەخۆش دەبێ یا لەمنداڵی خۆی جنێوی گووێ لێ دەبێ

مجسمة : بڕوانە ( ئاپیدە ) .

مجوَّمە : بڕوانە ( خوواندچە ) .

مراوي . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەباڵندەی تر باشترە ، کەبینێ مراوی گرتووە یایەکێك بەوی داوە ؛ ماڵ و بەهـرەو گەورەیی‌یەو بەئاوات دەگات . کەـ زۆر کۆ بکاتەوە . ماڵی دەستدە کەوێ‌و بەسەر دوژمنان زاڵ دەبێ . کرمانی دەڵێ : ـ گوزەرانە . ئێسکی مراوی : ماڵ‌وبەهرەیە جابر دەڵێ کەبینێ ـ لەشوورێنێکێن لەوشووێنی خەم و کارەسات ڕوو دەدات . کەپچووە مـراوی بگری یایەکێك پیدا بەوی : منداڵی دەبێ . جعفر دەڵێ هەر کەسێکی ـ لەخەونی‌دا ببینێ : هەموو ئاواتێکی پێك دێ .

مرەبا بڕوانە ( ڕوب ) .

مردارسەنگ ؛ ابن‌سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : نەخۆشی‌یە . کەمردارسەنگی بخووات : نـەخۆش دەبێ و تـرسی مردنیشی هەیە کە ـ ی بدا بـە کەسێکی یا بیفرۆشێ لە ڕەنج و نەخۆشی دڵنیا دەبێ ـ ی زەرد . نەخۆشی و خـەفـەتـە

مردن ؛ دانیـاڵ دەڵێ کە لە خەونی‌دا ببینێ کە مردووە و خەڵکی لە سەری دەگریان‌و تا ئەوکانەی کە دەیشۆن‌وبەخاکی‌دەسپێرن خرابی ئاینە کەببینێ ئەویان لە نـاو تابووتی ناوەو خەڵکی لەپێش و پاشی‌یەوە دەڕۆیشتن ؛ نیشانەی گەورەیی‌یە بەڵان کەهو کووری لەئاینی‌دە کەوێ کەببینێ مردبوو و زیندوو بۆوە : لە گوناهی تۆبەی دەکات و تەمەنی درێژ دەبێ . جابر دەڵێ دیتنی مەرگی کوتووپڕ لە خەوندا ؛ نیشـانەی ئاسوودەیی موسـڵمـانانە

کرمانی دەڵێ کەببینێ مردووەو لەسەر تابووتی‌یەو خەڵکی لەپشتیەوە دەڕۆن : گەورە دەبێ . کەببینێ مردووەو زیندوو بۆتەوە : زۆرباشە کەمردوویێکی ببینێ دووبارە زینـدوو بۆتەوە : دەچێتە لای پادشـاو خێری لێ‌دەبینێ . کەببینێ منداڵی مردووە : دەوڵەمەند دەبێ‌و لەشەڕی دوژمنان دڵنیا دەبێ . کەببینێ دایك‌و باوکی مردن کاروباری باش دەبێ . هەندێکیش دەڵێن کارو باری ئاڵۆز دەبێ . کەژنێکی ئاووس ببینێ مردووەو دەیشۆن : کوڕی دەبێ . بەڵان کەبەخاکی بسپێرن : خراپە .

مردوو ابن سیرین دەڵێ ؛ کەببینێ ـ دەناڵێنێ : ـە کە بەد کردار بووە لە کاتی‌دا ژیانی‌دا کەـ لەبەر ژانەسەری بناڵێنی : لەسـەردەمی ژیانی‌دا لەگەڵ خەڵکی بەهەوا بووە . کەـ لەبەر ژانی چاوی بناڵێنی : لەسـەردەمی ژیانی‌دا تەماشای ناموسی خـەڵکی کردووە . لەبەر گوویێشی : گووێی لەپاشـلە بووە . لەبەر ددان : جنێوی بەخەڵکی داوە کەلە بەر کەلەکەی بناڵێنی : دیارە لەگەڵ ژنانی سـووك کۆ بۆتەوە . ژانی زگی وی : لەبەر خواردنی ماڵی نارەوایە . جابر دەڵێ کەلەبەر ژانی پشتی بناڵێنی : نیشانەی داوێن پیسی‌یەو بێ ڕێزیشی زۆر لەگەڵ دایك وباوکی کردووە .

مرۆ : بڕوانە ( مەردوم ) .

مرواری : بەردێکی سپی‌و ترووسکەداری نرخدارە دانیـال دەڵێ دیتنی ـ منداڵە یامنداڵی کەنیزە کە ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ : ژن یا کەنیزە کیکی جووانە کەـ زۆر هەبێ ماڵی زۆر دەبێ . هێندێکیش دەڵێن دیتنی ـ بەبڵاوی : دووانی زانیـاری‌و ئەنبوژەنی ( حـکـمە ) یە . دەشڵێن ـ : ژمارەی کوڕو کچانە کەلەزاری‌خۆی دا گەردن بەندی ـ بێنێتە دەرەوە :

لەبابەت زانیاری و گەنبووژەنی یەوە دەدوێ . کەمرواری بخووات : زانیاری لەبیر دەچێتەوە . کە لەجیاتی - داری مرواری بسووتێنێ : زانیاری فێری وادەکات کەلێی نەوەشێتەوە . ابراهیم دەڵێ کەبینێ - لەزاری دێتە دەرێ : مەزنان قسەی وی پەسند دەکەن . کەرستەی - لەدەستی بکەوێ و بشکێ گریانە . کە بخاتە شووێنێکی پیس : باسی زانیاری لەلای نەزانان دەکات . کە لەچووی بێتە دەرێ کە کونی نەبێ : کورە ، کەکونی هەبێ : کچی دەبێ . کەرستەی - لەملی کەسێکی بکات : زانیاری فێری وی دەکات .

مریشك . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی - لەخەوندا نێ کەرو کەنیزە کە . کەبینێ -ی هەیە : کەنیزە کێك یانێ کەرێکی دەکرێ کەسێ زۆر هەبێ : دەبێتە سەروەر . ابراهیم دەڵێ دیتنی - ژنێکی جووان و ماڵدارە . کەمریشك لەماڵی وی دا هێلکەی بکات : لەلایەن ژنێکی‌یەوە سوودی دەست دەکەوێ .

مز کەلەخەونی‌دا بینێ - ی هەیە لەکالای گێتی چنێکێ خرابی دەست دەکەوێ . کەبینێ مزی دەتاوانەوە بەخرابی دەکەوێتە ناو زمانانەوەو سەر کۆنەی دەکەن .

مزراویلکە ابن سیرین دەڵێ کەسێکی کە بەگۆشتی بەرخ یامەرِو ماستی شیرین بخووات لەلەشکری‌یان سوودو خێری پێدەگات کەبە گۆشتی گاو کەروێشك‌و ماستی ترشی‌یەوە خواردبێ قازانجێکی کەم لەخەڵکی سپلەو پووچ بەو دەگات‌و خەم و خەفەتیشە -ی ترش و بێ چەوری قازانجە بەلان هی ترش و ناخۆش رەنج و ئازارە .

مزگەوت . -ی ئاوەدان : پیاوی زانایە . جابر دەڵێ - درروست کردن

ژن هێنانە کەچرای لە ێدا هەڵکات : ڕووناکی لەکاروباری دە کەوێ کەچرای مزگەوتی بکوژێنێتەوە : منداڵی دەمـرێ کەبچێتە نـاو مزگەوتێکی کاولەوە زانایەك لەوێ دەمرێ .

مـژ : بڕوانە ( تەپ و مژ ) .

مۆڵ : ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ : لەخەونداپارێزگاری ئایینە . کەبیبنێ ـی وی هەڵوەریوە خراپەی ئایینە . کەـی بجووڵێنی : نەخۆش دەبێ

مس . ابن‌سیرین دەڵێ ـ ماڵە . ابراهیم دەڵێ دیتنی ئامان و ئافتاوەی مسین نۆکەرە . ئامان و کەرەستەیێکی مسین کەبۆچراو ئیتر دەست بدەن : کوویخای ماڵێ‌یە . کەـی بتاوێنێتەوەو بی باڵێوێ : کارێکی سـەخت بەدەستی وی دە کرێتەوە . هێندێکیش دەڵێن ماڵێکی رەوای دەبێ .

مسك . ابن سیرین دەڵێ کەبیبنێ ـی هەیە : خەڵك بێی هەڵدەڵێن . کەـی بسوواتەوە : چاکەی لەگەڵ یەکێکی وادەکات کەقەدری نازانێ کەـی لەخۆی بدات : چاکەو خێری بەخەڵکی دەگات کەـی ناوك دەرێنی ژنێکی دەوڵەمەند دێنێ . کەخاوەن بێ زانابێ : کۆشەوەو کردەوەی پتر دەبێ کەبازرگان بێ : مـاڵی پتر دەبێ .

مـسکەر ابن سیرین دەڵێ مـسکەری کردن درۆ زۆر کردنە .

مشار بەـ دار بڕینەوە لەخـاوەند دارە کە دوور دە کەویتەوەو ئازاری دەدات کەمنداڵ یابرا یاخوشکی خۆی بەمشاری ببڕێتەوەو بیکاتـە دوو پارچە منداڵێکی تریشی دەبێ وە کوو وی جابـرا بی یاخوشك . کەمشاری بگرێ یابیکرێ یایە کێکی تر بیداتێ کە کوڕی هـەبێ کوڕێکی تریشی دەبێ ، کە کچی هـەبێ کچێکی تریشی دەبێ کە منداڵیشی نەبێ ئاژاڵ یا ماڵاتی هـەبێ : یەکێکی تریشی وە کوو وی دەبـێ .

مشت و ماڵ ابن‌سیرین دەڵێ ـ لەخەون دا : نیشانەی پادشایی‌و گەورەیی‌یە کەبیبینێ ـی دەکرد : دەبێتـە نۆکەری پادشای . صادق دەڵێ ـ کار : کەسێکە ڕاستی و ناڕاستی لێك جووێ دەکاتەوە .

مشك . ابن سیرین دەڵێ ـ لەخـەون دا : ژنێکە لەڕووکاردا ئابڕوومەند و لەنهێنی دا کەم ئایینە . کەـی بگرێ : ژنێکی وادێنێ . کەبیبنێ ـ ان لەمـاڵی وی‌دا کۆ بوونەوەو هەمـوویان یەکڕەنگ بوون : هێندەی وان ژن لەماڵی وی‌دا کۆ دەبنـەوە . ابراهیم دەڵێ کەـ لەکەپۆ وەیا لەگوێی وی بێتە دەرێ : کچێکی بێ کارەی دەبێ . کەـ لەگەرووی وی بێتـە دەرێ : کـوڕێکی دەبێ . کە ـ لەقـوونی وی بێتە دەرێ : کچێکی بێ کەلکی دەبێ . جابـر دەڵێ لێکدانەوەی خەون لە بابەت ـی مـاڵی و کێوی وەکوو یەکن . کەبیبنێ ـێك لەنـاو نووێنی وی دایە لەگەڵ ژنێکی ئارەزووی کارێکی ناپاك دەکات . گۆشتی ـ خوواردن : ماڵی ژنی خراپ و زیان خواردنە .

مشکی : بڕوانە ( خۆڵە مێش ) .

مشکی خورما : ابن‌سیرین دەڵێ ـ دزە کەبیبنێ ـ چوە ناو ماڵێ یا دوکانی‌یەوە : دز دەچێتە ئەوێ وەچتی دەدزێ کە پیکوژی نیشانەی‌وەیە کە دزی دەکرێ و بە سەری دا زاڵ دەبێ . کرمانی دەڵێ کە ـ ئەوی بگەزێ نەخۆش دەبێ و لە دووایی دا چادەبێتەوە

معدة بڕوانە ( ئاشگە ) .

منداڵ : ابن سیرین دەڵێ : کەیکێك لە خەونی دا ببینێ کە بۆ ئەوە منداڵ : خەم و خەفەتە و کارو باری لەق دەبێ ابراهیم دەڵێ دیتنی ـ ی جووان : فرشتەیە

مندالی ناحەز ، ماڵە . کەپیاوێك ببینێ شیری بەـێ دەدا ، لەزیندانـی دە کەن . کەپیاوێك یا ژنێك لەخەونیدا ببینێ بۆتەوە شیرە خـۆرە ، لە ئاوات دووا دە کەوێ . ابن‌سیرین دەڵێ کەببینێ کچێکی بووە ، نیشانەی ساخی‌یەولەخانەوادەی‌خۆی‌داشادو کەیفخۆش‌دەبێ یا کورێکی دەبێ کە ببینێ کورێکی بووە : کـچێکی دەبێ . ابراهیم دەڵێ کە منداڵێکی فرێ دراو لە شووێنێکی هەلگرێتـەوە ، لە شووێنێکەوە کەئـومێدی لێ نەکرێ چتێکی بێ دەگات .

موو . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ بۆ پیاوان ، خەمە بۆ ژنانیش خشڵ‌وجوانی‌یە ـی وولاخان ، ماڵێکی کەمە . کەسۆفی ـی سەری خۆی ببینێ درێژ بووە ئایینداری‌یە ، بۆ خەڵکی تر ، خەمە گەورەیەك ببینێ مـووی خۆی تاشی لەگەورەیی دە کەوێ . کەپادشا ببینێ توو کی سەری زۆر بووە ، لەشکری زۆر دەبێ . بۆ ژێر دەستان ، خەمە . کەسێکی ببینێ کەتوو کی بەقسڵ یابەچەقۆی تاشی ، سوودە . پیاوێکی ببینێ مـووی بەسەری‌یەوە نەماوەو بۆتەسەرتاووسی : خزمان ماڵی وی لەناردەبەن . کەمووی خۆی شانە بکات لەکاری خۆیدا سوودی دەست دە کەوێ جابر دەڵێ کەببینێ مووی بن هەنگلی یابەری دەتاشی ، بەئاوات دەگا کەسێکی خۆی لەبنچینەدا سینگی بێ موو بێ و لەخەونیدا بە روکاری ببینێ قـەرزدار دەبێ . هیندێکیش دەڵێن توو ك بەلەشەوە ماڵە کە سەری بتاشێ لەخەم بێ باك دەبێ ، بـەلاَن دەوڵەمەند سەری خـۆی بتاشێ دەبێتە دەروێش . کەدەروێش سەر و ریشی خـۆی بتاشـێ : دەوڵەمەند دەبێ .

مۆر کەنامەبنووسێ وچتی بێ مۆر کات : چتی نهێنی پێدە گات. کەنامەیێکی کراوەوەبی بێ مۆر کات ،چتێکی ئاشکرای بێ دە گات . ابن‌سیرین دەلێ کەمۆری لەسەر گلی دانێ ئاسـوودەیی یە کە گەورەییێك مـۆری بداتێ و بێی بلێ ،برۆ گەنجینەی مۆر کە ئـەو گەورەیە گەنجینەی بەو دەسپێرێ . کەپادشا مۆری بدا بەوی : ئاتاجی پێك دێ . کەیە کێك مۆری بداتێ تاچتێکی بێ مۆر کات : هێندێکی لەپێداویستیەکانی بسێ دە گات .

مۆرانە دیتنی ـ : هاوسایەی دزە . کەـ بەر گی وی بخووات : دز مالی وی‌دەبات کەـی‌بکوژێ : دزان‌دەناسێتەوەومالەکەی‌خۆی‌دەستێنێتەوە

موورتك : (دارە) لە خەوندا دیتنی ـ : پیاوێکی سرشت گرانە وە لە گەلێ خەلکی ناساز گارە داری ـ : پیاوێکی ناشیو دلتێزە .

موورووو ابن سیرین دەلێ کە ببینێ ـ ی دەستکەوتوە : هێندەی وی مالێ دەستدە کەوێ و لەرارەوی (سفر)دا ئاسودەیی دەبینێ لەلای جابریش ـ : نۆ کەرە کە ـ سەوز یاسپی بێ نۆ کەرە کە چاك کارە . هی زەرد نەخۆشیی نۆ کەرە کەیە هی رەش : نو کەری خرابە

مۆمـایی دیتنی‌و خوواردنی لە خەوندا خەمە

مێخەك ابن سیرین دەلێ دیتنی ـ لە خەوندا نیشانەی گەورەییو بێ هەـ لکەوتنە کە ببینێ ـ ی زۆر هەیەو دەیدا بە هەموو کەسێکی : خەلکی ئەوولاتی بێی هەلدەلێن کە ـ بخوات کارەساتە

میداد (پێنووس) ابن‌سیرین دەلێ دیتنی ـ لە خەوندا : داخوازی گوزەرانە و بە ئاوات گەیشتنە کە میدادی لە کەسێکی بستێنێ گوزەرانی

خۆش دەبێ . کە میداد بەرگی وی ڕەش کات : زیـانە . کە خـەون دیتوو نووسەر و میرزا بێ . چاکتریشە .

مێرد ، کە ژنێك ـی هەبێو لەخەونیدا ببینێ کە مێردێکی تریشی هـەیە و بەڵان بەزمو ڕەزمی بوو کینی نەبینێ ، ئابڕوو و ڕێز و ماڵی پتر دەبێ دیتنی ـ : لەدۆستان دوور کەوتنەوەیە لە مێرد دان : قـایلی و ڕازی بوونە . لە ـ کوتەك خواردن : دیاری و بەخشیشی پێ دەکات . فێـڵ لە ـ کردن قایلی دەمەکی ( موقت ) یە و زیانـدارە .

میرزا : ابن سیرین دەڵێ کەببینێ لەخەونیدا بۆتە میرزا (نووسەر) : مـاڵی خەڵکی بەفێڵ دەستێنێو کاری نالەبار دەکا کەببینێ میرزایەتی پادشای دەکرد : سوور لە نەتەوەی پادشای دەبات کەببینێ میرزایەتی خەڵکی دەکرد دڵی خەڵکی دەکرێ . دانیاڵ دەڵێ کەببینێ بۆتە نووسەر بەفێڵو فەرەج ڕۆزی پەیدا دەکات . ئەگەر میرزایەکی زانایەومیرزایەتی بکات : سوودی دەست دەکەوێ کەببینێ هەڵبەستی دەنووسێتەوە خەریکی بـەزم و ئـاهەنگی دەبێ .

میز : ـ لە جێگای خۆی کردن : دەوڵەمەندیو ئازادی و خۆشییە ، کـە ئاوارەیە دەگەڕێتەوە ، کەدەر کراوە : ڕادەگیـرێتەوە لەشوێنی بێجێ کەجێگای نەبێ ـی بکات : لەخەم و قەرزو نەخۆشی ڕزگـار دەبێ کەلەشوێنی وێنەچوو و نادیار ـ بکات : لەخـەڵکی وێ ژن دێنێ وەیا کەنیزەکێکی دەکرێ کەلەجیاتی میز کێم و هەوای لێ بێ منداڵێکی نەخۆشی دەبێ . لەخەونداـ کردن : منداڵ بوونە . کەسێکی ـی بخورواتەوە : ماڵی نارەوا (حرام) دەخووات . میز لەچاڵێکی کردن ماڵێکی زۆر دەست کەوتنە . خوێن بمیزێ : منـداڵی بەکەم و کووڕی دەبـێ .

مێزەر . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ : نۆکەریماڵیە . کەـی خوری یالۆ
کەی لەسەری بێ : نۆکەرە کەی ئایندار دەبێ . کەمێزەری بسووتێ :
نۆکەرە کەی دەمرێ .
مێش . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ : مرۆیەکی سپڵەیە . کەبیبنێ ـ لەوی
وورووکاون : ماڵی لەسپڵەی دەستدە کەوێ . کە ـ بچێتەناو گوویەوە
دووانی لەسپڵەگووێ لێدەبێو سەخڵەتی دەکات ابراهیم دەڵێ دیتنی
مێش لەخەون دا : مرۆی نزم و سووکە . کە ئەوی بکەزن : خەڵکی
چاویان پێ هەڵنایەت . کەمێشی بکووژێ : بەرچاوتەنگی دەبەزێنێ .
مێشە ، ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا : ژنێکی گێل و حۆل و بیابانیە . کە
بچێتە ناو ـ وە کە دارەکانی سەوزو میوەدار و لەکاتی خۆیدا بێ و لە
میوەی مێشەکەی دەخوارد : ئافرەتێکی بیابانی دێنێ یا کەنیزەکێکی کە
لە بیابانیدا پەروەردە کرابێو لەو ئافرەتەوە سوود و کەلکی پێدەگا
کە دارەکانی ـ شێنو بەردار نەبێ : شەڕ و زیانە . کەبیبنێ لە مێشەدا
لە جیاتی داران دڕکو داڵی لێبێو دڕەکەکانی زیانو ئازاری پێبکات
خەمو خەفەتی لە ژنانەوە پێ دەگات .
مێشك ؛ دانیال دەڵێ دیتنی ـ ی سەرو تێسك : ماڵێکە دیار نەبێ . کە ـی
بخووات : ماڵی خۆی صرف دەکات . کەبیبنێ ـی خەڵکی‌تر دەخوات
ماڵی وا ـ دەچووێنێ . کە ـی بکەوێتە سەر زەوی : ماڵی لە دەست
دەچێ . کەبیبنێ ـی سەری ڕژاوەو هەڵی گرتەوەو لەناوکاسەی سەری
خۆی ناوە : سەرمایەی دەستدە کەوێ . جابردەڵێ کە ـی جانەوەرێکی
ڕەوا (حلال ) بخووات : ماڵی ڕەوایە . هی نارەوا : ناڕەوایە .

مێشوولە . ـ لەخەوندا ; پیاوێکی بێ تین و کەنەفت و ناکەسە کاری سووك دەکات . کەلەگەڵ مێشوولەی شەڕێ بکات ; لەگەڵ پیاوێکی بێ تین شەڕێ دەکات . کە بچێتە ناو گەروی وی یەوە ; لەگەڵ پیاوێکی نزم کارێکی سووك دەکات و چتی کەمی لەوەوە پێ دەگات . کە زۆر لە لەشی وی بئالێنو بیگەزن : دەکەوێتە بەر زمانی خەڵکی یەوەو زیانی لەوانەوە پێ دەگات . کە چووبێتە ناو گووێ یا کەپۆی وی یەوە و بیگەزنو ئازاری ئازاری بدەن زیان و ئازاری لەپیاوێکی بێ تینەوە پێ دەگات . کەمێشوولە زۆر بچنە ناو ماڵی وی یەوە خەم و خەفەت رووی تێ دەکات .

مێش هەنگوین ; وەڵام و مزگێنی و قاوە قاوێکی خۆشە . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەون دا ; پیاوێکی ڕۆزی فراوانە . کەمێش هەنگوینی دەستکەوێ ; سوودی پێ دەگات . دیتنی خەڵفەی ـ ; سەر کەوتنە لە کاروباردا کە پێیەوە بدات لەخۆ پەسندی و خۆ ویستی دا چەند برینێکی وەلەشی هەڵدەپەڕێ گرتنی ـ بەدەستی ئابۆری ، ماڵداری دووربینی ، پێش بینی یانی باشە لەکاردا کوژتنی ـ : زیان و لەناو چوونێکی گەورەیە کە بچێتە ناو خەڵفەکەیەوە ; دەولەمەندیو ئاشتی وساز گاری یە . کە لەخەڵفەکەی بچێتە دەرەوە تێ شکان و تازیەیە کەبۆلە ـێك خەڵفەکەیان بگۆڕن پێك شادبوونێکی بەختەوەرانەو خێرو ـوودە .

مێگەل . کەمە بزنێکی لەماڵێ بێو یالەشووێنێکی تر بێ بەڵان هی خۆی بێ : ماڵو سامانو بەهرەیەکی زۆری دەست دەکەوێ کەمە مـەڕو بزنێکی بلەوەڕێنێ و بۆهەر شووێنێکی بەوێ ببات : دەبێتە فەرمان ڕەوای شووێنێکی .

مێو (داری ترێ) : ژنێکی دڵ فراوان و چاك و جووانە .

مێو ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـی سەبی مال و بەهرەیەکی زەرد . نەخۆشی یە کە ـ ی لێ گوم بێ یالەناو بچێ مالی لەناو دەچێ دیتنی ـ بەهەر رەنگێکی بێ : مال و بەهرەیە . کەبینێ ـی وی دەسووتا : زۆردارێك مالی بەزۆر لێ دەستێنێ کە ـ ی خۆی بدابە خەڵکی : مالی خۆی دەبەشێتەوە .

میوان ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا نیشانەی کۆبونوونەوە یەلەچتێکیدا . کەچەند کەسێکی ـی بکات ؛ خەریکی کارێکی دەبێ کە ئەو لە کارانی تر پەك دەخات . کەئەوی بە ـی ببەنە باغی و لەوێدا میوە زۆر بێ . لەرێگای خودای‌دا دەکوژرێ . ابواهیم دەڵێ کە ـی بە بلوێر و چەنگ و چەقەنە بێ ; کارەساتە .

مبیوە ، دانیال دەڵێ هەر ـیەك لە کاتی خۆیدا بخورێ : مال کۆ کردنەوەیە بێ کات مال لەناو چوونە هەر ـیەکی لەخەوندا ببینرێ لێکدانەوەی بەدارە کەیەوەیە ، کە لێکدانەوەی دارە کە باشبێ باشە دەنا خراپە ـی ترش : خەمە . ـی نەگەیشتوو مالی ناڕەوایە . ـی هاوینێ لەزستانی‌دا خواردن : نەخۆشیە . ابن سیرین دەڵێ ـ ی تەڕ و شیرین : سوودە کە بیخووا کەلە دارە کەی لێکاتەوە مال کۆ دەکاتەوە .

مێووژ ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا ; مال و بەهرەیە ابراهیم دەڵێ کە ئاوی لە ـی جووێ کاتەوە ئاوی ڕەوایە کە زانایەك خۆشاوی بخوا کارو کردەوەی پتر دەبێ .

ناژتن ؛ ـی کەسێك یا چتێکی : کارێکی مەردانـە لەو ڕوو دەدا .

ناڵ ؛ کە لەخەونی دا ـی ئەسپی هەبێ : لە میرو پادشاوە سوودی پێ دەگا بەڵام کەمی ئێستران بێ : لە گەورەیێکەوە ئاسوودەیی‌یە . ـی کەرێ بێ : لـە ڕاڕەوی ( سفر ) دا سوودی دەستدەکـەوێ . کە ناڵبەندێتی بکا : کۆچ دەکات .

نـامە ؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی بەستراو و مۆر کراوی پێ‌یە : قسەیەکی نهێنی دەبیێ کە ـی ئاوەڵەی ببینێ ؛ قسەیەکی ئاشکرا دەبیێ . ابراهیم دەڵێ کە نامەیەکی سەر بەمۆری هەبێ وەڵامێکی پێدەگات کە ـ کەی بکاتەوە بێ خەم دەبێ . کـە مۆری ـ کـەی شکانـد و خوونێندی‌یەوە ؛ نیشانەی ڕێز و پلەیە ، کەخەون بێن نەخوونێندەوار بێ هێندێکیش دەڵێن ئەنجامی تەمەنی‌یەتی . جابر دەڵێ کەببینێ پادشا ـی داوە بەوی‌و لەوێدا چتی خۆش نووسرابێ ؛ ئاسوودەیی و شادمانی‌یـە؛ بەڵام هی‌ناخۆش : ترس‌و هەراسە کەببینێ پیرێك یا پیاوچاکێك ـی بداتێ نیشانەی وەیە کە ئەوپیرە ئامۆژگاری وی دەکات صادق دەڵێ کەببینێ لەناو ـ کەدا چتی‌خێر نووسراوە ؛ ئاتاجی پێکدێ . کە لەوێدا قسەی شەڕ نووسرابێ : کاروباری پێك نایەت .

نان ؛ ابن سیرین دەڵێ : ـ شادمانی‌یـە کە ـ ی ناخۆش ببینێ : ژیانێکی ناخۆشە کە ـی بکڕێ‌و بیباتەوە ماڵێ : ڕۆژی ڕەوایەو سامانە کە ـی بدات بە کەسێکی : ئاسوودەیی بەو دەگەیەنێ . دانیاڵ دەڵێ کـە دووسێ نانی دەستکەوێ لەخەم ڕزگار دەبێ . کە نەتوانێ ـی بخوات مەرگی نزیکە . کەببینێ ـی زۆر هەیەو ناتوانێ بیخووات : تووشی خەمان دێ . ابراهیم دەڵێ دیتنی نانی گـەرم : زیان و هەرەیـە . هی ووشك وانیە خواردنی نانی کەبەك گرانی‌یە

جابر دەڵێ دیتنی نانی هەرزن : سـەختی گوزەران و پارێزگاری یە . -ی جۆ : پارێزگاری یە . -ی برنج : کار بەسترانە . -ی نیسك و پاقلەو نۆك : خەم و تەنگ دەستی یە . کەپادشا ببینێ نانێکی هەیە : سامانی دەدەنێ . دیتنی نان کردن : کەمی گوزەرانە . دیتنی هیچ چتێك لەخەوندا لە نان باشتر نیە .

نەخش ؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ میچی خانوو و دیواری دەنەخشێنێ : بـە گیتی هەوادار دەبێ . ابراهیم دەڵێ لە خەوندا دیتنی - و نەخشکاری : پووچە . کە دەستی خۆی بە خەنەی ڕەنـگ بکات : لـە گرد و کـۆ (کسابت) دا فێڵێ دەکات .

نەخۆشی ؛ ابن سیرین دەڵێ کە کەسێك لەخەونی‌دا ببینێ نەخۆشە : نیشانەی بێ ئایینی و پێکولێ چینی یە . کە لە کاتی نەخۆشی‌دا خۆی بەساخ ببینێ و لەماڵی خۆشی نەبێ و لە گەڵ کەسیش قسەی نەدە کرد : نەخۆشیە کەی درێژە دە کێشێ و بەرەو بقەیەو دەمرێ بەڵان کە قسەی بکاوهاونشینی خەڵکی بکات : لەنەخۆشی یە کەی زوو چادەبێتەوە . کەخۆی بەنەخۆشی و ڕووتی ببینێ　زوو دەمرێ

خەون لێکدەرەوان دەڵێن نەخۆشی لەخەوندا : نیشانەی ناپاکی و خەم و خەفەتە کە لەلایەن میری و یا خێزانی یەوە پێی دە گات . دەشڵێن کە لە ئاوی دەردی نەخۆش بناڵێنێ　لە خەم و پەرۆشی دڵقایم دەبێ .

نەردێن ؛ کە لە -ێ دا بدۆڕێنێ ، لەلای ابن سیرین کارێکی پووچە . کەلە -ێ دا بدۆڕێنێ و بیباتەوە : بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ　کە نەیباتەوە وانی یە

نەسرین ؛ دیتنی - لە خەوندا　ئاسوودەیی یە و منداڵە . کەببینێ دەسکـە -یێکیان داوەتێ : لە نێوانی واندا ووتوو وێژ پەیدا دەبێ .

نەفت ؛ دیتنی - لەخەوندا : زیانە　کە نەفتی لەخۆی هەڵسووێ لەگەڵ ژنێکی

پێکارە و سووك دەست تێکەڵاو دەکات . یـا ماڵی نارەوا دەخووات .

نەعنـا ؛ لە خەوندا ـ دیتن : خەفەتە که ـ لە زەوی‌یەکی دا شین بووبێ
تووشی خەمو خەفەت دێت . کەبیبنێ ـی لە زەوی هەڵدەکەندو فڕێی
دەدات : لـە خەم ڕزگـار د بێ

نەقێم ؛ ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا گەورەیی‌یە . کە ـی بزر بێ یا
بشکێ کەمو کووڕێ دەکەوێتە ناو ماڵی‌یەوە یا منداڵی دەمرێ که
پیاوێك ببینێ ـ و تاجی هەیە : نیشانەی گەورەیی‌یە . بۆ ژنانیش نیشانەی
مردنە بۆ خەڵکی تریش نیشانەی گەورەیی و پلەیـە .

نەهەنـگ ؛ دیتنی ـ لەخەوندا پیاوێکی دزە کەببینێ ـ ئەوی بـۆ لای
ئاوێ کێشـاو نقومی کرد : لە ئاو دا دەخنکێ که ـ ئەوی بگەزێ :
لە دوژمن زیان دەبینێ . کەببینێ ـ ئەوی قووت دا ؛ ماسی ئەوی لەناو
دەبات . کە لەگەڵ ـ شەڕێ بکاتو بەسەریدا زاڵ بێ بەسەر دوژ ـ
منانیدا زاڵ دەبێ . کە زاڵ نەبێ بە پێچەوانەیە . دیتنی گۆشت و ئێسـك
و پێستی وی ؛ زیـانە

نەبـات بڕوانە ( ڕووەك ) .

نـزا ( دوعا ) ابن سیرین دەڵێ لە خەوندا ـ کردن ئاتاجی پێکهاتنە
پاڕانەوە نیشانەی دڵپاکی‌یە لەڕاست خەڵکی‌دا .

نزگەرە؛ ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـ ی دێتێ : قسەی ناشایستەی لە زاری
دێتە دەرێ ابراهیم دەڵێ کەلەکاتی نانخواردنی‌دا ـی پێتێ نەخۆش
دەبێ

نزم بوون : ماڵو ناوبانگـو شانازی لەدەست دانە

شتوو کە- لەخەوندا بەناوی خودا لەلای خۆی هەڵیگرتبێ بەپیرو ڕای ابن‌سیرین لەخەمو خەفەت ڕزگاری دێت ، کەقەرزدار بێ بۆی دەدرێتەوە کەنەخۆش بێ چاك دەبێتەوە ، کەگیرابێ بەر دەدرێ ، کەلەهەندەرانیش بێ دەگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی . کرمانی دەڵێ کەیەکێك نشتووی بۆ یەکێکی تر بنووسێو بیداتێ : خەڵکی خێرو سوودی لێ دەبینن .
کەنشتوو بۆ خەڵك بەپارە بنووسێ : خەمگین دەبێ .

نووم بوون : بڕوانە ( نوقووم بوون ) .

نمەد بڕوانە ( لباد ) .

نۆبەتی . ابن‌سیرین دەڵێ کەهەمیشە -ی لێ بێ : هەمیشە خەریکی گوناه و داوێن پیسی‌یە پێویستە پەشیمان بێتەوە تالەسزا ڕزگاربێ . کرمانی‌دەڵێ کەبینی -ی درێژە دەکێشێ : لەش ساخ و تەمەنی درێژ دەبێ . کە-ی کەم تر بێ تەوانی تریش کەم تر دەبێ .

نووسەر دانیال دەڵێ کەبینی چێیکی نووسی بەو مەرجە کەخۆی - بێ بەفێڵ ماڵی لەخەڵکی دەسێنێ . کەزانایەك بینی -ی دەکرد : سوودە کەبینی ئەفسانەو چیرۆکی دەنووسی‌یەوە خەریکی کاری گێتی دەبێ کەبینی نامەی بۆ گەورەیێکی دەنووسی سوودە کەبەسووری بنووسێ خەریکی خۆش ڕابووێری دەبێ ، بەزەردی : نەخۆشی‌یە ، بەسەوزی نووسیی خۆشناوی‌یە کەبەزێڕ یابەزێو بنووسێ سوودی لەپادشاوە پێ دەگات .

نوستن . ابن‌سیرین دەڵێ - لە خەون دا بۆ مردوو یا بۆ کەسێکی ـادیوو دابۆشرابێ : هۆی ئاسوودەیی ورزگاری‌یە. لەگەڵ ژن نوستن : ترس ونایاکی‌یە لەگەڵ پیاو نوستن : ئارامی‌و هێمنی‌یە لەگەڵ منداڵ - :

ڕەنج و نیـگەرانی‌یە . کەبینی یەکێك لەسەر تەختی یالەسەر دۆشەکی نوستووە . نیشانەی گەورەیی‌یە ، بەڵان لەلایەن ئاینەوە پاریزگاری‌یەو بێ ئاگا دەبێ چونکوو نوستن بـێ ئاگایی‌یە کەبینی لەشووێنێکی نزمدا لەسەر دۆشەکێکی نوستووە : نیشانەی سـوو کی‌و کەنەفتی‌یە کرمانی دەڵێ خەون بۆ ترسەنۆك : هێمنی‌و دڵنیایی‌یە ، بۆمردووانیش بەخشرانە ، بۆ نەخۆشیش چابوونەوەیە ، بۆ گیراویش بەربوونـە . کەبینی لەنێو مردووانداا نوستووەو کەسێك ئەوی وەئاگا دێنێ لەنێو خەڵکیدا بەناوبانگ دەبێ .

نوشادر دیتنی نوشادر لەخەوندا : خەم و خەفەتە .

نوقووم . کەبینی لەبنی دەریایەدا - بوو و مرواری هێنـا دەرێ : فـێری هونەرو زانست و زانیاری دەبێ‌و یامالێ لەپادشاوە دەستدە کەوێ . کە بچێتە ناو دەریاو هیچ دەرنەهێنی : خەریکی زانـست دەبێ‌و هیچی دەست ناکەوێ . ابن سیرین دەڵێ کەبینی لەدەریایەدا نقووم بووەو مـرد : زۆرداریێك ئەوی لەناو دەبات. جـابر دەڵێ کەبینی ئاو ئـەوی نقووم کردو هێنابە دەرێ نیشانەی ئەوەیە کەدەست لەدونیایە هەڵدە گرێ‌و ڕوو لەبەسلان ( قیامەت )ێ دە کات . کەبینی چوار پێ‌یەك یادوو کابێك یاخانووێك یاباخێك - بوو لەکارێکیدا تووشی تێماوێ دێت لەنوابەدا رزگار دەبێ .

نۆك دیتنی - لەخەوندا بەتەری و ووشکی . خەمە بەڵان کەلە گەڵ گۆشت لێنرابێ‌و بێخوورات : خەم ئەم تر دەبێ .

نۆکەر ابن سیرین دەڵێ کەبینی بۆتەـێ یە کێکی : لەکارێکی سەخت ئازار دەبینی . جابر دەڵێ دیتنی - شادمانی‌یە صادق دەڵێ کەبینی - و یا کارە کەری فرۆشتووە باشە ، بەڵان کەیانکرێ : خرابە .

نوویژ ؛ کەلەخەونیدا ببینێ بەرەو رۆژ هەڵاتی - ێ دەکات : دەچێتە حەجێ و یا ئارەزووی ئایینی فەلان دەکات کە بەرەو رۆژئاوایە -ی بکات : رووەلەجوولەکان دەکات . کە بەرەو باکوور - بکات پشت لەموسلمانەتی دەکا کە - بکاتو نەزانێ روو کە (قبلە) لەکوویێیە لەرێگای ئاییندا سەرسام دەبێ کەلەمزگەوت یا لە قوتابخانەیەکی - بکات بەپێشنوێژی سەرۆکی ئەو وولاتی گوویێ لە مستی . وی دەبێ

نووێنەر ؛ کەلەخەونیدا ببینێ بۆتە نووێنەری پادشا بەومەرجەی کەلەکاری خۆی دا مرۆڤایەتی هەبێ بەختەوەرێتی یە کە بووبێتە - ی قاضی هەر بەو جورەیە .

نێچیر ؛ ابن سیرین دەڵێ کە ببینێ -انی دەشتێ رامی وی بوون : دەبێتە سەرۆکی هۆز . جابر دەڵێ کەببینێ بە تەڵە یا بە داو -ان دەگرێ بە فێڵ ماڵ لە دانیشتووانی دەرەوە دەستێنێ بەڵان کە -ان لەگەڵی باخون و رامی وی بن دەبێتە نزیکانی پادشا

نێردبوان ؛ ابن سیرین دەڵێ کە وەسەر -ی بکەوێ ، کە لە گڵو خشتی بێ نیشانەی باشی کار و کردارە کە دارێ بێ ئایینی یە . کە لە بەردی بێ هێزی دەست دەکەوێ ابراهیم دەڵێ کەببینێ چۆتە سەر - : سوود و قازانجە کە لەو خەوارێ بە پێچەوانەیە

نێرگس ؛ دانیال دەڵێ - بەاوێکی ناسکە کە ژنێك ببینێ یێکی تازەی هەبە : کچێکی جووانی دەبێ کە مێردی نەبێ شوو دەکات کە -ی لەزەوی هەڵکەنێ ژنەکەی بەرەلا دەکات ، یا منداڵی دەمرێ کە ژنێك ببینێ -ێکی دا بە مێردەکەی لێی جووێ دەبێتەوە

نێری لە خەون دا بیاوێکە پێشڕەوی لەشکری بێ کە نێری یێکی دەستکەوێ و سوواری بشتی بێ ئەو بیاوە دەبێتە پێشڕەوی لەشکر

کەکابرا لەشکری نەبێ ؛ لەگەڵ پێشڕەوی دۆستایەتی پەیدا دەکات و دەوڵەمەند دەبێ .

نێرینه. ابن سیرین دەڵێ کەسێك لەخەونیدا خۆی بەنێرەمووك ببینێ و وەکوو ژنان خۆی برازێنێتەوە ؛ ڕووشەیێکی تووش دێ . کەببینێ لەگەڵ نێرەمووکان دانیشتووە ؛ دەبێته دۆستی دووژمانو خراپان .

نێزه . کەببینێ ـیێکی هەیە ؛ منداڵێك یابرایەکی دەبێ . کەژنی نەبێ ماڵی دەستەکەوێ . کەلەگەڵ ـی چەکێکی تەواوی پێبێ ؛ پایەی لەگەورەییێکەوە دەستەکەوێ کەپادشا ـی بدا بەوی ؛ لەپادشاوە سوودی پێ دەگات . کەـی خۆی بدا بەکەسێکی ؛ لەوەوە سوودی پێ دەگات کەـی بەدەستەوە بێو بشکێ ؛ لەشەڕی دووژمنان زیان دەبینێ . کەـی کەـی بۆیەکێکی باوێ ؛ ووتەی خراپ بەوی دەڵێ . کەبەـی یەکێکی بریندار بکات بوختان بەکەسێکی دەکات . کە لەلەشی کەسێکی بدات و تێی ڕاچێ ؛ قسەی ڕەق و ناخۆشه کەکەسێك ـی لەوی بدات و بێشێ ؛ لەقسەی وی خەمناك دەبێ . کەنێزەی وی ببەن ؛ کارو باری تێك دەچێ .

نێزەی گچکە . ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی بەدەستەوەیەو چیتری پێنەبێ منداڵێکی دەبێ کەببینێ لەگەل ـی چەکێکی نریشی پێیە ؛ لەمیر (پادشا)ی بەوە سوودی پێدەگات و بەسەر دووژمنادا زاڵ دەبێ کەـی فڕێ بدات ؛ ووتەی خراپ بەکەسێکی دەڵێ کەبەـ یەکێکی بریندار بکات ؛ بوختانی بەو کەسی دەکات .

نیسك (و نیسکینه) . کرمانی دەڵێ بەلێنراوی ( کولاوی ) ببینێ خەم و خەفەته . ابن‌سیرین دەڵێ دیتنی نیسك ؛ باشه چونکە حضرەتی ابراهیم پێی خۆش بووه . کرمانی دەڵێ خواردنی نیسك خرابه . ابراهیم دەڵێ نیسك ماڵه لەلایەن ژنانەوە بەدەردی سەری دەست دەکەوێ .

نیشاستە ؛ لەخەوندا بیبینێ کە ـ ی دەخوارد : خەمە و دەڵێن نەخۆشی یە .
کە بە ـ هەڵوای بکاو بیخوات : سوودە . کە لە گەنمی ـی بکا ؛ لە
گردو کۆ (کاسبی) ی خۆی بەهرەیەکی دەستدە کەوێ .

نێوچاوان ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا قەدروپایەی مەردومە هێندێکیش
دەڵێن منداڵێکە کە لەنێو خانەوادەی وی‌دا دەوڵەمەند دەبێ کە لەـی
نیشانەیێکی بیبینێ ناوبانگ‌و پاکداوێنی‌و پارێزگاری دەردەخات
کە کەسێك ـی وی بریندار کات‌و خوێنی لەبەر بڕوات : پایەی بەرزتر
دەبێ کە باری نارچاوانی گۆڕابێ زیانێکی بێ دەگات . کە مووی
لە ـی هاتبێ قەرزدار دەبێ کە مووە کە سوور یا سپی بێ : قەرزە-
کەی لەلایەن خێزانیەوەیە . کە ـی ئەستوور بێ : ماڵی پتردەبێ . کەلە
ـی وی‌دا مار یا دووپشك دەربێ : هێندەی وی زیان و ئازاری لە
دوژمنانەوە پێ دەگات .

جابری مغربی دەڵێ کەلە ـی دا چاوێکی بیبینێ : لە گەورەیی خۆی
را بەفیز دەبێ . کە زۆر چاوان لە ـی خۆی‌دا بیبینێ هەرواتای سەرە-
وەی هەیە کە بەخەتێکی سەوز لەسەر ـی وی نووسرابێ : منداڵێکی
زاناو پارێزگاری دەبێ .

نینۆك ؛ ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا : نیشانەی هێزە . کە ـ ی بە
مقەستی ببڕێ : ئاینی بەهێز دەبێ ابراهیم دەڵێ دیتنی ـ لەخەوندا
نیشانەی توانایی یە و ماڵی دەستدە کەوێ . کەبیبێنێ ـ ی لە بن کەوت
کەم‌و کووڕی دە کەوێتە ماڵی‌یەوە کە بیبینێ ـی وی لە نوویڕە
ڕوواوە : ماڵی لەدەست‌چووی دەستدە کەوێتەوە کەلە خەونی‌دا ـەکانی

ڕووناك و پاك ببینێ : دەوڵەمەند دەبێ كە نینۆكەكانی ڕەش و شین بن : كێشە ڕووشەیە . كە ببینێ نینۆكەكانی وی درێژ بوون : خراپە

نێووك ( ناووك ) ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەونا : ژنە یا كەنیزە كە كە ببینێ ـی وی كەوتووە : ژنەكەی بەرەڵا دەكات یا كەنیزەكەكەی دەمرێ . كەببینێ ـی وی گەورە بووە : مـاڵو بەهرەیە . كەببینێ لە ناوكیویدا كونێكهەیە لە كەیخودایەتی خۆیدا زیان دەبینێ .

جابر دەڵێ كەببینێ لە ناكیەوە تا سینگی موو ڕوواوە لەسەر ڕێو شووێنی بـاش دەڕوات كەببینێ لـە بنچینەدا نـاوكی بـڕاوە زاناو هوشیار دەبێ . ابراهیم دەڵێ كەببینێ لەناوكیەوە تا سینـگی هەڵدڕاوە ؛ زانا دەبێ بەڵام ماڵی دەڕوات .



وەزیر لەخەوندا بوونە ـی پادشـایەکی : دەوڵەتە ، بەڵاَن کەپادشایەکە خـراپ بێ : بەپێچەوانەیە . کەببینێ ـێك کڵاَوێکی بەوی بەخشی : بەسەر خەڵکیدا دەبێتە فەرمانڕەوا کەببینێ وەزیر هاتۆتە ماڵی وی : نیشانەی خەفەتە لەلایەن پادشاوە . کەلەگەڵ وەزیری چێشتی بخوات گەورەیی‌یە کەببینێ ماڵی ـی کاول بووە وەزیـر نەخۆش کەوت یا پادشا ـی لێ خـست یانەسپە کەی لەقەی لێدا یالەئێستری کەوتە خوارێ یاگا بەشاخی لێیدا : هەمووی بەڵـگەیە بۆ کەوتنی وەزیر .

وەسەر کەوتن : بڕوانە ( سەر کەوتن ) .

وەسمە کەسێکی کەببینێ لەـامانی ویدا ـ زۆر هەیە : خـەم و خەفەتە . کەـی هەڵکەنێ و فڕێی بدات : لەخەمان ڕزگار دەبێ . کەوەسمەی بەخێزانەکەی خۆی : لە یەکتر جووایەز دەبنەوە .

وەنەوشە : هەستێکی زۆر بەرزی دڵداریێتی‌یە بەدیتنی وەنەوشە لەژنێکی یالەکەنیزەکێکی چێکی پێ دەکات یامنداڵی دەبێ . بەبیروڕای ابن‌سیرین کەلەکانی خۆی دابێ بەڵاَن کەلەزستانێ دابێ : کۆسپەیەکە دەکەوێتە ناو کاروباری زاواو یابووکێ دا کەـی لەداری خۆی بەجووایەزی ببینێ : خەم و خەفەتە کەژنێك ـی لەدار بکاتەوەو پێدا بەمێردەکەی بەرەڵاَدەکرێ کەدەسکە ـیەکی بەەن بەوی : ناکۆکی‌وجودایی یان دەکەوێتە نێوانی‌یەوە . لکە وەنەوشە دیتن : کەنیزەکێکی بەدخو و ناسازکارە . کەـی دوور لەلکەکەیەوە ببینێ : خەم و خەفەتی دەخوا هـەر کەسێکی دەسکە ـێکی بـدات بەوی : لێك دوور دەکەونەوە مغربی دەڵێ لکە وەنەوشە کەنیزەکێکی بەدخوو و ناسازکارە .

وورتار ( خطبة ) . ابن سیرین دەڵێ کەبینی لەســەر مێنبەری ـی دەدا کە خۆی لەوان بێ : رێزو گەورەیی دەستدەکەوێ . کەلەوان نەبێ دەچێتە رارەوێ ( سفر ) و زۆر درەنگی پێ دەچێو ترس‌و سامیشی تێدا هەیە دەڵێن ئەگەر دەوڵەمەند بێ : دەبێتە هەژار . کەبینی پادشایەك ووتاری دەدا ، کەپادشا پیاوێکی باش بێ دادگەری دەنوێنێ ، کەخـراپ بێ پەشیمان دەبێتەوە . کەبینی ژنێك لەسەر مینبەری ـی دەداتو ئامۆژ. گاری دەدا ، مێردەکەی وی ریسوا دەبێ . ـ دان لەبابەت ژن هێنان‌و یاشوو کردنەوە ، نیشانەی خێرو چاکەو پیاوەتی و سوودو بەهرەیە .

ووتوو لێدان ، ئارامی و بەختیاریتی ناو خانەوادەیە . ووتووی بەتاڵ : ماڵو سامـان لەناو چوونە .

وورچ . ابن سیرین دەڵێ دیتنی ـ لەخەونەدا دیتنی ؛ دوژمنی سووك‌و دزو گێلە . کەبینی سوواری ـی بووە لەپادشاوە زیان‌و کەنەفتی پێدەگا کەـی بکوژێ ، بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ . کەبینی گۆشتی ـی خوارد یا کەوڵەکەی هەڵگرت ؛ ترس‌و هەراسی پێ دەگات . کرمانی دەڵێ ـ : پیاوێکی بەدبەخت و شێتە . دیتنی ـی مێ : ژنی بەدبەخت و شێتە . کەـێکی مێ بگرێ : ژنێکی بەوچەشنەی دەخووازێ . کەنێر بێ : پیاوێکی بەو چەشنەی روو لەماڵی وی دەکات . کەـی بکوژێو لەسەریشی سووار بێ : بەسەر دوژمنـان دا زاڵ دەبێ .

وورگ . وورگی وولاخ و ئاژالان ، ماڵی رەوایە . کەلێنراێو بیخووا ، پڕ سوودە . کەـ پڕ لەریخ بینرێت ، ماڵی نارەوایە .

ووشتر ( حوشتر ) . دیتنی ـ : ماڵ و سامانه . کاروانی ـ ان : خۆ گری و پشوو درێژی بەو کاروباری بەچاوتێژی بەوەیە . کەـێکی زۆر لەشوێن یالەدیێ بەکیدا کۆبینەوە : نەخۆشی یالاناو یادوژمنێکی زۆر ڕوو لەوێ دەکەن . کەـەکان باریان گەنم بێ یاجۆ : لەدوژمنان خێرو خۆشی و بەهرەی دەستدە کەوێ . سوواری ـ بوون : جووان بوونێکی دەمەکی ( مۆقت ) یە . لەخەون دا ـی مێ دیتن : بەئارەزوو گەیشتنە . گۆشتی ووشتر : ماڵە . کەـان بارە دەغلیان پێ بێ : خێرو بەهرەی لەدوژمنان دەستدە کەوێ . سوواری ـی یەکساڵە بوون : خەمە . کەخوێن لەلەشی ووشترە کەی خۆی بێ : بەختەوەر دەبێ . کەبەسوواری ـی بەغار بڕوات : ڕاڕەوی یە . کەبەسوواری ـی ڕێگای لێ گووم بێ : ڕێگاو شووێن و کاروباری والـێ دەگۆڕێ کەتە گیری پێ نەکرێ

کەلەسەر ـی هاتوو چۆ بکات : خەم و خەفەتە کەووشتری مێ ببینێ لەخەوندا : ژنی دێنێ کەـە کە لەگەڵ دەیلاخەکەی بێ : ژنێکی کە دەیەوێ یامندالی لەگەلە یادەبێ . کەـ بەشووێنی ویدا غاردا : خەم و خەفەتە تووڕەیی و سەر کێشی ـ خەم و خەفەتە . ـ لەوەڕاندن کەهی خۆی بێ ووڵاتێکی دەکەوێتە بەردەستی و خەڵکی وێ ڕامـی وی دەبن کەشەڕ لەگەڵ ـ بکات : لەگەڵ بێگانەیێکی ناکۆکی و دوژمنایەتی بۆبەیدا دەبێ ـ دۆشین : ماڵی لەگەورەیێکی یەوە دەستدە کەوێ کەلەجیاتی شیر خووێن لەگوانی بێ : ماڵێکی ناڕەوای دەستدە کەوێ کەووشترێکی مێ بکرێ یابە کێك بیداتێ : ژن یا کەنیزە کێکی دێنێ کەـە مێ بەکەی هەلبێ یادز بیبات : ژنەکەی لێ جووێ دەبێتەوە یاناکۆکی یان دە کەوێتە نێوانی یەوە .

ووشتری مێ ی هەر کەسێکی بمرێ : ژنەکەی دەمرێ . ووشتری مێ ی هەر کەسێکی بزێ ژنەکەی دەزێ و ماڵیشی زۆر دەستەدەکەوێ .
دیتنی ووشتری مێ : بەڵاوات گەیشتنە گۆشتی - خواردن : نەخۆشی یە . کە هەوساری -ی بکێشێ : لەگەڵ پیاوێکی فەرمانبەردوژمنایەتی لێ ڕوودەدات . لە چۆلێ - ێکی زۆر دیتن یا پەیدا کردن یا بە دەست کەوتن : تووشی گەورەیی و دەستەڵات دێت . کە - ێکی بکووژنەوە و گۆشتەکەشی دابەش کرێ : لەو شووێنیدا پیاوێکی گەورە دەمرێ و ماڵیشی بەمیرات دا دەبەشرێتەوە . کە ووشتر لە گەڵ هەر کەسێکی بدوێ . خێرو چاکەی پێدەگات . کە -ی کەنەفتو زەبوون بکات بە سەر دوژمنانیدا زاڵ دەبێ . میکەلە - لەهەر شووێنێکیدا کۆبێتەوە : لەو شووێنیدا دوژمن کۆدەبێتەوە یا لافاو و یا نەخۆشی ئەوێ وێران دەکات .

ووشترموانی : خاوەند تەگبیرو کار ڕاستکەرەوەیە .

ووشترخۆرە ﴿ گیایەکی درکاوییە ﴾ دیتنی - و یا وەر گرتنی : هەر خەم وخەفەتە . کە پیدا بە کەسێکی یا پێی بفرۆشێ : لە خەم و خەفەتی ڕزگاری دێت . کە -ی دەرخواردی ووشتران بدات : بۆ ووشترەکان تووشی خەم و خەفەتی دێ .

ووشتر مورغ : لەخەوندا پیاوێکی بیابانییە . هی مێ : ژنێکی بیابانییە . کە -ێکی مێ بگرێ یا یەکێك بیداتێ ژنێکی بیابانی دێنێ یا کەنیزەکێکی دەکرێ . سوواری - بوون : لە چۆلو بیابانیدا دەبێتە ڕارەو ﴿ مسافر ﴾ یا بە سەر یەکێکی بیابانی دا چیرە دەبێ و بە کارێکی گەورە دەگات . کوژتنی - : دەستەڵاتە بە سەر کابرایەکی بیابان نشین ا .یەك و یا بەسەر —

یا گۆشتی و شترمورغ دەستکەوتن : ماڵی لە کابرایەکی بیابانی دەست دەکەوێ بەسواری - چوونە هەواو هاتنەوە خوار : لە گەڵ یەکێکی بیابانی دەچێتە ڕاڕەوێکی دوورودرێژو پڕ سوودو قازانج دەگەڕێتەوە وولس (حیوان) کە کەوی بێ گشتیان نیشانەی مزگێنیو ووەلامی خۆش و ئاوەدانیو زۆروزەوەندی ماڵو سامانە. ئالیکو خواردەمەنی بەوان دان : لە کرداردا سەر کەوتنە. دیتنی - لە کاتی غاردانی دا : نەخۆشی و لەش گرانییە. کە - وە دووی وی بکەوی چتێکی نرخداری دەستگیر دەبێ. - قەلە و دیتن سالی پڕهات وپیت وپیرۆزی یە. - ی لاوازدیتن نیشانەی ئەوەیە کەسوودو کەلك ڕوو لە بڤە (خطر) یە.
- ڕقی هەڵستی ئومێدوبایەخی (اعتبار) یە

ویرانی : ئەگەرخۆی لەوێرا نەیێکیدا ببینێ ویاکاولێکیدا ببینێ نیشانەی کارەسات و تێکچوونی کارو بارە ابن سیرین دەڵێ دیتنی - لەخەوندا : نیشانەی گومڕاهی یە کەببینێ شوێنێکی ئاوەدان کاوول بکات. لە کارو باری دا گومڕادەبێ.

هاتنەخوارەوە [ نزم بوون ] ناو و ناوبانگ و سامان و مایەی شانازی لە دەست دانە ابن سیرین دەڵێ کە لەبان یا لە کێوێکی هاتە خوارەوە : کەم و کووری دەکەوێتە ناو ماڵ و گەورەییەوە . کەبینی لەبلندییەوە هاتۆتە خوارێ شکست لەماڵی وی دەکەوێ کە لە پلیکانی خشت و گاڵ بێتە خوارێ : زیان بە تایبەتی دەگات .

هاروێ بڕوانە ، خەیار ،

هاواروداد ، ابن سیرین دەڵێ کەبینی ـیان دەکرد : ئەوشووێنە پیرۆز نیە و دانیشتووانی وێ بەرتەیان تێدەکەوێ بە زیانەوە . کە فەرمانڕەوای ئەوشووێنی ـی بۆ بکرێ : ئەو گەورەیە زیان دەبینێ .

هاونگ ، ابن سیرین دەڵێ هاونگ و دەسکەکەی لەخەونەدا نیشانەی دوو هاوکار (شریك) انە کە لە گەڵ یەکتری ناسازبن . کە تەنها یەکێکی لەوان بینێ : بێ سوودە کەبینێ لە هاونگیدا چتێکی دەکوتێ کە خواردەمەنی بێ سوودە ، کە دەرمانانی گەرم بێ : ماڵە ئەوەی دەیکوتێ کە شیرین بێ سوودە ، کە تاڵ بێ : زیانە . ابراهیم دەڵێ کە بینێ گەوهەران دەکوتێ : سوودە .

هاوین ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەونەدا دیتن : پادشای سەختە ، کە گەرمبێ و زیانی بۆ مرۆڤان هەبێ و ئازاریان بدات نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤانی ئەو وولاتی خەبەر و خۆشیان لە پادشای دەستدەکەوێ . کە ـ لە کاتی خۆیدا ببینرێت بەچەشنێکی وا کە وولات خوش و دارانیش بڕ بەربن ڕێزوسامانی پتر دەبێ و بەئلوات دەگات ، کە بێ کات بێ : بەپێچەوانەیە

هەیروون [هەنەم] ابن سیرین دەڵێ ـ کردنی چێی شیرین : سوودە و هی ترش و تاڵ خەم و خەفەتە .

هەراهەرا : هەنگامەیە . ( ـی کالیسکەو عەرەبانە ) وون کردنی خشڵ و یا پارەو یا کیسەی پارەیە لە ـ دا هاوکاری کردن نیشانەی ئاشکرا بوونی یەکێکە لە رازە نهێنی یەکانی . لە ـ چوونە دەر رزگاری یە لە دادوەری ( محاکمە ) دا .

هەرمێ ، لەکاتی خۆیدا ـی سەوزو شیرین خواردن ; ماڵو سامانە . کە ـی زەرد بێ نەخۆشی یە . کە ترش و ناخۆشبێ : خەموخەفەتە ئەگەر ـ سەوز یا سوورو بێکاتو تامی شیرین بێ ماڵی رەوای دەستدەکەوێ کە ترش و ناخۆشبێ : خەمە . هێندێکیش دەڵێن ـی سەوز و شیرین و لەکاتی خۆیدا ; بەئاوات گەیشتنە ، خواردنیشی : سوودە

هەژدیها ؛ لە خەوندا ـ کوژتن و گۆشتی وی خواردن زاڵ بوونە بە سەر دوژمناندا و ماڵیان لێ دەستێنێ کە ـ ئەوی بخوات : مەترسی هەیە کە دوژمن بیکوژێ سواری پشتی ـ بوون و ـ رامی وی بێ دوژ- منێکی گەورە کووێ لەمستی وی دەبێ و کاروباریشی رێکوپێك دەبێ ابن سیرین دەڵێ ـ دوژمنی گەورەیە شەرلەگەڵ ـ کردنو بەسەری دا زاڵ بوون ; زاڵ بوونە بەسەر دوژمناندا کەبینی ـی هەیە لەگەڵ گەوران نێوان پەیدا دەکا ـ بەروباوەرو پارێزگاری تاقی کراوەوەیە ئایدە ( مجسمە ) ی هەژدیها : ژنی بەد حوورە

هەشتاڵوو ، ـی زەرد : نیشانەی نەخۆشی یە کە ـ لە کاتی خۆیدا لە دار بکرێتەوە ; گەورەیی و سوودە .

هەڵاتن ؛ ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا ـ : نیشانەی رزگاری‌یەو هێندێکیش دەڵێن بەسەر دوژمنانیدا زاڵ بوونە . کە لە خەوندا ببینێ پیاوان لە بەر ژنان هەڵدەهاتن : نیشانەی وەیە کە خەون‌بین ترسی لە گەورەیە کی هەیە صادق دەڵێ ـ بەبێ هاوار و گریان : شادمانی‌یە ، بەڵام کە هاوار و زاری بکات کارەسات و رووشەیە .

هەڵاترو ؛ دیتنی ـ لەخەوندا : نامەت لە هەندەرانەوە بۆ دێتو لەرازێکی دەکەی کە خۆی ـ بێ : دووا رۆژێکی ترسناکو پەرێشانی هەیە .

هەلاج بڕوانـە ( پـەڕە کردن ) .

هەڵامەت ( پەسیو ) ابن سیرین دەڵێ کەببینێ ـی هەیە : چەند رۆژێـکی ناساز دەبێ ، هەرچەندێکی ـە کەی سەخت‌تر بێ : نەخۆشی‌یە کەی پتر درێژە دە کێشێ . کرمانی دەڵێ کە خۆی ـی هەبێ : رقی لە خەڵکی هەڵدەستێ و زووش ئاشت دەبێتەوە .

هەڵامـان ؛ دیتنی ـ لەخەوندا : ماڵو سامانە . کە لەسەر لەشی ـ هەبێ : ماڵی دەستدە کەوێ بە تایبەتی کە لەو ـەوە کێمو هەوای زۆر ببینێ .

هەڵامساو ، دیتنی ـ : ماڵو سامانە کە لەسەر لەشی وی هەڵامساو هەبێ ژنە یا کوڕە ، کار بێك هاتنە و لەخەم رزگار بوونە .

هەڵاوەسین ؛ کە هەر خۆی ، خۆی هەڵاوەسی‌و کەسیش تەماشای نەکات: لەناو ماڵو خێزانو خزمانی‌دا گەورە دەبێ ، بەڵام کەس سەری بـۆ شۆڕ ناکات . کە پادشا فەرمان بدات بۆ ـی : پایەو شان و شکۆی دەستدە کەوێ . کە لە کاتی هەڵاوەسینی‌دا خەڵك تەماشای بکەن : بە سەر واندا دەبێتە فەرماندار . « ئەو باسە لە ( سێدارە ) ش دا هەیە » .

هەڵبەست ؛ لە خەونداـ ـي پەلامارو یا بێ هەڵکووتن : چێتکی پووچە .
هەڵبەرین ، ابن سیرین دەڵێ ـ لەخەوندا خەمو خەفەتو کارەساتە ، لەلای
هێندێکیش : نەخۆشی‌یە . ئی واش هەیە دەڵێ بۆ پیاوان کە لەزیندانێ
دابێ و کۆتیشی لەپێی دابێ : رزگاری‌یە . کرمـانی دەڵێ بۆ ژنـان
ریسوایی‌و بۆ پیاوانیش کارەساتە . هەڵبەراندن : کارو باری بێ سوودە
سەما کردن . شادی‌و قایلی‌یە و لە زەماوەندی زاوا و بووکێتی یە کێك
لە دۆستە کانت ئاگادار دەبێ .
هەڵکردن ، ـی ئاوور : خۆشحالی و شادمانی‌یە لە ژیاندا ، هێندێکیـش
دەڵێن رق‌وقینە . ـی مۆم ( شمع ) : ئومێدی گچکەیە .ـی سوو نەمەنی
شێتێتی سەودا و دڵدارێتی‌یە .
هەڵۆ ؛ پادشای بەهێزو زۆر دارە . کە ـی بگرێ یا کەسێك پیداتێ بـەو
مەرجە رامی بەردەستی وی بێ لەلای میر و خونکاران خۆشەویست
دەبێ . کە ـ هەڵیگرێ‌و بیباتە حەوا بەفەرمانی میری دەچێتە رارەوی
و بەو هۆیەوە بەگەورەیی‌و سەرداری دەکات .
دەڵێن دیتنی ـ : پادشای بەهێزو زۆردارە و تـەمـەن درێژی‌یـە .
دیتنی ـ لەحەوا دا : زۆر زوو بەماڵ‌و سامان گەیشتنە و دا بین کردنی
قرم ( طمع ) و دڵخوازە . کە ـ لـە جێگایەکی هەڵنیشێ : پیرۆزی و
سەر کەوتن‌و هێز و توانایە . کە باڵ و پەڕی فش کردبێ : پارێزگا-
رێکی بەهێز و توانات بۆ پەیدا دەبێ . کوژتنی هـەڵۆ : بڤـەیـە کی
سەخت و پڕ مەترسی‌یـە .

کە هەڵۆی بگرێ یا کەسێك بەوی بدات بەو مەرجە کە ڕامی دەستی وی بێ : لەلای میرو خونکارانەوە بەڕێزو خۆشەویست دەبێ . کە ـ ئەتۆ هەڵگرێ و بتبانە حەوا : بەفەرمانی میری کۆچێکی دەکەی و بەو هۆیەوە بەگەورەیی و سەرداری دەگەی . کە ـ لە کووچەیێکی بنیشێ پادشا دەچێتە ئەوێ . کە خەڵکی ئەوشووێنەی ـی بکووژن : پادشا لێ دەکەوێ و لە ناو دەچێ .

کە هەڵۆ هەر کەسێکی بگرێ : دەکەوێتە بەنای پادشایەوە . هەڵۆ چێێکی لە زاری خۆی دەربێنێ و بە هەر کەسێکی بدات : بەخشش و بەهرەی لە گەورەیێکی بەوە دەستدە کەوێ . کە ـ لەدەستی وی هەڵفرێ کە هەر ڕستە یا چێێکی تری لە دەستدا بمێنێتەوە : گەورەیەك لێی توورە دەبێ و ماڵیشی لێ دەستێنێ . هەر کەسێکی لە خەونی دا نێچیری لە هەڵۆی وەر گرێ : ماڵو سامان و گەنجینەی پادشای دەکەوێتە ژێر دەستی یەوە . کە ـ بە دندووك یا بە چەنگاڵ لەوی بدات : لە پیاوێکی دەستەڵاتدار زیانو ئازارێ دەبینێ شەڕ لە گەڵ ـ کردن : شەڕ کردنە لە گەڵ گەوران . کە ـی بخۆی یا پەڕی هەڵکەنی : ماڵ و سامانت لە خونکارێکی دەستدە کەوێت . کە ـ لەسەر سەری تۆ یا دەرکی تۆ هەڵنیشێ : کورێکت دەبێ و دەبێتە پادشا .

هەڵوا ، ابن سیرین دەڵێ لە خەوندا ـ دیتن : ماڵێکی نارەوایە لە لایەن پادشاوە بەوی دەگات . ـی ووشك : خەمو خەفەتە . صادق دەڵێت ـ لە خەوندا ماڵێکی زۆرە هەڵوا مرۆشی لە خەوندا پیاوێکی زمان خۆشو خوو و ڕەوشت جوانو [illegible] . کە بارووەـ بەکی لەزاری بنێ نیشانەی وەیە کە [illegible] کوڕی لی دەبێت .

هەمیشە بەهار ( گولێ ) ؛ ابن سیرین دەڵێ گوڵی ـ لە کاتی خۆیدا ببینرێ خێر و سوودی تێدایە و ئەگەر لە بێ کاتدا ببینرێ : هەر باشە .

هەنار ؛ ـ لە کاتی خۆیدا ؛ ماڵە . بێ کات ؛ خراپە . کە ـی لە دارێ کەیەوە و بیخۆی لەژنێکی جووانت سوود دەستدە کەوێ . ـی شیرین ماڵ و سامانە . ـی ترش : خەم و پەرۆشە لە کات و بێ کاتدا هەر کەسێکی لە خەونیدا لەزستانیدا ـی بخووا بەقەد دەنکەکانی دار کاری دە کرێ ـی شیرین لە کاتی خۆیدا بخورێ برەوی کار و بارە ، کۆچێکی پیرۆزە کە دەنکی هەناری دەستکەوێ یا کەسێك بیداتێ : لە کاتیویدا ڕەنجی پێدە گا . کە هەناری بەتێکوڵ و ناوی بەوە بخووا : بەرخوردار دەبێ .

هەنجیر ؛ خواردنی ـ لە کاتی خۆی دابێ یا نا خراپە . کە ـی بخووا یا کۆی کاتەوە یا بیەرێتێ : خەم و خەفەتی پێدە گات و کارێکی وا دە کات کە پەشیمانی لەدوو بێت . ـی زەرد خواردن : نەخۆشیە ، ـی ڕەش خەفەتە ، ـی سەوز و شیرین لە کاتی خۆیدا زیانی نیە .

هەنگووین ؛ ـ لە خەون دا : تالان ، میرات ، چاکە و بەهرە و ڕۆزیە . خوواردنی ـ : ڕۆزی ڕەوا ( حلال ) و سوود و بە ئارەزوو گەیشتنە . کە ـی هەبێ : تووشی زانیاری دێ . کە لە ـی خۆی بەشی خەڵکی بدات ؛ لە زانیاری خۆی خەڵکی بەهرەمەند دە کات . کە ـ بباریێ : بەهرەیە .

هەوا ؛ ابن سیرین دەڵێ لەخەوندا هەوای سوور دیتن : کوژتار دەبێ . کە سەوز بێ : دەخڵ و دان و شیناوەردی زۆر دەبێ . کە ـ پڕ لە تۆز و ساردی بێ : پادشایەکی بێگانە دێتە ئەوشوێنە و ئازاریان پێ دە گەیەنێ .

هەور ، ـي ڕەوشەن‌و ڕوون و درەخشان : سەودای پێك گەیشتنە . كە ـ ڕەش‌و تاریك بێ : پەشێوی‌و خەم‌و خەفەت‌و مەترسی‌یە ـ بەمانگەشەـ ودوە : قایلی‌و سوپاسی دڵپاكانەیە . ـ بەبارانەوە دیتن ڕیژە و پیت و پێز و خێراتە . ـ بەلافاوەوە دیتن : كێشە و گرفتاری لە شووێنە . كە خۆی لەژێر هەورێكی بارنەە ببینێ ; دەبێتە خاوەندی زانست‌وهونەر و سوودی لێ دەبینرێ كە خۆی لەژێر ـی زەرد دا ببینێ ; نەخۆشی و ڕەنجێكیشە لە ئافرەتەوە پێی دەگات . كە لەژێر ـی سووردابێ: تووشی ڕووشە و كێشەی دێ . چوونە سەر ـ : گەورەیی و دەستەڵاتە بە دەستی ـ لەحەواوە هێنانە خوواری بۆ سەر زەوی : هێزو توانا و سامان‌و پایەیە . هەور سێبەر لەسەر هەر كەسێكی بكا : ئەو ساڵ خێر و سوودو بەهرەی زۆر دەبێ . كە لەگەڵ ـ و بارانە گرمە ( رعد ) بێ : مەترسی‌لەنزای دایك‌و باوك‌و ئیترە كەلەگەڵ گرمە بروسكە ببینرێ ئازاری سەختە . كە ـ بەسەری دا تێپەڕێ : دۆستایەتی گەورەیەكی بۆ ڕێك دەكەوێ‌و سوودی لێ دەبینێ كە ـي لەحەوادا باژوێ دۆستا- یەتی زانا و تێ‌گەیشتووان دەكا . كە ـی لە حەوادا بگرێ و بیهێنێتە خوواری : كاروباری سازو گەورە دەبێ كە ـ گێتی داگرێ‌و بارانە نەبێ : خرابە . كە ـی بخووا : گوزەرانی لەسەر زانیاری‌یە . كە ـی بەگرمەو برووسكە ببینێ : سەخت ترە . كەببینێ لەماڵی‌و شووێنی‌وی دا ـ ڕاخراوە : ماڵ‌و منداڵی‌وی لە زانیاری بەهرەمەند دەبێ . كە بارانەی سەخت‌و گرمەی هەوریش سەخت بێ نیشانەی ترسەنۆكی

خەون بینی‌یە لە بێ هەڵکالانی دایك و باوك دا . کە دەنگی هەور لە کاتی بارانەدا ببیسترێ : لەو شووێنی خێرو پیتو پیرۆزی پەیدا دەبێ .
کەبینێ بارانەو بروسکەو گرمـەی هـەوری پێکەوەبێ : مەتـرسی لە پادشایە . کە هەور بگرمێنێ : سامی پادشای لەو وولاتیدا سەخت دەبێ کە هەور گۆڵەی بێو بەفر بباری‌و هەواش تاریك بێ لەوشووێنی‌دا پادشایەکی زۆردار پەیدا دەبێ

هەویر ؛ ابن سیرین دەڵێ ئاردی گەنم کردنە ـ : ڕێـك و پێکی ئایینە ، وە ماڵە لە بازرگانێتی‌دا کە هەویرە کە هەڵاتبێ . بەڵان کە هەڵنەهاتبێ: نیشانەی خرابی‌و بێ‌ئایینی‌یە . کەبینێ ـی هەیە یا داویانەتێ یا کڕیویە کە لە ئاردی جۆی بێ : هێندەی‌وی ماڵ لەبازرگانێتی‌دا دەست دەخات هضم . بڕوانـە ( هەبرووـــ ) .

هۆردوو ؛ دیتنی ـ : دەست و بردو هەنگاوی بەرزە لە ناو ـ دابـوون ئارامی‌وهێمنی‌یە ، هێندێکیش‌دەڵێن دیتنی ـی سوپایی : مەبەس ئەوەیە کە لەلایەن ئەو دوور کەوتووانەوە کە بەرارەوی ( سفر) چوون و یـا پێشـەرگەن نیـکەران مەبە چونـکوو ساخن . کە مرۆ خۆی لە نـاو ـ دا بێو ئەو جۆرە خەونە ببینێ دەبێ ئاگای لەخۆی بێ .

هورووژم ( هجوم ) ؛ لە ـ دا بوونە قوربانی سەر کەوتنێکی گەورەیە ـ کردن کێشە کێشی میراتو چارەنووسێکی‌یە .

هۆش ( عقل ) ؛ ابن سیرین دەڵێ کەسێکی ـی خـۆی ببینێ لە شێوەی مرۆڤانداو پێی بڵێ من ـی تۆم : کە خەون بین کەس ( أهل ) بێ :

لەگەڵ منداڵی پادشای دۆستایەتی پەیدا دەکاو سوودی لێ دەبینێ . کە کەسێك هۆشی خۆی وا ببینێ : بەخت رووی تێدەکاو پایەی گەورەیی دەستدەکەوێ‌ودەوڵەمەند دەبێ . دانیاڵ دەڵێ هۆش لەخەوندا : بەخت و دەوڵەتە . جابر دەڵێ ـ وگیان لەخەوندا : دایك‌و باوکە کەزیندوو و دەر بە دەر بن : دووبارە دەیان بینێتەوە . کە مردوو بن خـێر و خێرات بەوان دەکات .

هوڵوو ؛ ـی سووررورەش لەکاتی خۆی‌دا بێ : ماڵ‌و دڵخووازە . ـی زەرد نەخۆشی‌یە . ـی زەردو سوورو رەش‌و تام شیرین هەڵگرێ پایەکێك پیداتێ : بەدڵخوازی دەکات . کەـی زەرد لەبێ‌کاتی‌دا بخووات : نیشا نەی خەم‌و خەفەت‌و کارەساتە کەتامی ترش بێ : باشترە . ـ چەقاندن منداڵ بوونێکی وایە کەزوو فێری هونەرو زانیاری دەبێ .

هێرۆ ابن سیرین دەڵێ کەـ لەکاتی خۆی‌دا ببینرێ : سوودو کەلکە ، بێ کات : خەم‌و خەفەتە ، خوواردنیشی : زیان‌و کەم و کووری‌یە سـەر بەهێرۆی شوشتن : نیشانەی پەشیمانی و پاك ئایینی‌یە .

هێزەی رۆنی . دیتنی ـ : پیاوێکی هێمنە . کەـی هەبێ یادایانەتێ لەگەڵ پیاوێکی هێدی و هێمن دۆستایەتی پەیدا دەکات و سوودی لێ دەبینێ کەـی بەچڵکن‌و کۆنی ببینێ : زیانی بێ دەکات .

هێشوو ابن‌سیرین دەڵێ ـ دیتن کەتازە بێ : منداڵەو پیت‌و پێزی‌(بر کە ی ماڵە ، بەڵان کەـی ووشك ببینێ : منداڵێکی تەمەن درێژە بەڵان لەو ساڵی‌دا دەست تەنگیتی و قاتی و قڕی ڕوو دەدا . ـی ترێ و خورما : باشترە کەلەکاتی خۆی دابێ کرمانی دەڵێ کەلەخەونی دا ببینێ ـی سەوز دەخووا : لەوساڵی‌دا گوزەرانی باش دەبێ .

کەهێشووی زەردو ووشك ببینێ : نیشانەی قاتی و تەنگانەیە جعفری صادق دەڵێ هێشووی سەوز : منداڵ و بەهرەیە .

هێلانە : ابن سیرین دەڵێ کەببینێ لەماڵی ویدا ـ هەیە : سوودە . کەببینی ـە کەی دەرهێناو فرێیدا : کارێکی ناپەسند دەکات . کەدووبارە لەشووێنی خۆی دانێتەوە : یارمەتی بەکێکی دەکات . کەببینێ لەـدا باڵندەیەکی گەورە هەیە : دەکەوێتە پەنای گەورەیەکی‌یەوەو سوودی لێ دەبینێ .

هێلەك ؛ ـ دیتن : پیاوێکە لەنێوانی دۆستو خزماندا هاتوو چۆیە بکات . ابن سیرین دەڵێ ـ : ژنێکی خۆتێهەڵقوتێنە .

هێلکە ، دانیاڵ دەڵێ ـی مریشکێ لەخەوندا : برێتی‌یە لە کەنیزەك کە مریشك ـی لەلای وی بکاونەزانێ ـ چی‌یە : ژنێکی‌دزێنێو ڕۆژ گارێکی درێژ لەگەڵ وی ڕادەبووێرێ . کە ـ ی بە کوڵاوی بخووا : بەرەنج ماڵی دەستدەکەوێ : کە ـ ی دەڵەمە بخورا : ماڵی نارەوا دەخووا و ڕەنجو ئازاریشی پێ دەگات کە تێکوڵی ـی بخووا و نـاوکەکەی بهێڵێتەوە : ماڵی مردووان دەخووا یا کفنیان لێ دەستێنێ . کە ـی بکا ژنێکی زۆری‌دەوێ‌وحەز لە سووار بوونیان دەکات . هێندێکیش‌دەڵێن ـ لەخەوندا : خۆشحاڵی‌وشادمانی‌یەکی زۆرە کۆکردنەوەی ـ : سود و کەلکە . ـی زۆر : منداڵ زۆربوونە . شکاندنی ـ : کاروبار تێکچوونە ـی پیس : مەرگ‌و دوور کەوتنەوەیە . کەوەکوو مریشکان لە سەر هێلکان دانیشێ : لەگەڵ ژنان دادەنیشێ‌و خێریان لێ دەبینێ . کە ـی لەژێر ـ دابنێ و ئەویش و مریشکەکەش ـی فرێ دەنـە دەرەوە :

کاروباری مردووی وی لە نوویوە دەبووژێتەوە ، هێندێکیش دەڵێن مندالی دەبێ که هێلکه بشکێ : کچێکی لە کچێنی دەخا . که هێلکەی زۆر هەبێ : مندالی زۆردەبێ هێلکەی قاز : مندالی هەژار و بێچارەیە . هێلکەی چۆلەکە : خۆشی و شادییە

هێلکەی گون : بڕوانە « گون » .

هیربزان ( قاضی ) ؛ ابن سیرین دەڵێ که کەسێك ببینێ بۆتە ـ و خۆی ئەو بابەتە نەبوو : تووشی گێرەو کێشەیەکی دێت و زیانی مالی پێدەگا که خەون بین زانابێ دەبێتە ـ . دانیال دەڵێ که لە خەونی دا ـ ی ببینێ : بە پایەی زانایان دەگات . جابر دەڵێ که لە خەونیدا ببینێ که ـ فەرمانی بە سەردا کردووە : لە بێداریتیش دا هەروا دەبێ که ـ بە چاوی ڕێز و بەزەیی تەماشای کردبێ : سوودە که ـ بەچاوی ڕقەوە تەماشای بکات ؛ خەمە .



یاسەمەنە ؛ ابن سیرین دەڵێ کە لە کاتی خۆیدا ـ ببینرێ : منداڵە . کە دۆستێك دەسکە ـیێکی بدا بەوی : لە نێوانی واندا ووتوو ویژ پەیدا دەبێ و لێك جووایەز دەبنەوە کە ژنێك ـی لە دارێ بکاتەوە و بیدا بە مێردە کەی : مێردە کەی ئەوی بەرەڵا دەکات . کە ـی بە نۆ کەری خۆی بدات نۆ کەرە کە هەڵدێ داری ـ لە خەوندا ژنێکی دەوڵەمەندە و بەد خوو و سپڵەیە کە یاسەمەنە بۆنخۆش بێ : ژنە کە دڵفراوان و جوامێر دەبێ .

یاقووت ؛ ابن سیرین دەڵێ ـ لە خەوندا : ژنە یا کەنیزە کە ، کە ـی سوور ببینێ . بەڵان کە سەوز بێ : ژنێکی جوانە ، کە ژنی دوو گیان بێ : کچی دەبێ یا کەنیزە کێکی باشی دەستدە کەوێ . کە ـە کە زەدە دار ( معیوب ) بێ : کەنیزە کە کەی یا ژنە کەی لێ نارەوا ( حرام ) دەبێ



بەندیواری نەخۆشییانی لەش بە خەونەوە :-
هەر ئەندام وە یا ناوەڕۆکێکی لەش تووشی هەر جۆرە نەخۆشی و ئازارێکی بێت هەر بەکەی دەبنە هۆی جۆرە خەونێکی :-
( تیسیە ) دەڵێ خەونی ئەو کەسانەی کە نەخۆشی دڵیان هەیە کورتە وە لە ئەنجامیشدا کە نوستووە بەترس و هەراسەوە ڕادەپەڕێ .
کەسێکی نەخۆشێکی گرانی هەبێ : خەون بەمەرگەوە دەبینێ . ئەوانەی کە گرفتاری نەخۆشی ڕیخۆڵەکانیانن خنکان و پشووبڕان و هەڵاتنێ لەخەونەدا دەبینن . ئەوانەش کە نەخۆشی چیکلدانەیان هەیە حەز لە چ جۆرە خواردەمەنییەکی دەکەن و یا بێزو بۆیە لە چی دەکەن ئەوانە لە خەونیاندا دەبینن . ئەو کەسەی کە هەراو هەوەسی جووتبونی زۆر هەیە : هەر چتێ وا لەخەونیدا دەبینێ .
کە لە بیرو باوەڕی چەند لێکۆڵینەرەوەیەکی وەکوو ( سوری ) و ( ویگانت ) وورد بینەوە ، ئەوانە زۆر خۆیان بەدووی ئەوانەوە ماندو کردووە کە سەرچاوەی خەونەکان بدۆزنەوە کە بریتییە لە نەخۆشی و هەواو هەوەس و گراوی و بێزو بۆیە . خەونیش تەنها بریتی نیە لەوەی کە نەخۆشان و ئەوانە بیبینن کە لێیان دوواون ؛ بەڵکوو هەموو جۆرە مرۆڤێکی ساغیش لەدرێژایی تەمەنی خۆیاندا خەونی وا دەبینن کە کەم و زۆر بەندیواری بە سەر نەخۆش و هەستەکانیانەوە نەداوە کە وایە ئێمە پێویستە هەوڵ بدەین کە سەرچاوەی چۆنیەتی ئەو جۆرە خەونانەش بدۆزینەوە .
( اشترامپێن ) دەڵێ بۆچی خەون زوو لەبیر دەچێتەوە ؟؟ :-

خەون کە بریتییە لەوەی ڕەوان ( روح ) لە سەردەمی نوستنی دا کە وەخاوێشی مردنی دەچێ دەیژێنێتەوە واتا نوستوو کە بێدار بۆوە ئەو ماوەیە لە بیرەوەری مرۆی دا نامێنێ کە خەونەکانی وەبیر بێتەوە چونکوو وەکوو پارچە هەورێك وایە کە بـا ڕایفرێنێ .

( نبنین و بوتانلی ) دوو هۆی تریان پەیدا کردووە لە بابەت لەبیر چوونەوە ( هەرچەندە ئەو دووانەش هەر لە سەرو چاوەکانی ترەوەن ) :-

هۆی یەکەمین : ئالۆ و گۆڕێکە لە سەرەتای بێداریتی دا تـووشی هەموو هەستەکانی دێت لەورووەوە مەیدانی وەبیرهاتنەوەی خەونەکان زۆر تەنگ و تەسکە .

هۆی دووەم : لە ڕووی ئەوەوە پلەی بەرژەوەندی ناوەرۆکی خەونو ئەو هەموو هەستو خوستە کاریگەرانەی سەردەمی ڕۆژێ : جیاوازییان هەیە بۆیە دووای وەئاگاهاتن ئەوانەی لەخەونیدا دیتونی دەرۆنارەو وەیاد ناکەونەوە مەگەر زۆر کەمو تاك تاکە نەبێ .

ئەوخەونانەش کەزۆر کاریگەرن لەوانەن تاکتاکێکیان وەیاد بخرێتەوە ( ڕۆمەر ) بیرو باوەڕی وایە پاشەرۆکی فرێدراو یاکەمێتی لەشییە . کەسێکی کە خەون نابینێ لەباش ماوەیەکی کەم شێت دەبێ چونکوو کۆمایەکی گەورە لە بیرەوەری ناسەواو و بێ شکلو کاریگەر لە ناو مێشکی کەلەکەی دەبەستێ ! خەون بۆ مێشکێکی بێ ئەندازە پڕ لە جێگای دەریچەیێکی دڵنیابی دایە ، لەو ڕووەوە خەون مایەی ئارامی و چـارە چارەش دەرمانە . هێندێ کەس لایان وایە کەخەون فەرمانێکی ڕەوانی نیە بەڵکوو هی لەشییە ، لە ئەنجام دا بە پاریکاری چەند نشانەیێکی ڕەوانی ئاشکرا دەبێ زۆر ترینی خەڵکی بە پێچەوانەی ئەوەو ڕەفتار دەکەن .

## سـەرچـاوەکـان :ــ

١ ـ منتخب الكلام فى تفسير الاحلام تأليف ابوبكر محمد ابن سيرين
( من علماء قرن الاول الهجرى )

٢ ـ تعطير الانام فى تعبير المنام تأليف الشيخ عبدالغنى النابلسى .

٣ ـ كتـاب دانيال سلاوى خوداى لە سەر بێ

٤ ـ « تقسيم تأليف امام جعفرى صادق ( س خ )

٥ ـ « دستور ــ ابراهيم كرمانى

٦ ـ « ارشاد ــ جابرى مغربى

٧ ـ التعبير ــ اسماعيلى أشعث

٨ ـ كنز الرؤيا ــ مأمون

٩ ـ « ابن خلكان بەرگى سێیەم

١٠ ـ « بيان التعبير ــ عيدروس

١١ ـ « التعبير ــ حافظ ابن اسحاق

١٢ ـ « حل الدلائل والمنامات

١٣ ـ « مبادىء التعبير

١٤ ايضاح التعبير فخرى

١٥ ـ « كافى الرؤيا

١٦ ـ « تعبير معروف طاؤوس

١٧ ـ « مفرح الرؤيا

١٨ ـ « تحفة الملوك

١٩ ـ « منهاج التعبير تأليفى خالد اصفهانى

٢٠ - كتاب مقدمة التعبير
٢١ - حقائق الرؤيا
٢٢ - وجيزه تأليف ساهونه
٢٣ - » فرويد سيگموند فرويدی نامەی
ترجمة مصطفى صفوان
٢٤ تعبير خواب و بيماريهای روانی وەرگێڕ ايرەج پورباقر
٢٥ - المقتطف
٢٦ - كتاب تعبير الرؤيا لابن سيرين ( ادارة منشورات البصری )
٢٧ - مجلة حواء العدد ٤٤٤ ساڵی ١٩٦٥
٢٨ - ساڵنامەی پارس
٢٩ - مجلة العربی عدد ٩٦ لاپەڕە ٥١ ساڵی ١٩٦٦
٣٠ - - الاخاء ژمارە ٩ ساڵی ٤
٣١ - الاحلام بين العلم والعقيدة تأليف دوكتور علی الوردی
٣٢ - المذهب الروحانی تأليف عبدالله ابانحی
٣٣ - علی حافة العالم الاثيری تأليف ( آرترفندلای )
٣٤ - كتاب كامل التعبير تأليف ابوالفضل حسين بن محمد ابراهيم التفليسی

---

چاپی ٣٠٠٠ بەرگی لە ٢ / ٢ / ٩٧١ لە چاپخانەی
کوردستان لە شاری هەولێری مێژوویی دا
کۆتایی هاتووە